www.alibapir.com

# سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم

## لە تەرازووی ئیسلامدا




عەلی باپیر




چاپی چوارەم

پاڵفتەکراوەو لێی زیادکراوە

www.alibapir.com

سۆزی نەتەوایەتیی و بیر ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا
نووسینی: عــەلی بـــــاپیر
مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر
چاپی چوارەم ١٤٣٩ز- ٢٠١٨ك




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
سۆزی نەتەوایەتیی و بیر ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا،
عەلی بـــاپیر (نووسەر)،
٣٤٥ لاپــەڕە ،
١٧* ٢٤ ســم ،
بابــەت ، ئـاییِنی
تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ١١١ ) ی ساڵی ٢٠٠٥ پێدراوە.

ISBN: 978-9933-593-28-2

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ :** نـــەوزاد کۆیــی
**دیزاینی ناوەوە و بەرگ :** زەردەشت کاوانی

www.alibapir.com

# سۆزی نەتەوایەتی
# و
# بیری ناسیۆنالیزم
## لە تەرازووی ئیسلامدا

**- چاپی چوارەم -**

پاڵفتە کراوە و لێی زیاد کراوە

**نووسینی**

**عەلی باپیر**

www.alibapir.com



## پەیڤێك

ئەم کتێبە - سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا - جگە لە بەشی چوارەمی، بیست و یەك ساڵ لەمەوبەر لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا مامۆستا عەلی باپیر نووسیویەتی، کە لەلایەکەوە، ڕژێمی بەعسی ڕووخاو، بەئاشکرا و بەبەرچاوی هەموو دنیاوە، کوردستانی داگیر و خاپوور کردبوو، میللەتی کوردی بە هەموو شێوەیەك دەچەوساندەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە، چەند حزبێکی کوردیی بە بیروبۆچوونی ڕۆژهەڵاتییەوە، کە ئەوکات بازاڕی گەرم بوو، لەپەنای شۆڕشکردن لە دژی ئەو ڕژێمە، دژایەتیی ئیسلامیان بە ئەرکێکی خۆیان دەزانی.

نووسەر لەم کتێبەیدا، وێڕای دەرخستنی بیرو هەڵوێستی دژ بە ئیسلامییانەی بەعس و، کاری دڕندانەی دەرهەق بە گەلی کورد و گەلانی دیکەی عێراق و، پێویست بوونی بەرەنگار بوونەوەی و هەوڵدان بۆ ئازادیی گەل و نیشتمان، ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە، کە دینی خوا، کاڵایەکە بە باڵای ئینسان و، چارەسەری هەموو کێشەکان و دەرمانی هەموو دەردەکان و، هەتووانی هەموو برینەکانە و، ڕزگارکەری چەوساوان و بەرنامەی سەرتاسەری ژیانە.

هەروا ڕوونی کردۆتەوە، کە گەلی کورد و باقی گەلانی دیکە، چەندە لە ئیسلام نزیك بن و پابەند بن پێیەوە، ئەوەندە لە لووتکەی ئاواتە بەرز و شەرعییەکانیان نزیك دەبنەوە و بەمراد دەگەن و، بەختەوەریی دنیا و قیامەتیان مسۆگەر دەکەن.

www.alibapir.com



ئەم کتێبە،کە مایەی بەرچاوڕوونیی ئیسلامییەکان و عەلمانییەکانیشە و، سەبارەت بە مەسەلە جۆراوجۆرەکانی پەیوەنددار بە گەل و نیشتمان و زمان و کەلەپوور و، بەرگریی لە خاك و میللەت، هەڵوێستی ئیسلام دەخاتە ڕوو.

ئەو کەسانەش دەمکوت دەکات، کە توانج و پللار لە ئیسلام دەگرن و، دەیانەوێ لە مەیدانی ژیان و سیاسەت، دایببڕن و دووری بخەنەوە! کە بەنەزانیی، یان بەزۆرزانیی و لە پشت پەردەی ڕەشەوە، سەیری ئیسلام دەکەن و تفەنگ بەتاریکییەوە دەنێن و توتی ئاسا، شوێن قسەی ناحەزان دەکەون و دەیلێنەوە و، بەختەوەریی گەلانیان لەژێر سایەی ئیسلام و، بەرهەمی تاڵی عەلمانییەتیان لەبیر چۆتەوە و نایبینن!

نووسەر لەم کتێبەیدا، زۆر گرێکوێرەی کردوونەوە و، ئەو مەسەلانەی جێی مشت و مڕ و گومانی خەڵکێکن، لەبەر تیشکی هەڵوێستی ئیسلام و واقیع و حەقیقەتی مێژوودا ڕوونکردونەوە، وەك: مافی تاك و کۆمەڵ و نەتەوەکان لە ئیسلامدا و، بەرگریی کردن لە مافە خوارسکەکان و، ڕەواندنەوەی تۆمەتی کەمتەرخەمیی سەرکردەی کوردی مسوڵمان، (سەلاحەددین)ی ئەییوبیی بۆ گەلەکەی و، دەرخستنی بەسەرهاتی مەلای خەتێ و سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتیی - ناسیونالیزم - و، جیاوازیی نێوان نەتەوەپەرستیی و سۆزی نەتەوایەتیی و پێناسەی حزبی بەعس و چۆنیەتی دابەشکردنی کودستان و دووریی ئیسلامییەکان لە کاری ناڕەوا و تۆقاندن و...هتد.

بەئومێدی ئەوەی، چاپکردنەوەی ئەم کتێبە، مایەی بەرچاو ڕوونی زیاتری خوێنەر بەگشتی و، بەخەبەرهێنانی ئەو کەسانە بێت، کە لە گێژاوی بێئاگاییدا دەسووڕێنەوە و، لە هەڵوێستی ئیسلام لەو بارەوە بێئاگان بەتایبەتی!

حەسەن بابەکر

هەولێر

٢٠٠٥/٦/١

www.alibapir.com



## پێشکەش بێ

١- بەگیانی بێداری سەلاحەددینی ئەییوبیی، کە هێندە سەرکردەیەکی مسوڵمانی دادگەر و بەجەرگ و بەخشندە و ڕەوشت بەرز بوو، تەنانەت دوژمنانیشی دانیان بە گەورەییدا هێناوە و پێیان هەڵاگوتوە.

٢- بەگیانی بێگەردی مامۆستا سەعیدی نورسیی، ئەو زانا خواناس و تێکۆشەر و نەبەزەی، کە بەتەنێ بەرەنگاری ڕژێمی ڕەگەزپەرست و عەلمانیی تورکیا بوو، زۆربەی تەمەنی خۆی بە دوورخراوەیی و گیراویی و دەست بەسەریی، بەڕێ کرد، لەپێناوی خودا.

٣- بەو مسوڵمانانەی، کە بێجگە لەخوا، بەهیچ پەرستراو و، بێجگە لە پێغەمبەری خوا (محمد صلى الله عليه وسلم) بە هیچ ڕابەر و، بێجگە لە ئیسلام، بەهیچ بەرنامەی دیکەی ڕازی نین.

٤- بەو ئیسلامییە ڕەسەن و تێگەیشتوانەی، کە هەست و نەستی نەتەوایەتیی و نیشتمان پەروەریی، بە بەشێك لە مسوڵمانەتییەکەیان دەزانن و، ڕزگارکردنی گەلی چەوساوە و ئازادکردنی خاکی زەوتکراویان، بە ئەرکی سەرشانیان دادەنێن.

www.alibapir.com



## پێشەكی چاپی یەكەم

سوپاس بۆ ئەو خوا كاربەجێیەی، كە باب و دایكی مرۆڤەكانی لەخاك و ئاوی سەر زەوی خولْقاندوون و، دوایی بە مەبەستی بەرەو پێش چوونی ئینسان و بەپێزبوونی ژیانی، بۆ چەند تیرە و گەلێك دابەشی كردوون .

سڵاو و ڕێز و ئاشتی خوا، بەسەر گیانی بێخەوشی ئەو پێشەوا بەڕێزەماندا برژێ، كە لە ژیانیدا، عارەب و عەجەم و ڕەش و سپی و دەوڵەمەند و نەداری وەكو یەك سەیر كردوون.

**خـوێنـەری بـەڕێــز!**

لە ڕاستیدا، سەرەتای پەیدابوونی خۆشویستنی گەل و نیشتمان، لە ژیانی ئینساندا، بریتیە لە سەرەتای نیشتەجێبوونی ئینسان لەسەر زەوی، چونكە هەبوونی سۆز لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا، سەبارەت بە نەتەوە و هۆز و خاك و ئاوەكەی، یەكێكە لە غەریزە بنەڕەتیی و ڕەسەنەكانی سروشتیی.

بەڵێ، لەوەتی مرۆڤ لەسەر زەوی دەژی، خاك و ئاو و نیشتمانێك، كە تێیدا پێگەیوە و، تیرە و گەلێك، كە خووی پێوە گرتوون و ژیانی لەگەڵ بەسەر بردوون و تەمەنی لەگەڵ بەڕێ كردوون، جێی سۆز و خۆشەویستیی و ڕێزی بوو ون.

بەڵام ئەو هەست و سۆزە سادە و سروشتییە، وەك هەموو غەریزەكانی دیكەی سروشتی مرۆڤ، لەكاتێكدا زیادەڕۆیی تێدا دەكرێ و لە چۆنیەتی و چەندیەتییەكەی زیاد دەكرێ، شێوەی سادە و سروشتییەكەی خۆی بەردەدا و،

www.alibapir.com



ڕەنگ و دیمەنێکی دیکەی ناقۆڵا و نەگونجاو بەخۆوە دەگرێ و، لە گرێژەنە دەچێ و لەبەر چاوان بەد دەبێ.

جا بۆیە بە درێژایی مێژوو لە ئاقار ئەو غەریزە سادە و سروشتییەدا، کە دەتوانین پێی بڵێین: (سۆزی نەتەوایەتیی و نیشتمان پەروەریی). شتێکی دیکەش هەبووە، کە هەرچەندە لە بنەڕەت و سروشتدا سەرچاوەیەکیان هەیە، بەڵام لە شێواز و چەندیەتیی و چۆنیەتییدا هێندەی زەوی و ئاسمان لێك دوورن، ئەویش بریتیە لە: (نەتەوەپەرستیی و نیشتمان پەرستیی)، یان (ناسیۆنالیزم)، بەڵام بیری ناسیۆنالیزم - هەرچەندە بەشێوەیەکی سادە لەمێژە هەیە - زۆر نیە وەك فەلسەفە و بیروباوەڕێك سەری هەڵداوە، بەڵكو لەڕاستیدا، کاتی لەدایك بوونی دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕشی فەڕەنسا (١٧٨٩ز).[١]

چونکە لەو کاتدا وڵاتانی ڕۆژئاوا، لە گەرمەی تین و تاوی بەرەوپێش چوون بەرەو پەی بردنی زیاتر بە نهێنییەکانی سروشت و، دیتنەوەی یاساکانی بوون.

هەڵبەتە لە ئەنجامی ئەوەش دا، پیشەسازیی و بازرگانیی و کشت و کاڵ و دیاردەکانی دیکەی ژیانی ماددیی، بەرەو پێشەوە دەچوون، هەتا وای لێهات وڵاتانی ڕۆژئاوا، لە ئەنجامی پێشبڕکێ (مسابقة)یان دا بۆ داهێنانی زیاتر و، بەرهەم هێنانی زیاتر، چاویان بڕیە وڵاتانی دراوسێیان، تاکو هەم کەرەسەی خاو بۆ کارگە و ئامێرەکانیان دابین بکەن، هەم بازاڕێك پەیدا بکەن، کە بەرهەم و کەل و پەلەکانیانی تێدا بفرۆشن و ساغ بکەنەوە!

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، لە ئەنجامی بەرەوپێش چوونی زانیاری و زەین ڕوون بوونەوەوە، وردە وردە خەڵك دەستیکرد بە پەی بردن و هەست کردن بە ئەفسانەیی و، پڕ هەڵە و پەڵەیی زۆربەی زۆری بنچینە و دەستوورەکانی ئایینی گۆڕراوی مەسیحیی،[٢] ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە

---

(١) تأريخ الشعوب الإسلامية، بروكلمان، ل٦٠٢، و (إسلام وملیگرایی)، ل١٢.

(٢) بێگومان لێردا مەبەست لەو ئایینە ڕاست و دروستە خواییە نیە، کە بۆ (عیسا) علیه السلام، نێردرا، بەڵكو مەبەست لەو بیروبۆچوون و خەیاڵاتانەیە کە زادەی بیر و هۆشی نەخۆشی ڕابەر و

www.alibapir.com



لە مێژبوو خەڵکی ئەورووپا، لەژێر سەنگ و تینی نیری زۆرداری دارودەستەی کڵێسادا دەیناڵاند، چەند کەسێکی داخ لە دڵ، ئەو هەل و مەرج و بارودۆخەیان بە دەرفەت زانی و، لەرێی چەند بیردۆزەیەکی بەناو زانیارییانەوە، دەستیان کرد بەرشانەوە، نەك هەر بەرانبەر بە کڵێسا و دارودەستەکەی، بەڵکو بەرانبەر بەئایین و بنچینە و بنەڕەتی ئایینیش.

بەو جۆرە (داروین) بەناوی زانیاری گیانەوەرزانییەوە، مرۆڤی بە مەیمون زادە لەقەڵەم داو، (فرۆید) بەناوی دەروونزانییەوە، مرۆڤی سەرتاپا لە جڵێتاوی جینس هەڵکێشا و، ڕایگەیاند، کە تەنانەت ئایین و خواپەرستیی و ڕەوشت و خووش، هەر لە کانیاوی جینس هەڵقوڵیون! ئنجا مارکسی (بەرەچەڵەك جوولەکە)ش هێندەی دی قورەکەی خەستتر کرد و بەناوی ئابووریی زانییەوە، گوتی: (ئابووریی، تاقە هاندەر و پاڵنەری مرۆڤە - بەتاك و کۆمەڵ - لە هەموو بوارەکانی ژیانی دا)، واتە: ئابووریی سەرچاوەی پەیدابوونی هەموو دیاردە ماددیی و مەعنەوییەکانی ژیانی ئینسانە، لە ئایین و ڕەوشت و فەلسەفە و زانیاریی و...هتد.

وەك دەبینین، هەرکام لە: (داروین و فرۆید و مارکس)، بەڵام هەریەکە بەشێوازی خۆی، دەیەوێ بۆ خەڵکی دەرخات، کە مرۆڤ بەس بریتیە لەو جەستە ڕواڵەتی و بەرهەستە و هیچی دی! ئایین و ئەو بناغەیەی، کە لە سەریشی وەستاوە، ئەفسانەیە و دژی واقیع و زانیارییە[1]!

بێگومان لە ئاکامی ئەوەشدا، ڕێز و حورمەتی ئایینی مەسیحی و، دام و دەزگای کڵێسا، تا ئەندازەیەکی زۆر لە دڵ و مێشکی خەڵکەکەدا کەم بۆوەو، بیروبڕوای ئایینییان لە دڵدا کزبوو، بەڵام چونکە وڵاتانی ئەورووپا لەو دەمیدا سەرگەرمی جەنگ و هەرا و سنوور شکاندن و یەکتر گەوزاندن بوون، هەستیان کرد، کە دوای کزبوونی بیروبڕوای ئایینی، لە دڵ و دەروونی گەل دا، پێویستە

---

پێشەوایانی کڵێسا بوون.

(١) لە ئاڵقەکانی: یەکەم و دووەم و سێیەمی زنجیرەی (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان)دا، کەم تا کورتێك بەرپەرچی ئەو بیردۆزانە دراوەتەوە.

www.alibapir.com



ئەو دڵ و دەروونە بۆشانە، بە شتێکی دیکە پڕ بکرێنەوە، نەوەك خەڵکەکە سارد بێتەوە و، لە پێشبڕکێی تەکنۆلۆجیاییدا، وەپاش بکەون و بەجێ بمێنن.

جا لەکاتێکدا، کە وڵاتانی ئەورووپا لەوپەڕی چالاکییدا بوون، لە بواری بەرەوپێش بردنی وڵات و، بەرهەم هێنان و داهێنان و گەڕان و سووڕان و لێکۆڵینەوەدا، جیهانی ئیسلامی - کە ئەرکی خەلیفایەتیی، بەدەست تورکە عوسمانییەکانەوە بوو - لەوپەڕی پەرتەوازەیی و بێسەرەو بەرەیی و نەزانیی و بەجێماوییدا دەیان گوزەراند، لە سۆنگەی لادان و دوورکەوتنەوەیانەوە، لە قورئان و سووننەت و ڕاستەشەقامی پێغەمبەر و هاوەڵە بەڕێزەکانی.

هەڵبەتە لە ئاوا حاڵێکدا، دڕندەیەکی جیهان خۆری بێئایین و بێویژدانی مێشك بە بیرو فەلسەفەی (ناسیۆنالیزم) ئاودراوی، وەك ئەورووپا، مەحاڵە بەسەر نێچیرێکی وا تووك نەرمی سادە و ئاساندا باز بدات!! بۆیە ئەورووپا کەوتە قم خۆشکردن و ددان سوین، لەو نێچیری وا سەربەخێر و وا ئاسان و دەستەمۆ.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەورووپا لە جەنگی چەکدارانەدا، زۆری لە دەستی مسوڵمانانی پێشوو چێژتبوو، چ لە سەردەمی (سەلاحەددین)ی ئەییوبی و چ لە سەردەمی زێڕینی تورکە عوسمانییەکاندا[1]، بۆیە نەیوێرا لە مەیدانی جەنگی چەکدارانەدا بەرەنگاری مسوڵمانان ببێتەوە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە، ئیمپریالیزمی جیهان خۆر، ویستی پێشەکی جەنگی بیروبڕوا و دەروونی (الحرب النفسیة) لەگەڵ مسوڵماناندا بەکار بێنێ، بۆ ئەوەی ببێتە ڕێخۆشکەر و ئامادەکردنێك بۆ جەنگی داهاتوو.

ئنجا کاتێك کەوتنە سەر نەخشەکێشان و پیلان دانان، بۆ دەست پێکردنی ئەو جەنگە فیکریی و دەروونییە، زانیان، کە سەرکەوتووترین هۆ بۆ بەڕێوەبردنی پیلانی (پەرتکە و زاڵبە) (فرق تسد)، لە نیشتمانی ئیسلام دا بریتیە لە: بیری نەتەوەپەرستیی (ناسیۆنالیزم). چونکە ئۆممەتی ئیسلامیی، بەهۆی بیروبڕوای

---

(١) بۆ ئەوەی مەردایەتیی و زەبر وەشێنیی مسوڵمانانت لەو سەردەمانەدا بۆ دەربکەوێ و، بزانی چ کارێکی بە ئەورووپای جیهان خۆری ئێستا کردوە، سەرنجی کتێبی (الفتوحات الإسلامیة)، ب١، ل١-٢ بدە، نووسراوی أحمد زینیی دحلان.

www.alibapir.com


ئیسلامییەوە بوو، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لەژێر ئاڵای یەك دەوڵەتدا کۆبوونەوە، جا ئەگەر هاتوو نەتەوەپەرستیی و نیشتمان پەرستیی، جێی خواپەرستیی گرتەوە، ئەوە عارەب بە عارەبایەتییەوە دەنازێ و، کورد بەکوردایەتییەوە و، فارس و تورك و هیندیی و...هتدیش بە هەمان شێوە.

ئەو کاتیش پارچەپارچە دەبن و هێز و پێزی جارانیان نامێنێ، هەر بۆیەش خوای زانا و میهرەبان پێی فەرموون: ﴿وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ الانفال: ٤٦. واتە: (لە نێوخۆتاندا، ناکۆك مەبن، (ئەگەرنا) دەدۆڕێن و هێز و پێزتان نامێنێ).

جا لەبەر ئەوەی لەو سەردەمیدا، دوو شوێن لە نیشتمانی ئیسلامییدا لە هەمووی گرنگتر بوون، چونکە یەکەمیان، جێگای خیلافەتی ئیسلامیی بوو، کە تورکیایە و، دووەمیشیان، وەك مێشك وابوو سەبارەت بە جیهانی ئیسلامیی، کە میسرە، لەبەر ئەوە ئیمپریالیزمی جیهانخۆری ڕۆژئاوا، لە سەرەتاوە لەو دوو وڵاتەوە دەستی پێکرد، ئەویش بەهۆی بەکرێگرتنی دەستەیەك لە چڵکاوخۆر و کاسەلێسانی خۆی.

بەو جۆرە لە میسر و تورکیادا، دەست کرا بە لێدرانی دەهۆڵی عارەبایەتی و تورکایەتی و، دواتر ئەو میکرۆبە پیسەی (ناسیۆنالیزم)، هەموو جیهانی ئیسلامیی تەنییەوە و، لە ئاکامدا نەتەوە پەرستەکانی تورکیا، لەژێر چاودێری سەهیۆنیزم و ئیمپریالیزمی جیهانیدا، بە ڕابەرایەتیی (کەمال ئەتاتورك)، خیلافەتی عوسمانییان کۆتایی پێهێنا و، ڕژێمێکی نەتەوەپەرستانەیان دامەزراند، لەسەر بنچینەیەکی بێدینی (عەلمانیی) و، نیشتمانی ئیسلامیی پارچەپارچە کرا.

ئەمە کورتەیەك بوو، دەربارەی مێژوو و چۆنیەتی سەرهەڵدانی بیری نەتەوەپەرستیی لە جیهاندا بەگشتی و، لەنێو مسوڵماناندا بە تایبەتی.[1]

---

(١) لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا، لە چەند کورتە باسێکدا، بەدرێژیی باسی چۆنیەتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی بیری ڕەگەزپەرستیی و نەتەوەپەرستیی دەکەین، لەجیهاندا بە گشتی و لەنێو ئۆممەتی ئیسلامیدا بەتایبەتی.
تێبینی: بۆ حاڵیبوون لە چۆنیەتی کۆتایی پێهاتن و ڕووخێنرانی دەوڵەتی عوسمانیی، سەرنجی (کیف هدمت الخلافه) بدە، نووسراوی عبدالقدیم زلوم.

www.alibapir.com



خوێنەری بەڕێز!

ئەم وتو ویژەی بەردەستت، توێژینەوەیەکە، کە هێڵە سەرەکییەکانی لە ڕووداوێکی واقیعتی وەرگیراون، هیوادارم توانیبم هەڵوێستی بەرنامەی خوا، سەبارەت بە هەرکام لە (نەتەوایەتیی) - کە بریتیە لە: سۆزێکی نەتەوەیی و غەریزەیەکی سروشتی و، - نەتەوەپەرستیی- کە بریتیە لە: وازهێنان لە خواپەرستیی و داتاشینی بت و سەنەمێکی گونجاو لەگەڵ ڕۆژگاردا، بەناوی نەتەوە، یان نیشتمان - بخەمە ڕوو.

هەڵبەتە، بۆیەش شانم بەبەر نووسینی ئەم باسەدا کرد، چونکە زۆر چاك ئاگادارم، کە نیو سەدە زیاترە، مەسەلەی نەتەوایەتیی و نەتەوەپەرستیی لەنێو گەلی کوردماندا - گەلی کورد بە هەموو بەشەکانیەوە - کراوەتە کراسی عوسمان و، هەردەمە یەکێك بە دەستیەوە دەگرێ و، بەڕاست، یان بەدرۆ و فڕوفێڵ، گەلی کوردی پێ دەورووژێنێ و، دوای ئارەق و خوێنێکی زۆر، دەستی پێ لە بنی هەمبانە دەردێنێ و، کۆشکی بەرزی خەون و خەیاڵانی لێ دەڕمێنێ!

جا بۆ ئەوەی گەلی کوردی مسوڵمان، چیدی بەدوای کڵاوی خوار نەکەوێ و، چیدی دەست بە هەمبانەی بەتاڵدا نەکات و، ئارەق و خوێنی خۆی لەڕێی خوار و بێبەرهەمدا بەفیڕۆ نەدات و! زۆر باش بزانێ، کە بەس لە بەرنامەی خوادا شیفا و دەرمانی دەرد و نەخۆشییەکانی خۆی چنگ دەکەوێ، لە ئیسلامیش بەولاوە، هیچ شتێکی دیکەی دەفریا نایەت، وەك دەفریای نەهاتوە، هەستام بە نووسینی ئەم وتوویژە.

تاقە سەرچاوەی باسەکەشم، قورئانی بەڕێز و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مێژووی ئیسلام بووە.

جا لە خواش دەخوازم، ئەم نووسینەم مایەی ڕەزامەندی وی و زیاتر لە ئیسلام وەنزیك خستنی گەلەکەم بێت.

﴿ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ الحج: ٤٠ .

عەلی باپیر

دێی سەرسیان/ ناحیەی بنگرد/ قەزای دووکان

١٤٠٤ك - ١٩٨٤ز

www.alibapir.com



## پێشەکی چاپی چوارەم

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾ النساء

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد: فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمّد صَلّى اللّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ في النّار.

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!**

ئەم کتێبە، ئەسڵەکەی وتووێژێکە لە ساڵی (١٩٨١)دا بووە ، دواتر لەساڵی (١٩٨٤)دا نووسراوە "واتە: سی و چوار(٣٤) ساڵ لەمەوبەر"، پاشان لەکاتی چاپکردنیدا، بۆ جاری یەکەم "لەساڵی (١٩٩٠)دا" هەندێك باس و بابەتی لێ

www.alibapir.com



زیادکراون و، بۆچاپی دووەمیش، "لەساڵی (١٩٩٨)دا" دیسان هەندێك بابەتی لێ زیادکراون.

شایانی باسیشە لەم کتێبەدا بەڕوون و ڕاشکاویی ئەو ڕاستییە ڕاگەیەنراوە، کە نەتەوەی کوردیش وەك سەرجەم نەتەوەکانی دنیا، مافی شەرعیی و ڕەوای خۆیەتی: خاوەنی ئیرادە و ئیدارەی خۆی بێ و، چارەنووسی خۆی لەدەست خۆی دابێ و، بەویستی ئازادانەی خۆی، شێوەی قەوارەی سیاسیی خۆی دیاریی بکات: ئۆتۆنۆمیی، فیدراڵیی، کۆنفیدراڵیی،دەوڵەتی سەربەخۆ، ئنجا کە هەتا ئێستا نەتەوەی کورد بەومافەی خۆی نەگەیشتوە، ئەوە ستەمێکی لەمێژینەی مێژوویيە لێیکراوە، کە لەلایەن زلهێزانی کۆن و تازەوە و، پێویستە هەرچی زووترە، ئەو ستەمە بێڕەزایە لەسەر ئەو نەتەوە ستەمدیدەیە هەڵبگیرێ و کۆتایی پێ بهێنرێ و، نەتەوەی کوردیش لەسەر نەخشەی سیاسیی جیهان، بوونێکی دان پێداهێنراوی نێودەوڵەتیی هەبێ.

ئێستاش ماوەی دوازدە (١٢) ساڵ زیاتر بەسەر چاپی سێیەمی ئەم کتێبەدا تێپەڕ دەبێ، کە ئەوکاتە بەندە لە زیندانی ئەمریکاییەکاندا بووم و، برای دڵسۆزم مامۆستا حەسەن بابەکر لەژێر ناوونیشانی:(پەیڤێك)دا پێشەکی چاپی سێیەمی نووسیبوو.

هەڵبەتە لەو ماوەیەدا ڕووداوی زۆرو گۆڕانکاریی جۆراوجۆر لەمەیدانی خەباتی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی کورددا، ڕوویان داوە، دەرهاویشتەی زۆرو زەوەندی ئەرێنیی و نەرێنییان لێ کەوتوونەوە، کە ئێمە لەم پێشەکییەدا دەرفەتی ئاماژە پێکردنیشیانمان نیە، چ جای ڕوونکردنەوە و تاوو توێ کردنیان.

بەڵام ئەوەی، کە لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەی پێ بکەم، ئەوەیە: دەرس و پەندێکی گەورە وگرنگ، کە دەبێ لەکۆی ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی وەربگرین، ئەوەیە، کە پێویستە گەلی کورد، هەر لەقیادەی سیاسیی و بڕیار بەدەستییەوە بگرە، هەتا سەرجەم خەڵك و جەماوەر و تاك تاکی کۆمەڵگا" ئەگەر

www.alibapir.com



بیەوێ بەئامانجی کۆتایی خەباتی ڕزگاریخوازیی خۆی بگات، کە بریتییە لە: مافی چارەنووسی خۆ بەدەست بوون" دەبێ چاوێکی جیددیی ڕەخنگرانە بەخۆیدا بگێڕێتەوە و، گۆڕانێکی ڕیشەیی بەسەرخۆیدا بێنێ، وەك خوای کارزان فەرموویەتی:

﴿ ..إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ.. ﴾ الرعد: ١١.

واتە: خوا حاڵ و واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان ئەوەی لە دەروونیان دایە، نەیگۆڕن..

**ئنجا ئەوەی دەروون و جەوهەری مرۆڤەکانیش پێك دێنێ، سێ پێکهێنەری بنەڕەتیین:**

١ـ بیر وبۆچوونەکانی نێوهۆش.

٢ـ هەست و نەستەکانی نێو دڵ.

٣ـ ئاکار و ڕەفتارەکان.

بەڵگەش بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە بەبێ ئەنجامدانی پرۆسەی پاکسازیی و چاکسازیی و ڕاستکردنەوە، نەتەوەی کورد بەئامانج ناگات، ئەوەیە، کە لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا، هەل و دەرفەتی زۆر لە هەرکام لە چوار بەشەکەی کوردستاندا: باکوور، باشوور، ڕۆژ هەڵات، ڕۆژ ئاوا، ڕەخساون، بەڵام بەداخەوە لەبەر بێ توانایی و ناشایستەیی کۆمەڵگای کورستان بەگشتیی و، حوکمڕان و بڕیار بەدەستان بەتایبەتی، ئەوهەل و دەرفەتانە نەقۆزراونەوە و لەدەست دراون.

دیارە حەزیشم دەکرد چەند شتێك لەم چاپەی چوارەمدا، لەم کتێبە زیادبکەم، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەکتێبی: (ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان: گرفت و چارەسەر)دا ، بەدرێژیی لەبارەی ئەو بابەتەوە دواوم و، نوختەم خستۆتە سەرپیت، هەروەها لەکتێبی: (قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لەهەرێمدا)داشدا، دیسان لەوبارەوە دواوم و لەو دوو کتێبەدا هەرچی بەپێویستم

www.alibapir.com



زانیوە لەبارەی چارەسەری کێشەکانی نەتەوەی کوردەوە بەگشتی و، هەرێمی کوردستانەوە بەتایبەت، خستوومەتە ڕوو، بۆیە خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەو دوو کتێبە دەکەم.

**ئەوەی لەم چاپی چوارەمەدا کردوومە:**

١- بەوردی و وشە بە وشە بەکۆی کتێبەکەدا چوومەوەو، هەرچی کەم و کوڕیی و هەڵەی چاپیی هەبووە، ڕاستم کردۆتەوە.

٢- دەستکاریی کۆمەڵێك بڕگەو تەعبیرم کردوە و گۆڕانم بەسەردا هێناون و، چەند شتێکیشم لێ زیاد کردوە.

٣- ژمارەیەك پەراوێزم لێ زیاد کردوون.

٤-بەشێکی سەربەخۆی گرنگم لێ زیاد کردوە،کە بەشی پێنجەمە بەناوونیشانی {کۆمەڵێك وتارو نووسین، لەبارەی بابەتی نەتەوایەتیی و، چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە}، بریتیە لە ژمارەیەك وتار و نووسین، کە لە کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوەو بۆنەی جۆراوجۆردا، لە بارەی بابەتی نەتەوایەتیی و، چۆنیەتی چارەسەری کێشەی کوردەوە، پێشکەشم کردوون.

٥- فەرمایشتەکانمان وردتر (تخريج) کردوون.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت،

أستغفرك وأتوب إليك

عەلی باپیـر

١٤٣٩/٦/٢٢ك

٢٠١٨/٣/١٠ز

هەولێر

www.alibapir.com



## ڕێخۆش کردن

**خوێنەری سەنگین و شیرین!**

ئەم کتێبە، باس و بابەتەکانی ئاوا ڕیز کراون:

**بەشی یەکەم:** کە (دەقی وتو وێژەکە)یە و بناغە و بنەڕەتی ئەم کتێبەشە، زۆر لە مەسەلە گرنگ و هەستیارەکانی نەتەوایەتیی، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، تێدا خراونە ڕوو.

**بەشی دووەم:** (بیری ناسیۆنالیزم و نەتەوەپەرستیی) لە چەند خاڵێکدا، بریتییە لە: حەوت کورتە باس، دەربارەی پێناسە و ڕوونکردنەوەی ماهیەت و مێژوو و پەرێزی بیری نەتەوەپەرستیی.

بۆ ئەوەی هیچ کەس لە پەنای (سۆزی نەتەوایەتیی)دا، کە وەك لە بەشی یەکەمدا ڕوونمان کردۆتەوە، شتێکی خواڕسك و شەرعیی و ڕەوایە و، لە پەنای (مافی نەتەوایەتی)دا - کە خوای دادگەر بە هەموو گەل و میللەتانی بەخشیوە - کەڵکەڵەی نەتەوەپەرستیی و نیشتمان پەرستیی، نەچێتە کەللەوە و پێشی وابێ، ئیسلام ڕێگای داوە.

وەك بەداخەوە، گەلێك عارەبی ڕەگەزپەرست بەناهەق، بەناوی ئیسلامەوە بانگەشەی بۆ دەکەن! بەڵێ، ئامانجی بەشی دووەم ئەوەیە، کە (ڕەوا) و (ناڕەوا) و (پاك) و (پیس) لە مەسەلەی نەتەوایەتییدا، لێك جیابکەینەوە و لێمان تێکەڵ نەبن.

www.alibapir.com



**بەشی سێیەم:** (ئیسلام و کورد و ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەك)، ئەمیش بریتیە لە: حەوت کورتە باس، کە هەموویان لە سوورِگەی پەیوەندیی نێوان ئیسلام و کورددا دەخولێنەوە و، تەم و مژی چەند بۆچوونێکی هەڵە، دەربارەی ئیسلام و هەڵوێستی، لەمەڕ کێشەی کورد ڕەوێنراوەتەوەو، بەڕاشکاویی، هەڵوێستی ئیجابییانەی ئیسلام و پشتگیری تەواوی لەکێشەی ڕەوای کورد، کە ستەمدیدەیی و ماف زەوتکران و بێناوونیشان کرانە، خراوەتە ڕوو.

**بەشی چوارەم:** (مسوڵمانەتیی و کوردایەتیی لە ڕوانگەی ئیسلام و عەلمانییەکانەوە)، ئەمیش، کە بەشی کۆتاییە، یازدە (١١) کورتەباسی گرنگی گرتوونە خۆی و زیاتر پەیوەندییان بە واقیعی ئێستامانەوە هەیە و (هەنووکەیی)ن و، دوایین هەڵوێست و بۆچوونی بەندەشن، لەمەڕ ئەو مەسەلە و بابەتانەی، کە توێژراونەتەوە، هیوادارم هەموو لایەك - بەتایبەتی برادەرانی لائیك - بەبێ هەڵچوون و گرژبوون و، بەسنگی فراوانەوە سەرنجی ئەو باسانە و باسەکانی دیکەش بدەن و، هەر تێبینیی و ڕەخنەیەکیشیان هەبوو، بەشێوازێکی بابەتییانە بیخەینە ڕوو.

**بەشی پێنجەم:** ژمارەیەك هەڵوێستی فیکریی و سیاسیی لەبارەی گەلی کورد و کێشە ڕەوایەکەیەوە، لە کات و شوێن و بۆنەی جۆراوجۆردا.

لێرەوەش ڕایدەگەیەنم: کە هەر شتێکم لەم کتێبە - و هەر بەرهەمێکی دیکەم - دا گوتوە، ئەگەر ڕاست و دروست بوو، ئەوە لەخواوەیە و ئازایەتیی ئیسلامە، ئەگەر هەڵە و ناتەواویش بوو، ئەوە من بە هەڵەدا چووم و ئیسلام لێی بەرییە و، خواش پشتیوان بێ، هەرکات هەستی پێبکەم و بۆم دەربکەوێ دەستبەجێ دەستبەرداری دەبم و، زۆریش مەمنوونی هەرکەسێك دەبم، کە هەڵە و ناتەواوییەکانی خۆمم بخاتە بەرچاو و، وەك دیاریی (هدية) تەماشای دەکەم، چونکە دڵنیام هەموو ئینسانەکان جگە لە پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام)، کە لەبەر متمانە پێکرانی تەواو بۆ ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوای کاربەجێ، لە هەڵە و تاوان پاراستوونی و، ئەگەر شتێکیشیان لەو بارەوە بەهۆی نەپێکانی ئیجتهادەکانیانەوە لێ پشکوتبێتەوە، خوای میهرەبان یەکسەر

www.alibapir.com



ئاگاداری کردوونەوە و بۆی ڕاست کردوونەوەو، بەو جۆرە لە ئاکامدا پارێزراو (معصوم)ن لە هەڵە و کەم و کوڕیی لە هەموو ڕوویێکەوە، بەڵێ لەو زاتە بەرز و ناوازانە بەولاوە، کە بەسەروەر و گەورەیان موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) کۆتایی یان پێهاتوە، هیچ کەس نیە، کە کەم و زۆر، تووشی هەڵە و کەم و کوڕی نەبوبێ و نەیەت، مەگەر کەڵەپیاوی وەك: عومەری کوڕی خەتتاب - کە پێغەمبەر لە چەندان فەرموودەی (صحیح)دا مەدحی زۆری کردوە - نەیفەرمووە: ((رحم الله امرأً أَهْدى إليّ عيُوُبي... ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کە ناتەواوییەکانی خۆمم بە دیاریی بۆ دەنێرێ))؟!

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((بَلِّغوا عَنِّي وَلَوْ آيةً)) رواه البخاري، سەرنجی خۆشمان دەدەین: دەبینین، کە - الحمدالله - لەچاو خەڵکێکی زۆر، کە لە گێژی نەزانیی و بێئاگاییدا دەخولێنەوە، سەرەدەرێك لە ئیسلام دەکەین و شتێکی لێ دەزانین، ئا ئەوەش پاڵمان پێوە دەنێ، کە بێدەنگ نەبین و لەسەر ئیسلام و، بۆ خستنەڕووی ڕووی گەش و جوانی ئیسلام، وە دەنگ بێین و، بەپێی توانا و بڕستمان، خزمەتێك بە گەلی مسوڵمانمان بکەین و، شوێنەواری باش لە پاش خۆمان بەجێ بهێڵین و بۆ ڕۆژێك، کە بێجگە لە ئیمان و کردەوەی چاك، هیچ شتێك دادی ئینسان نادات، پاشەکەوتێك بکەین.

(ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم، وتب علينا إنك أنت التواب الرحيم).

www.alibapir.com



## دوو ئاگاداریی گرنگ

یــەکــەم:

لەهەر جێیەك وشەی (کوردایەتیی)، یان (نەتەوایەتیی)، یان (نیشتمان پەروەرێتیی)مان بەکارهێنابێ، مەبەستمان (سۆزی نەتەوایەتی)، یان (مافی نەتەوایەتیی)یە، نەك ناسیۆنالیزم (نەتەوە و نیشتمان پەرستیی)، مەگەر چۆن، دەنا لە حاڵەتی زەم و بەناڕەوا لەقەڵەم دانیشدا، هەر وشەی ناسیۆنالیزم (نەتەوە و نیشتمان پەرستیی)، یان (بیری نەتەوایەتیی) بەکار دێنین، چونکە هەست و سۆزی گەل و نیشتمان دۆستیی، کە شتێکی خوارسك و (فطری) یەو، مافی نەتەوایەتیی (بە ئازادیی و ئیرادەی خۆ لە خاك و ئاوی خۆدا ژیان) کە شتێکی ڕەوا و شەرعییە، هەرکاتێك کرانە ئیدۆلۆژیی و ڕێباز، ئەوە لە حاڵەتی شەرعیی و ئاسایی خۆیان دەرچوون و، جێگایان بە خواپەرستیی لە دڵی خاوەنەکەیاندا لەق کردوە و، دووچاری جۆرێك لە بت پەرستییان کردوە!

دووەم:

شتێکی ئاشکرایە، کە مسوڵمانان بە هەموو گەل و هۆز و خاك و وڵات و ڕەنگ و زمانە زۆر و جۆراوجۆرەکانیانەوە، یەك کۆمەڵ (أمة واحدة)ن و، لەسەریشیان فەرزە کە هەموویان لەژێر یەك بەیداخ و لەنێو یەك قەوارەدا و، مل کەچی فەرمانی یەك فەرمانڕەوا بن، لەگەڵ ڕێزگرتن لە پێکهێنەر و تایبەتمەندییەکانی هەر گەل و نەتەوەیەك و پاراستنیشیان، دیارە لەو حاڵەتەشدا، سەرجەم مسوڵمانان، بەبێ هیچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوانیاندا، بەهۆی ڕەنگ و

www.alibapir.com



زمان و ڕەگەز و نیشتمان و...هتد.یانەوە، وەك یەك بەشدارن لە بەڕێوەبردن و مشوور لێخواردنی ئەو دەوڵەت و قەوارەیەیان و، هەرکەس بەگوێرەی خەسڵەت و مەرجە بە پێویست گیراوە شەرعییەکان و، بە ئەندازەی لێهاتوویی و شایستەیی خۆی، ئەرك و کار بە ئەستۆوە دەگرێ و، لەشوێنی خۆی دادەنرێ.

ئنجا ئاشکرا و ڕوونە، کە لە کۆمەڵگایەکی ئاوا و لەژێر سایەی حوکمێکی وادا، پاساو (مبّرر)ی عارەبایەتیی و تورکایەتیی و فارسایەتیی و کوردایەتیی و...هتد. نیە، چونکە کەس بە تەنیا حوکمڕان نیە، تاکو ئەوانی دیکە، کە ژێردەستەن، بۆ ئیسپاتی بوونی خۆیان وەك نەتەوەیەك، ئاڵای نەتەوایەتیی بەرز بکەنەوە و داوای مافی ڕەوای خۆیان بکەن!

کەواتە: ئێمە بۆیە لەم بارودۆخەماندا، بەخۆمان ڕەوا دەبینین، کە ڕێك و ڕاست باسی کوردایەتیی و مافی نەتەوایەتیی کورد بکەین، چونکە تێکڕای ئۆممەتی ئیسلام، بە تایبەت برا مسوڵمانە عارەب و تورك و فارسە دراوسێکانمان، لە حاڵەتێکی ناشەرعیی و نائاساییدا دەبینین، ئنجا ئەگەر ئیسلام بۆ حاڵەتی ئاسایی، حوکم و بڕیاری ئاسایی داناون، دیارە بۆ حاڵەتی نائاسایی و ڕێزپەڕ - شاذ - یش، حوکم و بڕیاری نائاسایی دیاریی کردوون، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾ البقرة: ١٧٣.

بەڵێ. بێگومان ئەوەی کە لە حاڵەتی ناچاریی و تێگیران و لێقەوماندا، بۆ ئینسان حەڵاڵ و موباح دەبێت، لە حاڵەتی ئاساییدا ئەو هەقەی پێنادرێ، چونکە خۆیشی پێویستیی پێی نیە و پەکی لەسەری نەکەوتوە.

www.alibapir.com

# بەشی یەکەم

## دەقی وتووێژەکە

کاتی ڕوودانی ئەم وتووێژە:
کۆتایی پایزی ساڵی ١٩٨١ای زایینی

شوێنی وتووێژەکە:
شارۆچکەی (ڕەبەت)ی سەر بە شاری
سەردەشتی کوردستانی ئێران

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - كوردى
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## سەرەتا و دەست پێکردنی
## ئەم وتووێژە

لە ساڵی (١٩٨١)ی زایینی، لەبەر ئەوەی ڕازی نەبووم ببمە بەعسی و بەرگی سوپای بەناو گەلیی (الجيش الشعبي) دەبەر بکەم و، گەردن بۆ فەرمانی ڕژێمی بەعسی عەفلەقیی کەچ بکەم، قاچاغ بووم و دوای دەرچوونی فەرمانی گرتن (أمر قبض)م لەلایەن ڕژێمەوە، ناچار بووم سەری خۆم هەڵبگرم و، وڵات و نیشتمانم بەجێ بهێڵم.

بێگومان ئەوە تەنیا منیش نەبووم، کە دەبوو بەهۆی لەگەڵ ڕژێم نەحاوانەوەیەوە، بە ناچاریی سەری خۆی هەڵبگرێ و نیشتمانی بەجێ بهێڵێ، بەڵکو سەدان کەسی دیکەش، دووچاری ئەو دەربەدەریی و ئاوارەییە دەبوون.

ئنجا سەبارەت بە من و کەسانێکی وەك من، کە بابایەکی ئیسلامیی بووین و، بڕوامان بە ڕێچکە و بیردۆزە مرۆڤ کردە لەملاو ئەولاڕا هێنراوەکان نەبوو و، ئامادەش نەبووین، تاقە هەنگاوێکیش لەگەڵ ئەو پێڕ و تاقمانەدا بڕۆین، کە لەسەر بنچینەی ڕێچکە و بیردۆزەکان بنیات نراون، بەڵێ، بۆ کەسانێکی وەك ئێمە، مەسەلەی دەربەدەریی و ئاوارەیی، یەکجار سەخت و دژوار و پڕ ئێش و ژان بوو!

چونکە بەداخەوە، مسوڵمانانی پێش ئێمە، (ئیسلامی)یانێکی کەمتەرخەم و نەجووڵاو و بێ مشوور بوون، خەمێکی ئەوتۆیان لە ئیسلام و گەلەکەیان نەخواردبوو، کە ئەوانیش وەك پێڕ و تاقمە عەلمانییەکان، جێ پێیەك بۆ خۆیان پەیدا بکەن و، وەزعێك بسازێنن، کە چوار مسوڵمانی ئاوارە و بێپەنا، بتوانن سەریان پێ بهێنن و بیان حەوێننەوە!!

www.alibapir.com



جا من نامەوێ لێرەدا، داستان و سەرگوزشتەی یەکەمین کۆچکردن و ئاوارەبوونم لە بەشە کوردستانی عێراقەوە بۆ بەشە کوردستانی ئێران و، پاشان بۆ تاران و... هتد. بگێڕمەوە، چونکە گێڕانەوەی ئەو داستانە پڕ کەند و لەند و تاڵیی و سوێریی و پەند و عیبرەتە، حەوجێی شوێنێکی تەرخان و سەربەخۆیە، بەڵام من مەبەستم لەم قسانە ئەوە بوو، کە خوێنەری بەڕێز ئاشنا بکەم بەو بارودۆخە نەفسیی و سیاسییەی، کە وتووێژەکەی تێدا ڕوودا‌وە، چونکە ئاشنا بوونی مرۆڤ، بە بارودۆخ و کات و شوێنی ڕوودانی هەر مەسەلە و ڕووداوێك، یاریدەیەکی چاکی دەدات، بۆ چاکتر حاڵی بوونی لەو مەسەلە و ڕووداوە و، زیاتر پەی بردنی بەو قسە و باسانەی، کە لە لایەلای ئەو بابەتەدا دەخرێنە ڕوو..

ئێستاش، کە هەتا ڕاددەیەك بارودۆخ و کات و شوێنی گشتی دروست بوونی ئەم وتووێژەت زانی، با یەکسەر بچینە سەر ئەسڵی مەبەست.

...پاییزی ساڵی (١٩٨١)ی زایینی هاتبۆ برانێ، ئێوارەیەك، ڕێم کەوتە شارۆچکەی (ڕەبەت)ێ و، شەوێ لە ماڵێك میوان بووم، ماڵە خانەخوێیەکەم بێجگە لە من و خاوەن ماڵ، سێ کەسی دیکەشی لێ بوون، هەرسێکیشیان شوێنکەوتووی یەکێك لەو کوێرەڕێ و ڕێچکانە بوون، کە لە تەرازووی ڕێبازی پەروەردگاردا، هێندەی پووشکەیەك سەنگ و کێشیان نییە و، بێجگە لە سەرگەردانیی و خاکەساریی و ماڵوێرانیی، هیچی دیکەیان لە هەگبەدا نیە و، هەر گەل و کۆمەڵێك بروایان پێ بێنێ و شوێنیان بکەوێ، پارچەپارچە دەبێ و دەبنە سەد و یەك پێڕ و تاقم و، لەبەر دوژمنایەتیی نێوخۆ، ئاگایان لە دوژمن نامێنێ و، بەر دەبنە گیانی یەکدی و، دوژمن بەخۆیان خۆش دەکەن.

دوای نان خواردن، قسە و باس هاتنە گۆڕێ و، کۆڕەکەمان گەرم بوو، سەرتان نەیەشێنم، قسان درێژەیان کێشا و لکیان لێ بوونەوە، زۆری نەبرد، لکێکیان هاتە سەر مەسەلەی کورد، پرسیارم لێکردن: بۆچی لەم قۆناغە مێژووییەدا پشتتان

www.alibapir.com



لە ئیسلام کردوە و، کەم و زۆر، نایهێننە نێو حیسابان و پەناتان بردۆتە بەر کوێرە ڕێیەکی دژ بە ژیریی و زانیاریی و نەگونجاو لەگەڵ سروشتی ئینسان دا؟!!

یەکێکیان - کە وادیار بوو دەمڕاست و گەورەیان بوو - ئاوا وەڵامی دایەوە:

ئێمە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی دووروودرێژدا بۆمان دەرکەوت، کە مارکسیزم، باشترین دەرمانی دەردی گەلی کوردە و مەڵحەمێکی زۆر کاریگەرە، بۆ چاکبوونەوەی برینی سەدان ساڵەی و سارێژکردنی، بۆیە وەك بەرنامە و پەیڕەوێك پەنامان بۆی بردوە.

گوتم: بەڵام وەڵامت نەدامەوە، لەسۆنگەی چی یەوە پشتتان لە ئیسلامەتیی کرد؟!!

گوتی: نەخێر، وەڵامی ئەو پرسیارەم نەدایەوە و ناشمەوێ وەڵامی بدەمەوە!

گوتم: بۆچی؟!

گوتی: پیاو هەقێ بڵێ، چونکە لە بابەت ئیسلامەوە، زۆرم لە دڵیدایە و، گەلەکەشمان ئێستا ماوەیەتی بگاتە ئەو ئاستەی، کە بێپەردە هەموو ڕاستییانی بۆ بخەیە ڕوو و، بۆی لە بنی کوولەکە بدەی!

گوتم: وەڵڵاهی، دەنا بەدڵ حەز دەکەم بزانم، سەبارەت بە ئیسلام، چیت لە دڵی خۆتدا حەشارداوە و، ناتەوێ کەس پێی بزانێ، عوزرەکەشت زۆر بەجێ نیە، چونکە ئێستا کەسی وای لێ نیە شیاوی ئەوەبێ، ئەم جۆرە مەسەلانەی لێ پەنادرێن و وەشاردرێن.[1]

---

(١) خوای باڵادەست سەبارەت بەو جۆرە کەسانەی کە ناوێرن بیری پووچ و داخی دڵیان لەنێو مسوڵماناندا بخەنە ڕوو، فەرموویەتی: ﴿قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ آل عمران: ١١٨

واتە: ڕق و قین و دوژمنایەتیی لە زار و زمانیانەوە ئاشکرا بووە، بەڵام ئەوەی، کە دەروون و سینەیان شاردوویەتەوە، گەورەترە.

www.alibapir.com



گوتی: کاکە بەڕاستی، ئیسلام زۆر شووم و بێخێر بووە بۆ گەلی کورد و، گەلێك نەگبەتیی بەسەر هێناون و، زۆر زیانی پێگەیاندوە، لەبەر ئەوە من لە دەرفەتێکی ئاوا سەرپێییدا، توانام نیە هەمووان بخەمە ڕوو، بەڵام پێشینان گوتوویانە: (لوێچێك نموونەی تەغارێکە)، منیش بۆ نموونە، بڕێکیانت دەخەمە بەرچاو.

گوتم: فەرمووو!

گوتی: **یەکەمین:** پێلاقە، کە لە سایەی ئیسلامەوە بە گەلی کورد کەوتوە، داگیرکرانی خاك و ئاویان بوو، بە دەستی هێندێك عارەبی پێخواس و کەس نەناس، کە هاتن گەلی سادە و نەفامی کوردیان فریو دا و، موڵك وماڵیان داگیرکردن و، بەناوی ئایینەوە، خۆیان لێکردنە ڕابەر و پێشەوا و بەربوونە چەوساندنەوەیان.

**دووەم:** کە هەر ئەنجامی پێلاقەی یەکەمە، ئەو عارەبانەی، کە بەناوی ئایین ڕاگەیاندنەوە هاتبوون، پاش ئەوەی پێی خۆیان جێگیر کرد، دەستیان کرد بە پەرەپێدانی ڕێ و ڕەسم و عادەت و نەریتی خۆیان و، سەپاندن و ڕەواج پێدانی ئەدەب و زمان و کەلەپووری نەتەوایەتیی خۆیان و، لە سەرێکی دیکەشەوە کەوتنە هێرش بردنە سەر هەر شتێك، کە پەیوەندیی بە کورد و کوردایەتییەوە هەیە، لە: (نەریت و عادات و ئەدەب و زمان و...)، هەوڵیان دا هەموو شتێکی خۆماڵیی لە بەرچاوی کوردان دزێو بکەن و بیبێزێنن، بۆ ئەوەی کیان و کەسایەتییمان لەدەست بچێ، ئەو کاتیش چەوساندنەوە و ڕامکردنمان ئاسانتر دەبێت.

**سێیەم:** ئیسلام دوای ئەوەی لە خاکی ئێمەدا چەقەرەی دا و ڕەگی داکوتان، بوو بە ماك و سەرچاوەی گەلێك دەرد و نەخۆشیی کۆمەڵایەتیی وەك: سۆفیگەریی و دەروێشیی و شێخایەتیی، کە وەك گیاکەڵە وابوون بۆ لەنێوبردنی گەل و دواخستنی بەهۆی واز پێلەدنیا هێنانی و گەردن پێکەچکردنی بۆ ستەمکار و داگیرکەران.

**چوارەم:** زۆرجاران مەلا و پێشەوا ئایینییەکان، زیانیان لە شۆڕشی نەتەوایەتیی و ڕزگاریخوازی گەلی کورد داوە، بەسەرهاتی ڕووخانی فەرمانڕەوایەتیی میر موحەممەدی ڕەواندزێش، کە بە (پاشاکۆرە) ناسراوە بەفتوای (مەلای خەتێ)، چاکترین بەڵگەی ڕاستیی ئەم قسەیەمانە.

www.alibapir.com



(کابرا دوای ئەوەی لە قسەکانی بۆوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و، پشتی وەدیواری دا و، دەستی کرد بە قوم لێدانی جگەرەکەی، هەستم پێکرد، کە هەروەك چۆن کەسێك کۆڵێکی قورسی بەکۆڵییەوەو دایدەنێ، چەندە هەست بەئاسوودەیی دەکات، ئەویش بە هەمان شێوە!

ئنجا کاتێك ئەو کڕکاتی لە خۆی بڕی، دانیشتوان تێکڕا بێدەنگ بوون و، لێکدا لێکدا کەوتنە سەرنجدانی من و، بە دەردی کورد دەڵێ: (چاویان لێ کردمە درێشە)، منیش بێئەوەی شێوەی دانیشتنەکەم تێك بدەم، بە شێنەیی گوتم:

پێم خۆشە هەر بەوەندە واز نەیەنی، هەرچی لەنێو دڵتدا پەزمەندە بووە، هەڵی ڕێژی، چونکە دەبینم لەمێژە ئەو کۆڵە گرانەت هەڵگرتوە و، زۆر دەروونی ئازارداوی و چاك دڵی پڕکردووی.

گوتی: بەڕاستی وەك لە سەرەتادا گوتم، زۆرم لەدڵدا کۆبۆتەوە و ئەوانەی گوتمن هەندێکیانن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەندە بەسە، چونکە ئەو خاڵانەی خستمنە ڕوو، شتە سەرەکییەکانیانن.

گوتم: کەواتە، ئەگەر توانیم ئیقناعت بکەم بەوەی، کە هیچ کام لەو دەعوایانە لەجێی خۆیاندا نین، یان لایەنی کەم بەرگێکی خەیاڵی ناقۆلایان دەبەر کراوە و، ئیسلام نەك هەر زیانی بۆ گەلی کورد و، هیچ گەلێکی دیکەش نەبووە، بەڵکو گەورەترین و بەپیت و پیرۆزترین نیعمەت بووە و، نەك هەر ماکی دەرد و نەخۆشییەکانی نیە، بەڵکو شیفا و دەرمانی سارێژکردنی دەردەکانیەتی، تۆزێك فێنکایەتییت بەدڵدا دێ و، دێوەزمەی گومان و بێبڕواییت، بڕێك لەسەر شانان لادەچێ؟!

گوتی: بەڵێ.

www.alibapir.com



## وەڵامی ڕەخنەی یەکەم:

گوتم: جارێ سەبارەت بەوەیان، کە جەنابت بە یەکەمین پێلاقەی دەزانی، کە گوایە: لە سایەی ئیسلامەوە بە کوردان کەوتوە، شتێکی زۆر پێچەوانە و بەراوەژوویە لەگەڵ واقیعی مێژوودا.

گوتی: چۆن؟!

گوتم: چونکە ئەو مسوڵمانانەی، کە هاتنە کوردستان و خستیانە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامیی و، گەلی کوردستانیان مسوڵمان کرد و، بە خواپەرستییان ئاشنا کرد، نە بە نیازی داگیرکردن و تاڵان و بڕۆوە هاتبوون، نە بە ئومێدی خەڵك تەفرەدان و مێشك بەنج کردنەوە، چونکە:

١- وەك مێژوو هەواڵی پێداوین و، دۆست و دوژمنیش دانیان پێداهێناوە، کە سوپا و لەشکری ئیسلامیی ئەو دەمی - کە زۆربەیان برادەرانی پێغەمبەر بوون - لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەموو دارایی و غەنیمەتەیان لە ئەنجامی جەنگدا چنگ کەوت، هەر بە دنیا بەکەمگرتن و ژیانێکی سادە ژیاون و، بە خەم جل و بەرگ و خواردن و خۆراکەوە نەبوو ون و، تاقە هیوا و ئاواتیان، ڕازیکردنی خوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەر و، ڕاگەیاندنی بەرنامەی ئیسلام بووە.

ئنجا ئەگەر ڕاستە ئەوان بە ئومێدی تاڵان و بڕۆ و خەڵك ڕووتاندنەوە و، خاك و ئاو داگیرکردن و چەوساندنەوەوە هاتبوون، بۆچی ئەو شتەی بۆیان هەوڵ دەدا و خۆیان کردبووە قوربانیی و، ماڵ و منداڵ و نیشتمانیان بۆ بەجێ هێشتبوو، دوای وەدەست هێنانی، نەکەوتوونە سوود لێوەرگرتن و پێوە ڕابواردنی؟!

ئایا ئەو کەسەی لە پێناوی ئامانجێکدا خۆی و دایك و بابی و ماڵ و منداڵی و نیشتمانی بەخت دەکات، دوای ئەوەی ئەو ئامانجەی دەستگیر دەبێ، بە پەرۆشەوە ئامێزی بۆ ناگرێتەوە و لەباوەشی ناگرێت؟!

www.alibapir.com



**٢**- هەر کەسێك برێك موتاڵای مێژووی ئیسلامی کردبێ و، لەو ڕووەوە تۆزێك شارەزابێ، دەزانێ کە مسوڵمانەکان هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی ماددیی و دنیاییی پاڵی پێوە نەناون، کە جەنگ لەگەڵ کورد و گەلانی دیکەشدا بکەن، بەڵکو تاقە شتێك، کە بۆتە هاندەر و پاڵنەریان، ڕاگەیاندنی ئایینی خوا و ڕزگارکردنی گەلە ژێردەستە و چەوساوەکان بووە، لەژێر نیر و ڕکێفی تاغووت و زۆرداران.

ئێستاش فەرموون، با سەرنجێکی مێژوو بدەین، تا بزانین لەو بارەوە چۆنمان هەواڵ پێدەدات:

مێژووزانی مەزن (ابن کثیر) لە کتێبی (البدایـــة والنهـــایة)دا، ســـەبارەت بەچۆنییەتی ڕووبەڕوو بوونی سوپای ئیسلام لەگەڵ سوپای فارسدا، ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

((...کاتێك سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتیی: (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) و، سوپای فارس بە سەرکردایەتی: (ڕۆستەم)، پێکەوە ڕووبەڕوو بوون، (ڕۆستەم) ناردیە لای سەعد، کە پیاوێکی ژیر و دانای بنێرێتە لا، تاکو پرسیاری لێ بکات، ئەویش (موغەیرەی کوڕی شوعبە)ی نارده لا، جا کاتێك چووە لای، ڕۆستەم پێی گوت: ئێوە دراوسێمان بوون، ئێمە چاکەمان لەگەڵ کردوون و نەمان هێشتوە تووشی ئازار و زیان ببن، ئێستاش بگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان، ئێمەش ڕێ لە بازرگانییتان ناگرین، کە بێنە نێو وڵاتمانەوە.

موغەیرە گوتی: ئێمە بەدوای دنیا نەکەوتووین، ئامانج و مەبەستمان دوارۆژە "ڕازییکردنی خوا و شادبوون بە بەهەشتی بەرین"، خوای بەرز، پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین پێی فەرمووە: من ئەم کۆمەڵە مسوڵمانە زاڵ دەکەم، بەسەر هەر کەسێکدا کە شوێن ئایینەکەم نەکەوێ و، من بەم کۆمەڵە مسوڵمانە تۆڵەیان لێ دەستێنم، هەمیشە ئەم کۆمەڵە زاڵ دەکەم، هەتا بڕوایان بەم ئایینە هەبێ، ئەو ئایینەش ڕاست و دروستە، هەرچی لێی لادات، کەنەفت و ژێر دەست دەبێ و، هەرچی دەستی پێوە بگرێ، سەربەرز و بەهێز دەبێ.

ڕۆستەم پێی گوت: ئەو ئایینە چی یە؟!

www.alibapir.com



گوتی: جارێ بڕبڕەی پشتی، کە بەبێ وی، هیچ شتێك ناگونجێ بریتیە لە: شایەتیی دان و دان هێنان بەوەدا، کە بێجگە لە خوا، کەس شایانی پەرستران و گەردن بۆ کەچ کران نیە و، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، وە دان هێنان و بڕواهێنان بە هەر شتێك کە لەلایەن خواوە هاتوە.

ڕۆستەم گوتی: چ هەیە لەمە چاکتر! ئنجا چی دیکەش؟!

گوتی: ڕزگارکردنی بەندەکان لە کۆیلایەتیی بۆ بەندەکان، بۆ بەندایەتییکردن بۆ خوا.

ڕۆستەم گوتی: ئەمەش دیسان چاکە، بەڵام چی دیکەش؟!

گوتی: خەڵکی وەچەی ئادەم و حەووان، کەواتە: بران و لە یەك دایك و بابن.

ڕۆستەم گوتی: ئەمەش دیسان چاکە.

ئنجا ڕۆستەم گوتی: باشە دەڵێی چی، ئەگەر بێینە نێو ئایینەکەتانەوە، واز لە وڵاتی ئێمە دێنن؟!

گوتی: بەڵێ، لە وڵاتتان نزیك نابینەوە، مەگەر بۆ بازرگانییەك، یان پێویستییەك.

گوتی: ئەمەش باشە.

ئنجا کاتێك موغیرە چووە دەرێ، ڕۆستەم لەگەڵ دەمراست و ڕدێن سپیانی گەلەکەیدا، سەبارەت بە ئیسلام وتووێژی کرد، بەڵام ئەوان پشتگیریی ئەوەیان نەکرد و ڕازیی نەبوون بچنە نێوی..)).[1]

ئنجا برادەران! ئەمە یەکێکە لەو بەسەرهاتانەی، کە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونی مسوڵمانەکانمان بۆ دەردەخەن لەگەڵ ئەو گەلانەدا، کە ویستوویانە ئایینی خوایان پێ ڕابگەیەنن، وەك دەبینین: دادگەریی و بەزەیی و ئاشتیخوازیی و سینە فراوانیی و

---

(١) دەقی ئەم بەسەرهاتەم لە کتێبی (البداية والنهاية) وەرگرت، چاپی یەکەم، ب٤، بەشی ٧، ل٤٣.

www.alibapir.com



دنیانەویستیی لەو مسوڵمانە بەڕێزانەدا، کە دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەری ئیسلام بوون، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە!

**ئێستاش بۆ چاکتر ڕوون کردنەوەی مەبەست، با وێنەیەکی دیکە بێنینەوە:**

دیسان (ابن کثیر) لە کتێبی ناوبراودا، ئەم بەسەرهاتەشمان بۆ دەگێڕێتەوە:

((..ئنجا سەعد (خوا لێی ڕازی بێ)، لەسەر داوای ڕۆستەم، نوێنەرێکی دیکەی نارده لا، ئەویش (ڕیبعیی کوڕی عامیر) بوو، کە ڕیبعیی چووە لای، تەماشای کرد نشینگە (مجلس)ی ڕۆستەمیان بە چەند سەرینێکی زێڕ کفت کراو و چەند بەڕە و فەرشێکی لە ئاوریشم دروست کراو، ڕازاندۆتەوە، گەوهەر و مرواری بەنرخ خرابوونە بەرچاو، لەگەڵ جوانیی و ئارایشتێکی زۆردا، تاجەکەی لەسەر نابوو و گەلێك کەل و پەلی گرانبای دیکەش ڕانوێنرابوون، ڕۆستەم لەسەر تەختێکی زێڕین دانیشتبوو، ئنجا (ڕیبعیی) بە جل و بەرگێکی تەنکەڵە و، بە شمشێر و قەڵغان و ئەسپێکی کورتەڵەوە هات، دانەبەزی، هەتا گەیشتە سەر قەراغی فەرشەکە، دوایی دابەزی و ئەسپەکەی بە هەندێك لە کورسی و تەختەکانەوە بەستەوە، دوایی هاتە پێشەوە، چەك و زرێیەکەی هەر پێوەبوو، کڵاوە ئاسنینەکەی هەر لەسەر بوو.

پێیان گوت: چەکەکەت دانێ.

گوتی: من بۆیە نەهاتووم بە فەرمانی ئێوە چەك دانێم، بەڵکو بۆیە هاتووم، ئێوە بانگتان کردووم، ئنجا ئەگەر لێم دەگەڕێن، ئاوا بێم چاکە، ئەگەرنا دەگەڕێمەوە.

ڕۆستەم گوتی: لێی گەڕێن بابێ، ئنجا هاتە پێشەوە و لەسەر سەرینەکان، خۆی خستە سەر ڕمبەکەی و دڕاندیی! ئنجا پێیان گوت: چ شتێك ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟!

گوتی: خوا ناردووینی، بۆ ئەوەی هەرکەسێك بیەوێ، ڕزگاری بکەین لە کۆیلایەتیی بەندەکان بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، هەروەها لە تەسکی دنیا بۆ فراوانیی دنیا و دواڕۆژ، لە ستەم و بێدادیی ڕێچکان، بۆ دادگەریی ئیسلام،

www.alibapir.com



خوا ئێمەی ڕەوانەکردوە بە ئایینەکەیەوە، بۆ ئەوەی خەڵك بۆ لای بانگ بکەین، جا هەرکەسێك گوێمان لێ بگرێ، ئەوە باشە، هەرکەسێکیش هەقمان لێ وەرنەگرێ، لەگەڵی دەجەنگین، هەتا دەگەینە بەڵێن و موژدەی خوا.

گوتیان: بەڵێن و موژدەی خوا چی یە؟!

گوتی: بەهەشتە بۆ کەسێك، کە لەکاتی جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەدا دەمرێ، کە بە بەرنامەی خوا ڕازیی نین و، سەرکەوتنە بۆ ئەوانەی دەمێننەوە.

ڕۆستەم گوتی: ئەوە قسەی ئێوەم بیست، بەڵام ئایا دەگونجێ ئەم کارەتان دوابخەن، هەتا ورد دەبینەوە و ڕاوێژی تێدا دەکەین؟!

گوتی: بەڵێ، پێتان خۆشە چەند بێ؟ ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ؟!

گوتی: نا، بەڵکو هەتا نامە دەنێرین بۆ قسەزان و ڕدێن سپیی و سەرکردەکانمان.

گوتی: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردووین، کە لەکاتی جەنگدا، لەسێ ڕۆژان زیاتر، لەسەر دوژمنمان ڕانەوەستین، ئنجا چاك لە ئیشی خۆت و گەلەکەت وردبەوە و، دوای سێ ڕۆژان، یەکێك لە سێ شتان هەڵبژێرە.[1]

---

(١) ئەو سێ شتانە هێندە زانراو بوون، پێویست نەبووە بگوترێن، کە ئەمانەن:

**یەکەم:** وەرگرتنی ئیسلام و مسوڵمان بوون.

**دووەم:** ئەگەر مسوڵمان نەبن، سەرانە (جزية) بدەن.

**سێیەم:** ئەگەر سەرانەش نەدەن ئامادەی جەنگ بن.

لەم فەرموودەیەش دا، کە (مسلم) گێڕاویەتەوە ئەو سێ شتانە - کە مسوڵمان بوون، یان ملکەچ کردن بۆ حوکمی ئیسلامیی و ئیعلانی دژایەتیی نەکردنی، کە لە (سەرانە)داندا خۆی دەنوێنێ، یان بە ناچاریی ئامادە بوون بۆ جەنگ - زۆر جوان دیاریی کراون: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، ثُمَّ قَالَ اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَلا تَغُلُّوا وَلا تَغْدِرُوا وَلا تَمْثُلُوا وَلا تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ -أَوْ خِلالٍ- فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلامِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ... فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمْ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ) رواه مسلم: ٤٤٩٧. واتە: پێغەمبەری خوا کاتێك فەرماندەیەکی بۆ سوپایەك، یان بۆ کۆمەڵێك دیاریی دەکرد، دەربارەی شەخسی خۆی ئامۆژگاریی دەکرد بە پارێز لە خوا کردن و، سەبارەت بەو مسوڵمانانەش، کە لەگەڵیدان، بە چاکەکردن، پاشان دەیفەرموو: بەناوی خوا و لەڕێی خوادا غەزا

www.alibapir.com



ڕۆستەم گوتی: تۆی گەورەی مسوڵمانان؟

گوتی: نا، بەڵام مسوڵمانان وەك یەك جەستە وان، ئەگەر گچكەترینیان یەكێك پەنا بدات، بەرزترینیان لە قسەی دەرناچێ و قسەی ناشكێنێ، (هەڵبەتە بە مەرجێك دەرچوونی لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر) تێدا نەبێ.

دوایی ڕۆستەم لەگەڵ قسە بەدەست و پیاوماقووڵانی گەلەكەی كۆبۆوە و، گوتی: ئایا هەرگیز لە قسەی ئەم پیاوە بەرزتر و تەواوترتان دیوە؟

گوتیان: پەنا بەخوا، كە بەلای هیچ كام لە قسەكانیدا بچی و، ئایینەكەی خۆت واز لێ بێنی بۆ ئەم سەگە، ئەوە سەرنجی جل و بەرگەكەیت نەداوە؟!

ڕۆستەم گوتی: تەماشای جل و بەرگ مەكەن، بەڵكو سەیری بیروڕا و وتووێژ و ڕەوشت و خوو بكەن، چونكە مسوڵمان گرنگی بە بەرگ و كاڵا و خواردن نادەن و، بایەخ بە ڕێز و حورمەت و سەربەرزیی و مەردایەتیی دەدەن و، ڕەوشت و خوویان دەپارێزن...).[1]

لەم بەسەرهاتەشدا دەبینرێ، كە مسوڵمانەكان بە ئاشكرا بە گەلانی دنیایان ڕاگەیاندوە، كە بە مەبەستی ڕاوو ڕووت و خەڵك ئازاردان و وڵات داگیركردن نەهاتوون، بەڵكو بە مەبەستی ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا و، ڕووخاندنی كۆشكی تاغووت و ستەمكاران و، ڕزگاركردنی چەوساوە و ستەمدیدە و هەژاران هاتوون.

---

بكەن، لەگەڵ هەركەسێكدا بجەنگن، كە بڕوای بەخوا نیە، غەزا بكەن، بەڵام دزیی لە غەنیمەت مەكەن و(لەگەڵ دوژمنێكی پەیمان لەگەڵ بەستراودا) پەیمان مەشكێنن و، جەستەی كوژراوانی دوژمن ناشیرین مەكەن، منداڵان مەكوژن، هەركات بەرەنگاری دوژمنەكەت بووی لە هاوبەش پەرستەكان، بانگیان بكە بۆ سێ شتان، ئنجا هەر كامێكیانیان (لەو سێ شتە كە سەرپشكیان دەكەی بۆ هەڵبژاردن) لێ وەرگرتی، لێیان قبووڵ بكە و وازیان لێ بێنە؛ بانگیان بكە بۆ وەرگرتنی ئیسلام، ئنجا ئەگەر وەڵامیان دایەوە، لێیان قبووڵ بكە و وازیان لێ بێنە.. بەڵام ئەگەر ڕازیی نەبوون، ئەوە داوای سەرانەیان لێ بكە، ئنجا ئەگەر ئەوان ڕازیی بوون و وەڵامیان دایەوە، لێیان وەربگرە و لێیان گەڕێ، بەڵام ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون، ئەوە داوای یارمەتیی لە خوا بكە و لەگەڵیان بجەنگە.

(١) بڕوانە البداية والنهاية، بەرگی چوارەم، بەشی ٧، ل٤٤، چاپی یەكەم هەروەها (الفتوحات الإسلامية)ی أحمد بن زيني دحلان، ب١؛ هەروەها (تأريخ الأمم الإسلامية)ی شيخ محمد خضري بك، ب١، ل٢٠٧-٢٠٩.

www.alibapir.com



بەڵێ! دەریان بڕیوە کە بۆیە هاتوون: بەرنامە و پەیڕەویی خوا لەسەر زەوی بچەسپێنن و، ئەو ئایین و ڕێچکە و بیرانەی، کە چینایەتیی و گەورە و بچووکیی و، قڕیی و پڕیی و، ڕەوشت نزمیی لەنێو خەڵکیدا دێننە دی و، ئینسانەکان دەکەنە کۆیلە و ژێردەستە و چەوساوە، نەمێنن و فڕێ بدرێنە زبڵدانی مێژووەوە، دەریان بڕیوە، کە بۆ ئەوە هاتوون: مرۆڤایەتیی لەو جۆرە بیروبۆچوون و کوێرە ڕێیانە ڕزگار بکەن، کە بەهۆی تێڕوانینی هەڵەو ناتەواوییانەوە، ژیانی دنیا لە مرۆڤ تەنگ دەکەنەوە و، لەنێو چوارچێوەیەکی تەسکی ماددەپەرستیی و بێبڕوایی، یان نەتەوەپەرستیی و بێخواییدا، تەنگ بە مرۆڤ هەڵدەچنن و، بەرەو کەندەڵان و هەڵدێری ڕەوشت نزمی و، ئاژەڵ سفەتیی و دڕندایەتیی، دەیبەن.

**ئنجـا بـرادەران!**

ئەمەیە واقیعی مێژووی ئیسلامیی و، سەبارەت بە هاتنی ئیسلام بۆ نێو گەلانی دنیا، ئاوا هەواڵمان پێدەدات.

ئێستاش بە پێویستیی دەزانم، قسەیەکی ناحەزانی ئیسلام وەدرۆ بخەینەوە، کە هەندێك مسوڵمانی سادە و حاڵی نەبووش، پێی فریودراون و لە خشتە براون، کە گوایە: ئیسلام بە شیر و تیر بڵاوبۆتەوە، مسوڵمانەکان، کە هاتوون، تووشی هەرکەسێك بووبن، پێیان گوتوە: مسوڵمان بە! ئەگەر مسوڵمان بووبێ، ئەوە زۆر چاکە! خۆ ئەگەر مسوڵمان نەبووبێ، یەکسەر سەریان پەڕاندوە و ملیان هەڵبڕیوە!!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەم قسەیە، دەعوایەکی بێشایەدە و زۆر دوورە لە ڕاستیی، چونکە یەکێك لە بەڵگەنەویستەکانی ئیسلام ئەوەیە، کە عەقیدە و بڕوایەك لەسەر بنچینەی قەناعەتی ئینسان و، بە ویست و ئیرادەی خۆی نەبێت، وەرناگیرێ و بایەخیی نیە، وەك خوای قسە لەجێ فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

www.alibapir.com



واتە: لە وەرگرتن و شوێنکەوتنی ئاییندا، زۆرەملێ و تۆبزیی کردن نیە، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت، لێك جوێ بوونەتەوە.[١]

ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە، وەك مێژوو هەواڵی پێداوین، تەنها کاتێك مسوڵمانان پەنایان بردۆتە بەر چەك، کە ئەو گەلەی لەگەڵی ڕووبەڕوو بوونەتەوە، نە مسوڵمان بووبن و، نە ڕێگەیان دابێ بۆ ڕاگەیاندرانی ئیسلام - کە لە نەدانی سەرانەدا خۆی دەنوێنێ - ئەو کاتەش مسوڵمانان ناچار بوون دەست بدەنە چەك، بەڵام نەك بۆ بەزۆر مسوڵمان کردنی خەڵکی - چونکە تۆبزیی کردن لە وەرگرتنی ئاییندا نیە - بەڵکو بە مەبەستی لابردنی ئەو زۆردار و خاوەن بەرژەوەندییانەی، کە لەڕێی ئیسلامدا بوونەتە پەرچ و تانە و، وەك ئەو گاشە بەردەیان لێهاتوە، کە دەکەوێتە نێو کانیاوێکەوە، نە بۆ خۆی دەخواتەوە، نە ڕێ بە خەڵکیش دەدات بخۆنەوە، هەڵبەتە لابردن و فڕێدانی ئەو گاشەبەردەش پێویستە.

بەڵێ، ئیسلام هێزی خستە کار، بۆ ئەوەی بە دنیادا بڵاو بێتەوە و بچێتە بەرچاو و دڵی خەڵکی، جا ئەوکات کێ بە ویست و خواستی خۆی هەڵیبژارد زۆر چاکە، کێش پێی ڕازی نەبوو، کەس بۆی نیە، بیکوژێ، یان تۆبزیی لێ بکات!!

ڕەنگە یەکێك بپرسێت: جا خۆ براله، ئەو گەلانەی مسوڵمانەکان لەگەڵیان بەشەڕ دەهاتن، هەر ئەوانە بوون، کە ئاییینی ئیسلامیان نەدەویست، شەڕ لەگەڵ کردنەکەشیان چاکترین بەڵگەی پێقایل نەبوون و نەویستنەکەیان بووە، مادام وابێ چۆن دەڵێی: مسوڵمانەکان بە نیازی خەڵك مسوڵمان کردنەوە، نەجەنگیون؟!!

---

(١) لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە، کە دوابەدوای ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ گوتراوە: ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ﴾. لەمەوە دەفامرێتەوە، کە پاش ڕاگەیاندنی ئایین، تۆبزیی کردن نیە، چەمکی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة)ی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، کە بەر لە ڕاگەیاندنی ئایین تۆبزیی کردن هەبێ، ئاشکراشە، کە بەکارهێنانی هێز و تۆبزیی کردن لەو کاتەدا ڕەوایە، بەڵام نەك بۆ باوەڕ پێهێنان، بەڵکو بۆ لابردنی ئەو تاغووت و زاڵمانەی، کە بوونەتە تانە و چەپەر و لەمپەر لە ڕێی بڵاوبوونەوە و ڕاگەیاندنی ئیسلامدا، واتە: هێز بۆ ڕاوەستان لە بەرانبەر هێز و دەستەڵاتی کوفر و شیرکدا، کە ڕێی بیرکردنەوەی ئازاد و بڕواهێنان بەخوا و، بەرنامەکەی لەخەڵکی دەگرێ.

www.alibapir.com



لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم ڕەخنەیە، کاتێك جێی خۆی دەگرێت، کە ئەو کەسانەی لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگیون:

**یەکەم:** هەرکامێکیان بێ زۆرەملێ و چاو زەق کردن و هەڕەشە و گوڕەشە، هاتبێتە کۆڕی جەنگەوە، دیارە ئەوەش وانەبووە و حوکمڕان و میری هەر ناوچەیەك، نوێنەری هەموو خەڵکەکە بووە و، هیچ کەس لە ئاستیدا خاوەنی ویست و قسەی خۆی نەبووە و، کورد گوتەنی: کەس زاتی نەکردوە بڵێ: لەل!

بێگومان شتێکی ڕوونیشە، کە بابای سەرۆك و میر، بەس لە گۆشەنیگای تەسکی بەرژەوەندیی خۆیەوە دەڕوانێتە شتان، هەمو کاتێکیش بەرژەوەندیی میرێکی خۆسەپێن و بەزەبر و زۆر لەوەدایە، کە بارودۆخ هەروەك خۆی بمێنێتەوە و دوور بن لەو ئیسلامە، کە لە بەنزین بەکارترە بۆ هەڵایسانی ئاگری شۆڕش دژی بارودۆخی نالەبار و لابردنی ڕژێمی پڕ ستەم و چەوساندنەوە و، خراپە و ئاشووبی دوور لە خوا.[1]

---

(١) بەڕاستی هەرجارێك بەسەرهاتی یەکێك لەو جەنگانەم دێتە بەرچاو، کە لەنێوان هێزی ئیسلام و دانیشتووانی ئەو وڵاتانەدا ڕوویداوە، کە ویستوویانە ڕووناکی ئیسلامی بگەیەننە نێو، خامەی زەین و بیرم، تابلۆیەکی بەم شێوەیە لە سەر ڕووپەڕی خەیاڵم دەنەخشێنێ:

وا دێتە بەرچاوان، کە کۆمەڵە پزیشکێکی زۆر دڵسۆز، بەکۆڵێك دەرمان و پێداویستییەکانی پزیشکییەوە دەیانەوێ بچنە نێو شارێکەوە، کە دانیشتووانی، دووچاری چەندان دەرد و نەخۆشیی کوشندە هاتوون، بەڵام دز و جەردە و ڕێگر لەسەر دەروازەی ئەو شارە دانیشتوون و، گەلێك لە نەخۆش و دەردەدارەکانیشیان بە بێگار هێناوە، بە بیانووی ئەوەی گوایە: بەرگریی لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەن، چونکە دەزانن بە هاتنی ئەو پزیشك و حەکیمانە، چارەسەری دەرد و نەخۆشیی خەڵکەکە دەکرێ، بەوەش دەرفەتی چەوساندنەوەی خەڵکەکەیان لەقیس دەچێ، بەڵگەی ڕاست و دروستی ئەم وێچواندنەشم ئەوەیە، کە بە درێژایی مێژووی ئایین، خەڵکی لە ئاقار ئاییندا، دوو بەرەیان پێك هێناوە:

یەکەم: بەرەی ڕەش و ڕووت و چەوسێنراوەکان، کە بوون بە هەڵگری ئاڵا و مەشخەڵی ئایین و پشت و پەنای.

دووەم: بەرەی زۆردار و چەوسێنەران، کەبوونە چەپەر و کۆسپ و بەربینگیان بە ئایین و شوێنکەوتووانی گرتوە، لە قورئانی بەڕێزیشدا، زۆرجاران وشەی (المستضعف)، واتە: چەوسێنراوەو، (المستكبر)، واتە: چەوسێنەر و خۆبەزل زان و (المترف)، واتە: خۆشگوزەران، بەکارهێنراون.

www.alibapir.com



**دووەم:** کە هەرکامێکیان لە کاکڵ و نێوەڕۆکی ئیسلام تێگەیشتبن و، بزانن چی یە و چۆنە، دیارە ئەمەش نەهاتۆتە دی، کەواتە: ئەو گەلە چەوساوە، بۆیە لەگەڵ سوپای ئیسلام دا نەجەنگیوە، کە پێشگیریی لە بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی بەرنامەی خوا بکات، چونکە وەك گوتمان: ئەو، بەرنامەی ناوبراوی نەناسیوە، بەڵکو بۆیە شەڕی کردوە، تاکو پێشگیریی لەو ئیسلامە دزێو و ناقۆڵایە بکات، کە دامودەزگای پڕوپاگەندەی ئاغا و میر و زۆردار و تاغووتە خاوەن بەرژەوەندییەکان، لە تابلۆی نالەباردا ڕایان دەنواند و لەبەر چاوانیان دەبێزراند.

بەڵێ، ئەو گەلە، کە لەگەڵ لەشکر و سوپای ئیسلامدا بەشەڕ هاتوە، لەبەر ئەوە نەبووە، کە لێی حاڵی بووە، بۆیە دەستەو یەخەی بووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو گەلە لە ڕاستیدا، لەگەڵ تارماییەکدا جەنگیوە، کە دامودەزگای زۆردارەکان ڕایان نواندوە، بە واتایەکی دیکە، بۆیە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگیوە، چونکە لە نیازی پاك و مسوڵمانانەیان نەگەیوە و، ستەمکار و خاوەن بەرژەوەندیی و ئەشراف ناشەریفەکان، پڕوپاگەندەیان بۆ کردوە و بە سەهوویان بردوە.[1]

...مەسەلەی فریودانی کوردانیش، لەلایەن مسوڵمانانی هەوەڵەوە، کاتێك وەڕاست دەگەڕێ، کە ئیسلام بیروباوەڕێکی بێ خێر و خراپ بێ، بەڵام کەسێك خەڵکی بانگ بکات بۆ بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست و، ژیانێکی پڕ خێر و بەرەکەت، لەژێر سایەی ئیسلامدا، پێی ناگوترێ: خەڵك فریودەر و هەڵخەڵەتێنەر، بەڵکو پێی دەگوترێ: پێشەوا و ڕێ نیشاندەری دڵسۆز.

---

هەڵبەتە زاراوەی (المستضعف)، دروشم و عینوانی بەرەی هەڵگری ئایینە و، زاراوەی (المستكبر) و (المترف)یش، دروشمی بەری کوفر و دوژمنانی ئایینە، خوای دادگەر لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾) السبأ:٣٤.

(١) پێویستە بگوترێ، کە ئەو کاتەش کوردستان، بەشێکی لەژێر ڕکێفی ساسانییەکان و بەشەکەی دیکەشی لەژێر ڕکێفی بێزەنتییەکان بووە و گەلی کورد لەژێر دەستی ڕۆم و فارس دابووە و بەفیت و، فەرمانی ئەو دەوڵەتە زلهێز و چەوسێنەرە، شەڕیان لەگەڵ سوپای ئیسلامدا کردوە، نەك بە ویستی ئازادی خۆیان، بەرگرییشیان لە بەرژەوەندییەکانی ئەوان و کیانی ئەوان کردوە، نەك هی خۆیان.

www.alibapir.com



... مەسەلەی خۆ لەسەر گەل کردنە ڕابەر و پێشەواش، ئەگەر بە نیازی ڕوونکردنەوەی ئیسلامەوە بووبێ، ئەوە شتێك نیە پێویست بکات لەسەری ناڕازیی و تووڕە بین، بەڵکو دەبێ بڵێین: سوپاسیان دەکەین و خوا پاداشتیان بداتەوە، خۆ ئەگەر بە نیازی چەوساندنەوەشەوە بووبێ ئەوە، یەکەم: لە مسوڵمانە ڕەسەنەکانی سەرەتادا ڕووی نەداوە، وەك مێژوو هەواڵی پێداوین، دووەم: کە لە دوایی دا هاتۆتە دی، بە لادان و لاملیی لە ئیسلام دادەنرێ و، هیچ ماقووڵیش نیە ئیسلام بە شتێك تاوانبار بکرێ، کە پێی ڕازیی نیە و پێشگیریی لێکردوە.

ئەوە بە کورتی هەڵسەنگاندنی ڕەخنەی یەك بوو.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## وەڵامی ڕەخنەی دووەم :

سەبارەت بەوەی دووەمیشیان دەڵێین:

١- مسوڵمانەکانی پێشوو - کە زۆربەیان هاوەڵانی پێغەمبەر بوون - ئەو داب و دەستوور و عادات و نەریتانەی، کە بەنێو ئەو گەلانەدا بڵاویان دەکردنەوە، کە ئایینی ئیسلامیان قبووڵ دەکرد، نەبەمیرات لە باپیرانەوە بۆیان مابوونەوە، نە لەگیرفانی خۆشیان دەریان هێنابوون، بەڵکو ئەوان دوای ئەوەی ئیسلامیان وەرگرت، ئیسلامێك، کە سەرلەبەری ژیانیانی گۆڕی و، لە جڵێتاو و زەلکاوی نەفامیی دەریهێنان، ڕێ و شوێن و خوو و خدە و نەریتەکانی خۆشیان فڕێدا و واز لێهێنا.

بەڵێ، عارەبە مسوڵمانەکان، یاسا و دەستوور و ڕەوشت و خووی ئیسلامیان ڕادەگەیاند، نەك داب و دەستووری نەتەوایەتیی عارەبان، لەمەوە دەگەینە ئەم ئەنجامە، کە وەرگرتنی داب و دەستوور و ڕەوشت و خووی ئیسلامەتیی، دیاردەیەکی تاپۆکراو نیە لەسەر گەلی کورد، تاکو بەکێشان و پێوانەیەکی ڕەگەزپەرستانە لێك بدرێتەوە، بەڵکو دیاردەیەکە، هەموو گەلە مسوڵمانەکان تێیدا بەشدارن.

٢- سەبارەت بە بڵاوبوونەوە و پەرەستاندنی ئەدەب و زمان و کەلەپووری عارەبیش، لەنێو کورد و گەلانی دیکەشدا دەڵێین:

أ- شتێکی بەڵگەنەویستە، کە لە جیهاندا، هیچ زمانێك نیە توانیبیەتی سەر و سیماو بیچمی نەتەوایەتیی خۆی بپارێزێ و، هیچ جۆرە وشە و زاراوەیەکی بیانیی تێکەڵ نەبووبێ، ئەو تیرەو هۆزانە ناڵێم، کە لە ژیار(حضارة)ی مرۆڤایەتیی خۆیان دوورەپەرێز گرتوە و کەنارگیر بوون و، لە قاوغ و قەپێلکی خۆیاندا خۆیان ڕێك هێناوە.

www.alibapir.com



تێکەڵبوونی وشە و زاراوەی ئیسلامیش، لەگەڵ زمانی کوردیی و زمانی گەلانی دیکەشدا، شتێکی ئاسایی و سروشتییە و، هیچ پێویستی بەوە ناکات گومانی خراپ بەرین و، تەئویلی لاوەکیی و بێ ڕێ و جێی بۆ بێنینەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە: هیچ زمان بەوە پەکیان نەکەوتوە و گورگیان دەمەڕێ نەکەوتوە، کە وشە و زاراوەی بیانییان تێکەڵ بوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەم دیاردەیە هۆی دەوڵەمەند بوون و پنج گرتن و فراژوو بوونی زمانە، بۆ وێنە: ئایا زمانی کوردیی بەبەکارهێنانی وشەی: (تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، کۆمپیوتەر، ئۆتۆمبیل) پەکی کەوتوە و نەدار بووە، یان بە پێچەوانەوە؟!

**ب**- ئیسلامەتیی بەهیچ جۆرێك، دژایەتیی لەگەڵ زمان و ئەدەب و هونەر و کەلەپووری هیچ گەلێك دا نیە، چونکە لەڕوانگەی ئیسلامەوە، هەموو تیرە و گەلەکان یەکسانن و، هیچیان ئیمتیاز و زیادییان نیە بەسەر هیچیاندا.

پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ الحجرات:١٣.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردوە و، کردوومانن بە کۆمەڵە گەل و تیرەیەك، بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، بەڕێزترینتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، بێگومان خواش زانای شارەزایە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## وەڵامی ڕەخنەی سێیەم :

**لەبابەت خاڵی سێیەمیشەوە، خستنەڕووی چەند ڕاستییەك پێویستە:**

١- لاڕێ بوون و هەتڵەبوون (انحراف) لە بیروباوەڕدا، دیاردەیەکی تەرخانکراو نییە لەسەر ئایینی ئیسلام و، کاڵایەك نییە بەس بە باڵای وی بڕابێت، بەڵکو خوای میهرەبان لەوەتی دنیای داناوە و ئادەمی لەسەر ڕۆناوە، پەیتا پەیتا بەرنامە و پەیڕەوی ژیانی، بە پێغەمبەراندا (علیهم السلام) بۆ مرۆڤایەتیی ڕەوانە کردوون و ڕێنموونی کردوون، بەڵام شەیتان و تاغووتەکان، چاویان بەرینایی نەداوە، مرۆڤەکان وا بە بەختیاریی و ئاسوودەیی بیگوزەرێنن و، لە ژێر سێبەری درەختی سەر بەخێر و پڕ پیت و پێزی بەرنامەی خوادا، ژیانێکی ئینسانانە بەرنە سەر.

بۆیە بە هەموو شێوەیەك لێیان خەفتاون و، کوێرە ڕێی سەرلێشێوێن و ڕێچکەی دەستکردیان بۆ ڕانواندوون و، سڵسڵە و پلپڵەی سەرنج ڕاکێشیان پێخستوون و، ناوی زل زل و دروشمی قەبە قەبەیان بۆ داناون، تاکو سەرەنجام ژمارەیەکیان لێ لەخشتەبردوون و، تووشی دەردەسەرییان کردوون.

٢- هەرچەندە سۆفیایەتیی (التصوف)[(١)] لە بنەڕەت دا ڕیشە و بنەمایەکی ئیسلامیی هەیە و، کەس ناتوانێ بڵێ: ئیسلام لێی بەرییە، بەڵام وێڕای ئەمەش پێویستە چەند شتێك بزانرێن:

أ- سۆفیایەتیی، ئەگەر بەو چاوە سەیر بکرێت، کە بەرنامەیەکی سەربەخۆی سەرلەبەری ژیانە و، وەك ڕێچکەیەك لە ڕاست ئیسلامدا خۆی دەنوێنێ، ئەوە

---

(١) لە هەر کام لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) بەشی یەکەم و، کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون)دا، مەسەلەی تەریقەت و تەصەووف توێژراوەتەوە و، لێرە چاکتر و فراوانتر هەڵسەنگێنراوە، سەرنجیان بدە.

www.alibapir.com


ئەم جۆرە سۆفیایەتییە، کەم و زۆر، پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە، چونکە خوای بێهاوتا، بەس یەك جۆرە ئیسلامی ناردوە، نەك زیاتر!

ب- بەڵام ئەگەر سۆفیایەتیی وا سەیر بکرێ، کە بریتیە لە: پەروەردە کردن و پاککردنەوەی دڵ و دەروون و، مشت و ماڵ کردنی گیان و، دوورخستنەوەی ئینسان لە خەسڵەتە نالەبارە شەیتانییەکان، وەك: (نەزانیی، دڵ ڕەقیی، خۆ بە زل گریی، درۆزنیی، دەغەڵیی، ڕیابازیی، بێپەیمانیی، ڕژدی، تورەیی، ڕق و قین، ئێرەیی، خۆدەرخستن، تەنبەڵیی، دنیا دۆستیی، تەماعکاریی، ترسنۆکیی،...) و ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە جوان و پەسندەکانی وەك: (زانایی، دڵ ئارامیی، خۆ بەکەمگرتن، دڵپاکیی، بەرچاو فراوانیی، مەندیی، دنیا نەویستیی، ڕاست گۆیی، دڵسۆزیی، ئازایی، بەخشندەیی،...).

بە کورتیی: ئەگەر وا سەیری سۆفیایەتیی بکرێ، کە بریتیە لە: لایەنی خۆ سافکردنەوە و ئاکار پەسەندیی، ئەوە شتێکی ڕەسەنە و زۆر پەسەند و چاکە.

چونکە هەروەك چۆن زانیاریی شەرع (علم الفقه)، لە ئەنجامی وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی زانایانی ئیسلام، لە بابەت ئەو دەقانەوە پەیدا بووە، کە پەیوەندییان بە هەڵس و کەوتە ڕواڵەتییەکانی مرۆڤەوە هەیە، جا چ لەبواری تاکیداو، چ لە بواری کۆمەڵدا.

زانیاریی سۆفیایەتیی (علم التصوف)یش، بە هەمان پێودان: لە ئەنجامی توێژینەوە و قووڵ بوونەوەی زانایانەوە، لە بابەت ئەو ئایەت و فەرمایشتانەوە، کە پەیوەندییان بە لایەنی مەعنەویی و ئەخلاقیی و، خەسڵەتە شێرراوە و دەروونییەکانی مرۆڤەوە هەیە، سەری هەڵداوە.

ج- ئەو جۆرە سۆفیایەتییەی لە سەردەمی ئێمەدا هەیە، دووریی لە سۆفیایەتیی ڕاستەقینە، وەك دووریی مسوڵمانەتیی ئێمەیە، لە مسوڵمانەتیی ڕەسەن و ڕاستەقینە.

بەڵێ، سۆفیایەتییش وەك زۆربەی لایەنەکانی دیکەی ئیسلام، شاخ و باڵی زیاد و شتی ئەفسانەی زیادەی بیر و زەینی ئینسانی تێکەڵ بووە و، ئەو جوانیی و ڕەونەق و

www.alibapir.com


کاریگەرییەی پێشووی نەماوە و، لەنێو چوارچێوەیەکی تەسکی لە کەشکۆڵ و دەف و تەپڵ و شاڵ و تەسبێح و زەرگ و شیر و نرکەنرك و شیراندن و هەڵپەڕین و سەما.. دروست کراودا، کورت هەڵاتوە و تەنگی پێ هەڵچنراوە و، کە جاران مایەی هاتنەخوارەوەی بەزەیی و پیت و پێزی خوا و، خاوێنکردنەوەی دەروون و زیندووکردنەوەی دڵان و، هۆشیارکردنەوەی بیر و هۆش وشیرین کردنی ئیسلامەتیی بوو لە لای خەڵکی، ئێستا مەگەر چۆن، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە، مایەی دابارینی تووڕەیی خوا و، مراندن و هەڵگێڕانەوەی دڵان و بەنج کردن و، کوێرکردنەوەی بیرو هۆش و، تاڵ کردنی ئیسلامەتییە و، بۆتە چاکترین هۆ و ئامرازی خۆ پێژیاندن و خەڵك فریودان، سەربارەی هەموو شتانیش، ناحەز و دوژمنانی ئیسلام، لە جەنگەڵی ئەو سۆفیایەتییە بێ سەرەوبەرەدا، بیانووی پلار و توانجی چاکیان دەست دەکەوێ، کە بە ناهەق بیگرنە ئیسلامی تێر و تەواو و بێلەکە.

٣- سۆفیایەتیی، وەك هەر لایەنێکی دیکەی ئیسلام، ئەگەر بەڕێك و پێکیی بەڕێوە ببرێ و، وەك لایەنێك لە ئیسلام دابنرێ، کە لایەنی تەزکیە و ئەخلاقە و، شتی بێ ڕێ و جێ و سەیر و سەمەرەی ڕەگەڵ نەخرێ و، بە ڕێچکە و شێوازێکی سەربەخۆ و تایبەتیی دانەنرێ، زۆر کاریگەر و سوودبەخش دەبێ و لەدڵی هەموو مسوڵمانێکی تێگەیشتووشدا جێی خۆی دەگرێ و، نەك هەر نابێتە گیاکەڵە و، چەکی دەستی زۆرداران و گەلی پێ فریو نادرێ، بەڵکو دەبێتە هۆی چەسپاندنی خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر و، بڵاوکردنەوەی تەبایی و برایەتیی و ڕەوشت بەرزیی و، هەڵبژاردنی دوارۆژ بەسەر دنیادا و، ڕازیی نەبوون بەژێردەستەیی و مل نەدان بۆ کۆیلەیی و زەبوونی..

ئنجا هیچ کەسیش نکوولّیی لەوە نییە، کە زۆرجاران کەسانێکی دین فرۆش، لە بەرگی شێخایەتیی و مەلایەتییدا بوونەتە چەکی دەستی زۆردار و ملهوڕان، بەهۆی چاوبەست کردنی خەڵکی و بە سەهوو بردنیانەوە!

بەڵێ برادەران! ئێمەش زۆرچاك دەزانین، مێژووش بەخەتی درشت نووسیویەتی، کە چەندان جار شێخ و مەلای بەناو پێشەوای ئایینی ئەو تۆ هەبوون، کە

www.alibapir.com



لەپێناوی پارووی چەور و، جێگای خۆش و گەرم و نەرم و، بەرژەوەندیی شەخسیی و بنەماڵەیی خۆیاندا، فتوای هەڵە و ناتەواویان بۆ دەسەڵاتدارە زۆردارەکان داوە و، قسە و هەڵوێست و، ڕەفتارە ناشەرعییەکانیان بە هۆی تەحریف و تەئویل و تەئویلکاریی و، قیلە شەرعیی سەیر و سەمەرە، بۆ خستوونەتە قاڵبی شەرعەوە!

بەناوی ئایینەوە، گەلێك قسە و پەندی خراپیان لەگوێی خەڵکی چکاندوە، بۆ زەبوونی قبووڵکردنی خەڵك و، بڵاوبوونەوەی گیانی ترسنۆکیی و مراندنی دەماری مەردایەتیی و عیززەتیان، بۆ وێنە:

١- (سەرۆك و پادشای وڵات، هەرچەندە زۆرداریش بێ، فەرمانبەری هەر فەڕزە)!
٢- (نانی کێت خوارد، سەڵەواتی لە دیداری لێ بدە)!
٣- (دەستەڵاتدار، خوای سەر عەرزێیە)!

خەڵکی عەوامیش، کە ئەم جۆرە هەڵوێستانەیان لەو جۆرە بەناو ڕابەر و پێشەوایانە دیون و، ئەم جۆرە قسە و پەندانەیان لێ بیستوون، ئەوانیش چەند قسە و پەندێکی هەڵەی دیکەیان لەو بارەوە داڕشتوە و، قوڕەکە خەستتر بووە، بۆ وێنە:

١- (ئەو دەستەی نەتوانم بیبڕم، ماچی دەکەم).
٢- (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە).
٣- (هەرکەسە دەست بە کڵاوی خۆی بگرێت با نەیبات).

**بەڵێ برادەران!**

ئەم جۆرە قسەو هەڵوێستە نائیسلامییە بەزیوانە، لە کەسانێکی بەرواڵەت زانا و بەناو پێشەوای ئاییندا بیستراون و بینراون، ئێستاش دەبیسترێن و دەبینرێن، بەڵام:

**یەك:** ئایا ئیسلام بەو جۆرە هەڵوێست و ڕەفتارانە ڕازییە؟!

www.alibapir.com



ئایا کاکڵی ئیسلام، بریتی نییە لە خوا بەیەکگرتن (التوحید)، جگە لە خوا هیچ کەسی دیکە بەپەرستراو دانەنان (لا الە الا اللە)؟!

ئایا پێغەمبەری پێشەوا نەیفەرمووە: ((أفضل الجهاد کلمة عَدْلٍ عند سلطان جائر)) رواه النسائي: ٤٣٤٤ وابن ماجە: ٤٠١١، واتە: چاکترین جۆری جیهاد گوتنی قسەیەکی هەقە لەلای دەستەڵاتداری زۆردار؟!

ئایا نەیفەرموە: ((سیکون أمرا و فَسَقَةٌ جَوَرَةٌ، فمن صدَّقهم بِکَذِبهم، وأعانهم علی ظلمهم، فلیس مِنّي ولست منه، ولا یَرِدُ علی الحوض)). رواه النسائي والترمذي وأحمد. واتە: لە داهاتوودا چەند کاربەدەستێکی تاوانبار و ستەمکار دێنە سەرکار، جا هەر کەسێك شایەتیی بۆ درۆیەکانیان بدا و، ئۆباڵیان بۆ بکێشێ و، لەسەر ستەم و زۆریان یاریدەیان بدات، نە لە منە و نە من لەویم و، نە دەچێتە سەر گۆلاو - ی کەوسەر - یش!

**دوو:** ئایا ئیسلام، بێجگە لەو جۆرە بەناو پێشەوا و دنیادۆست و هەلپەرست و ترسنۆکانە، کەسی دیکە شك نابات؟!!

ئایا مێژوو، هەروەك چۆن هەڵوێستی نامسوڵمانانە و بەزیوانەی ئەوانەی تۆمار کردوە، هەڵوێستی مسوڵمانانە و مەردانەی زۆر لە پێشەوا و ڕابەرانی ڕاستەقینەی ئیسلامیشی تۆمار نەکردوە؟!! کە ئێستا بۆ نموونە بڕێکیان لێ دەخەینە ڕوو:

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## هەڵوێستی مەردانەی

## هەندێك لە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام

### ١- أبو مسلم الخولاني:

جارێکیان لەڕۆژی جومعەدا، لەکاتێکدا (معاوية) - کە فەرمانڕەوای دەوڵەتی ئیسلامیی بوو - وتاری دەخوێندەوە، (ئەبو موسلیم) هەستایەوە سەرپێ و پێی گوت: ئەی موعاویە! نە گوێت لێدەگرین و نە فەرمانبەرییت دەکەین.

موعاویە گوتی: بۆچی؟!

گوتی: لەبەرچی مووچە(معاش) لە خەڵکی دەگریەوە، خۆ نەهی خۆتە و نەهی دایك و بابتە؟!!

### ٢- شێخ عبدالقادر الگیلاني:

ڕۆژێکی، شێخ عەبدولقادری گەیلانیی (خوا لێی خۆش بێ)، چۆ سەر دوانگە (منبر) و سەرزەنشتی خەلیفەی ئەو سەردەمە (المقتفي بالله)ی کرد، لەسەر ئەوەی، کە (ابن مزاحم)ی زۆرداری کردبوو بە والی و، پێی گوت: یەکێکت لەسەر مسوڵمانان کردۆتە گەورە، لەهەموو زۆرداران زۆردارترە، بەیانی وەڵامت چی دەبێ لەلای خوای بەرز و بێهاوەڵ؟!

دوای ئەوەش خەلیفە، والی ناوبراوی لابرد!

www.alibapir.com



### ٣- العز بن عبدالسلام:

ئەم زانا لەخواترسە شۆڕشگێڕە، لە ساڵی (٦٣٨)ی کۆچییدا، لەکاتێکدا (ملك اسماعیل) لە (نجم الدین بن أیوب) حاکمی میسر ترسا و، لەگەڵ خاچ پەرستەکان ڕێك کەوت و کاکە و برالەی کردو، قەڵای (صفد) و دەوروبەرەکەی و قەڵای (الشقیف) و نیوەی (صیدا و طبریة و جیل عامل)ی[1] دانیَ، کە چەند شوێنێکی زۆر ستراتیژی بوون، تاکو ئەوانیش لەبری ئەوە، دژی (نجم الدین بن ایوب) کۆمەکیی بکەن.

لەو کاتەدا (العز بن عبدالسلام)، هەر بەوەندە وازی نەهێنا، کە دژی ئەو ڕەفتارە خۆ فرۆشانەیەی (ملك إسماعیل) فتوا بدا و بە شتێکی نائیسلامییانەی لەقەڵەم دا، بەڵکو لە وتاری ڕۆژی جومعەشدا سەرزەنشتی کرد و، مۆری خیانەت و ناپاکی پێوەنا و دەریخست، کە چەند کارێکی ناڕەوایە و مەترسیی هەیە بۆ سەر ئۆممەتی ئیسلامیی.

### ٤- أحمد بن تیمیة الحرَّاني:[2]

کاتێك لە کۆتایی ساڵی (٦٩٨)ی کۆچییدا، هەواڵی هێرشی (غازان)ی تەتەریی لە ئێرانەوە بەرەو (حەڵەب) گەیشت و، لە (٢٧ی ربیع الأول ٦٩٩ك)دا جەنگێکی گەرم لەنێوان سوپای (غازان) و سوپای (ناصر)دا - کە والی دیمەشق بو - ڕوویدا، لە ئاکامدا (ناصر) تێك شکا و بە دیمەشقیشەوە نەگیرایەوە و، بەدوای ئەویشدا، میر و کاربەدەستە زلەزلەکانی ناوچەکە، چوون بۆ میسر، لەو

---

(١) کە چەند ناوچەیەکن لە وڵاتی شام.

(٢) جێی داخە، کە لەلایەن بەشێك لە مەلا و شێخانی کوردستانەوە، بەبێ هۆ و بە نەزانانە هێرشی ناڕەوا دەکرێتە سەر (ابن تیمیة) و، خەڵکێکی زۆر لە بەرهەم و کەلەپووری ڕەسەنی ئەو کەڵە زانایە بێبەش بووە!!

www.alibapir.com



کاتە ناسك و دژوارەدا، (ابن تيمية) لەگەڵ خەڵکەکەدا وەك قەڵایەکی پۆڵایین ڕاوەستا و، لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوون بۆ بینینی (غازان) و وتووێژێکی توند و تیژ لەنێوان غازان و (ابن تيمية)دا ڕوویدا، لەو وتووێژەدا (ابن تيمية) بە غازانی گوت:

((پێت وایە مسوڵمان و قازیی و شێخ و بانگ بێژت لەگەڵ دانە و، کەچی هاتوویە سەرمان، وڵاتمان داگیر دەکەی؟! باب و باپیرانت لەگەڵ ئەوەشدا، کە کافر بوون، دوای پەیمان بەستن، وڵاتیان داگیر نەدەکرد، بەڵام تۆ پەیمانت شکاند و، قسەت کرد، کەچی درۆت کرد و نەتبردە سەرێ)).

ئنجا، کە کاتی نان خواردن هات، غازان داوای لێکردن، کە نان بخۆن، هەموویان خواردیان، جگە لە(ابن تيمية)، ئنجا کاتێك لێیان پرسی: بۆچی ناخۆی؟!

گوتی: ((چۆن خواردنێك بخۆم، کە هەمووی مەڕ و ماڵاتی خەڵکی هەژارە تاڵان کراوە و، بە ئاگری دارێك کوڵاندوویانە، کە بەزۆر لە خەڵکیان ستاندوە!!

غازانیش بۆ هەموو ئەو قسانە گوێی ڕاگرتبوو و چاوی بڕیبۆ (ابن تيمية) و ڕووی لێ وەرنەدەگێڕا.

ئنجا غازان پرسی: ئەم زاتە کێیە؟! کەسم ئاوا نەدیوە هێندە بە جەرگ و هێندە قسەکاریگەر لەدڵاندا، بۆ هیچ کەس هێندە گەردن کەچییم نەنواندوە؟!

کاتێك هەواڵیان پێدا کێیە و چییە و چۆنە، داوایکرد، کە بۆی بپاڕێتەوە، ئەویش بەم جۆرە دەستیکرد بە پاڕانەوە:

خوایەگیان! ئەگەر ئەم بەندەیەت - واتە غازان - بۆیە دەجەنگێ، تا بەرنامەی تۆ و ئاڵای تۆ بەرز بکاتەوە و، خەڵك تەنها پابەندی ئایینی تۆ بن، خوایە! سەری بخەی و بیکەی بە خاوەن دەسەڵات، بەڵام ئەگەر بۆ خۆدەرخستن و ڕیاکاریی و دنیاپەرستیی و بەرزکردنەوەی ناوی خۆی و ژێر دەستکردنی ئیسلام و شوێنکەوتوانی دەجەنگێ، خوایە بیگری و تێکی بشکێنی و دوابڕاوی بکەی!!

غازانیش بۆ دوعایەکان دەیگوت: ئامین، هەردوو دەستیشی بەرز کردبوونەوە.

www.alibapir.com



ئنجا کاتێك چوونە دەرێ، (قاضي القضاة)، کە واپێدەچێ یەکێك بووبێ لە مەلا دین فرۆشەکانی ئەو سەردەمە، بە (ابن تيمية)ی گوت: خەریك بوو سەرمان بە فەتارەت بدەی! بەخوا ئێمە چیدی هاورێیەتییت ناکەین.

(ابن تيمية)ش گوتی: بەخوا منیش حەز بە هاورێیەتییتان ناکەم.

بەم جۆرە (قاضي القضاة) لەگەڵ پێرەکەیدا رۆیشتن و، (ابن تيمية) و برێك لە برادەرانیشی مانەوە، دوایی کە میر و پیاوە قسەرۆیشتووەکانی غازان، هەواڵی (ابن تيمية)یان بیست، هاتنە لای و داوای دوعای خێریان لێکرد و، (٣٠٠) سواریان لەگەڵ رەوانە کرد بۆ دیمەشق، بەڵام پێری (قاضي القضاة)، کۆمەڵێك لە تەتەرەکان رێیان پێگرتن و، رووتیان کردن و هیچیان پێ نەهێشتن!!

### ٥- حُطيط الزيات:

(حُطيط)یش یەکێکە لەو گەنجە خواناس و زانا شۆرشگێرانەی، کە بەهەڵوێستی مەردانەیان رووی ئیسلامییان درەوشاوەتر کردوە و، بەردێکی گەورەیان خستۆتە زاری ئەو بەناو زانایانەی، کە بە بڕوبیانووی بێجێ ویستوویانە و دەیانەوێ: پاکانەی هەڵوێستی ترسنۆکانە و نامەردانەیان بکەن، لە ئاقار هەرەشە و گورەشەی زۆردار و ملهوران و لارێبوان دا.

ئەم زانا خواناسەیان بردە لای (حجاج)ی خوێن رێژ، کاتێك گەیشتە لای لێی پرسی: تۆی (حُطيط)؟!

گوتی: بەڵێ.

ئنجا (حُطيط) پێی گوت: هەرچی دەتەوێ بپرسە، پەیمانم لەگەڵ خوادا لەنزیك (مقام)[1] لەسەر سێ شتان بەستوە:

---

(١) واتە: (مقام)ی ئیبراهیم (علیه اسلام)، کە لە تەنیشت کەعبەی پیرۆزە.

www.alibapir.com



١- ئەگەر پرسیارم لێ بکرێ، ڕاستیی بڵێم.

٢- ئەگەر سزا بدرێم ئارام بگرم.

٣- ئەگەر وازم لێ بهێنرێ، سوپاسی خوا بکەم.

(حجاج) پێی گوت: لەبارەی منەوە چی دەڵێی؟

گوتی: دەڵێم: یەکێکی لە دوژمنانی خوا لەسەر زەوی، کاری ناڕەوا دەکەی و بە ناهەق خوێن دەڕێژی.

(حجاج) گوتی: ئەدی سەبارەت بە (أمیر المؤمنین: عبدالملك بن مروان) چی دەڵێی؟!

گوتی: دەڵێم: ئەو تاوانی زۆر لەتۆ زلترە و، تۆ یەکێکی لە تاوانەکانی ئەو.

ئنجا (حجاج) فەرمانیدا سزای بدەن، پاش ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر بە قامیشی تیژکراو، هەموو لەشیان کون کون و بریندار کرد، بەڵام گوێیان لە دەنگی ئاخ و ئۆفێکی نەبوو، ئنجا لە دەمی گیان دەرچوونیدا، (حجاج) گوتی: فڕێی بدەنە نێو بازاڕ - بۆ چاوترسێنکردنی خەڵکی، وەك عادەتی هەمیشەیی زۆردار و فیرعەون سیفەتەکان -.

(جعفر) کە ڕاوی ئەم بەسەرهاتەیە، دەڵێت: کاتی خۆی (حُطیط) برادەرم بوو، بۆیە چوومە لای و پێم گوت: هیچت ناوێ؟!

گوتی: قومە ئاوێك! ئنجا دوای گەروو تەڕکردن، گیانی پاکی سپارد و لەتەمەنی (١٨)ساڵییدا شەهید بوو!![(١)]

---

(١) بەڵام بەداخەوە کە بەناو زانا و بەرواڵەت پێشەوای وا هەن، کە لە تەمەنی (٨٠)ساڵییشدا ناوێرن چوار قسەی وا بکەن، کە یەکێك هەر لێشیان تووڕە بێت، نەوەك شەهادەت بفەرموون، بێئاگا لەوەی، کە شەهیدیی بەهەموو کەس ڕەوا نابینرێ!

www.alibapir.com



**٦- أبو حـازم :**

(سليمان بن عبدالملك)، كه یەكێك بووە لە بەناو خەلیفەكانی ئیسلام، ڕۆیشتە شاری مەدینە و، بەدوای زاناترین كەسی مەدینەی دا نارد، كە (أبو حازم) بوو، بەڵام (أبو حازم) نەچوو و گوتی: من هیچكارم بەو نیە، ئەگەر ئەویش كاری بەمن هەیە، دەتوانێ بێت، ناچار (سليمان) چوو بۆ لای.

سلێمان لە (أبو حازم)ی پرسی: ئەرێ بۆچی هێندە لە مردن بێزارین؟!

گوتی: چونكە خانووی قیامەتتان كاول كردوە و، هی دنیایەتان ئاوەدان كردۆتەوە، بۆیە پێتان ناخۆشە لە ئاوەدانییەوە بگوازنەوە بۆ وێرانە.

ئنجا پرسی: ئەرێ (أبو حازم) چۆن دەچینە خزمەت خوا؟!

گوتی: مرۆڤی چاك وەك یەكێكە، كە لە سەفەرێ گەڕابێتەوە نێو ماڵ و خێزانی، هی خراپیش وەك كۆیلەی هەڵاتو لە دەست گەورەكەی.

سلێمان گریا و گوتی: خۆزگە دەمزانی لەلای خوا چیم بۆ دانراوە!!

گوتی: خۆت لەبەر كتێبی خوا ڕانوێنە، كە دەڵێت:

﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ ﴾ الإنفطار: ١٣-١٤

واتە: چاكەكاران لەنێو نازو نیعمەت دان و، بەدكارانیش لە دۆزەخێدان.

سلێمان گوتی: ئەدی بەزەیی خوا لەكوێیە؟!

(أبو حازم) گوتی: ((قريب من المحسنين)) لە چاكەكارانەوە نێزیكە.

سلێمان گوتی: ئەرێ كام بەندەی خوا لە هەموان بەڕێزترە؟!

گوتی: ئەوانەی پارێزكار و چاكن.

www.alibapir.com


سلێمان گوتی: ئەدی چ کردەوەیەك چاکترە؟!

گوتی: بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا، لەگەڵ دوورەپەرێزیی لە شتە قەدەغەکراوەکان.

سلێمان گوتی: چ قسەیەك چاکترە؟!

گوتی: قسەی ڕاست لەلای یەکێك جێی مەترسی، یان جێی ئومێد و تەماع بێ.

سلێمان گوتی: چ مسوڵمانێك زۆری زیان کردوە؟

گوتی: کەسێك خۆی تووشی تاوان بکات، لەپێناوی بابایەکی زۆرداردا، ئەو کەسە دواڕۆژی خۆی بەدنیای خەڵکی فرۆشتوە.

سلێمان گوتی: سەبارەت بە ئێمە چی دەڵێی؟!

گوتی: وازم لێ دێنی نەیڵێم؟!

گوتی: نەخێر، هەردەبێ بیڵێی، ئامۆژگارییە بۆ من.

(أبو حازم) گوتی: باب و باپیرانت بە شمشێر ملیان بە خەڵکی کەچ کرد و، ئەو پلەوپایەیان بە کوتەك ستاند، بێئەوەی ڕاوێژ بە مسوڵمانان بکەن و ڕازی بن، تاکو خەڵکێکی زۆریان لێکوشتن، ئێستاش مردوون، بەڵام بریا هەستت کردبایە بەوەی، کە لەولا پێیان گوتراوە و گوتوویانە.

یەکێك لە دانیشتووان - کە یەکێك بووە لە بەناو زانا ترسنۆك و بەزیوەکان - گوتی: قسەیەکی خراپت کرد.

(أبو حازم) گوتی: خوای گەورە بەڵێن و پەیمانی لە زانایان وەرگرتوە [لیبیننه للناس ولا یکتمونه..] ئایین و بەرنامەی خوا بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە و نەیشارنەوە.[1]

---

(١) ئەم شەش بەسەرهاتەم وەك چەند نموونەیەك لەکتێبی (الإسلام بين العلما و والحكام)ی عبدالعزیز بدری وەرگرتن، کە لەشاری بەغداد، لەشەستەکادا، بەدەستی بەعسییەکان شەهید کرا.

www.alibapir.com



**٧- (بديع الزمان) سەعیدی نورسیی:**

سەعیدی نورسیی، کە زانایەکی شۆڕشگێڕ و مسوڵمان بووە و، خەڵکی کوردستانی تورکیایە، لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە سوپای دەوڵەتی عوسمانییدا، ئەفسەر (ضابط) بوو و، خۆی و دەستەیەك لە قوتابییەکانی، دژی ڕووسیای داگیرکەر جیهادیان دەکرد، لەگەڵ ژمارەیەك لە جەنگاوەرانی سوپای عوسمانییدا، بەدیل گیرا.

لەکاتێکدا سەعید لەگەڵ هەندێك لە دیلەکان لە گرتووخانەیەك دا دانیشتبوو، سەرکردەی سوپای ڕووسیا لێیان چووەژوور و، هەموویان لەبەری هەستان و ڕێزیان لێگرت، جگە لە سەعید!

سەرکردەکە بەو دیمەنە ناڕازیی بوو، بۆیە لە سەعیدی پرسی: بۆچی لەبەرم هەڵناستی؟

وا دیارە نامناسی؟!

سەعید گوتی: با، چاکت دەناسم، مەگەر تۆ سەرکردەی سوپای ڕووسیا نی؟

گوتی: با، کەواتە بەچاوی سوك سەیری دەوڵەتی ڕووسیا دەکەی؟

سەعید گوتی: مەسەلە ئەوە نیە، بەڵام من مسوڵمانم و بۆ غەیری خوا گەردن کەچ ناکەم!

سەرکردەکە توڕە بوو و گوتی: سبەینێ پێویستە تۆ لەسێدارە بدرێی.

بەیانی، کە سەعید بۆ لەسێدارەدان بانگ کرا، سەرکردەکە لێی پرسی: تۆ چی؟!

سەعید گوتی: من مسوڵمانم و بیروباوەڕم ئیسلامە.

سەرکردەکە، کە سەعیدی ئەوەندە بە مەردی هاتە بەرچاو، لە بڕیاری لەسێدارەدانی پەشیمان بۆوە و گوتی: ئایینێك، کە توانیویەتی ئینسانی وەك تۆ پێبگەیەنێ، شایانی ڕێزگرتنە!![1]

---

(١) ئەم بەسەرهاتەی سەعیدی نورسیم، لە کتێبی (من الفكر والقلب)ی محمد سعيد رمضان

www.alibapir.com



بەڵێ، برادەرینە! مێژووی ئیسلامیی، لەپاڵ هەڵوێستی دزێو و ناقۆڵای بەناو زانا و بەڕواڵەت پێشەوای بەزیو و ترسنۆك و دین فرۆشدا، هەڵوێستی ئەو کەڵە زانا چاونەترس و دلێرانەشی تۆمار کردوە و، هیچ کەس بۆی نییە ڕەفتاری ترسنۆکانەی هەندێك بەناو زانا - کە بەهیچ جۆرێك ئیسلام بە ڕابەر و پێشەوایان قبووڵ ناکات - بکاتە بەڵگەیەکی گشتیی و، هیچ لە ڕاستییەکان نەبینێ.[1]

پوختەی قسان ئەوەیە، کە پابەندبوون بە ئیسلامەوە، ماکی نەخۆشیی و دەردەکانی ئێمە نییە، بەڵکو خراپ حاڵی بوون و پابەند نەبوون بە ئیسلامەوە، بەم دەردەی بردووین و تووشی ئەم ڕۆژەی کردووین!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

البوطي، دا خوێندۆتەوە.

(١) بەڵێ، بەهیچ جۆرێك ئیسلام کەسانێك بە ڕابەر و پێشەوا قبووڵ ناکات، کە یان لە ترسان، یان لە برسان، یاسا و دەستوورەکانی خوا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )یان دەشێرنەوە، یان خوارو خێچ دەکەن، چونکە میراتگری پێغەمبەر، پێویستە لەخواترسان و ئازایەتیی و ڕاستیی تێدا بن، نەك لە خەڵك ترسان و ترسنۆکیی و خواریی، بەڵێ، ئەوانەی خۆیان بە قوتابی و میراتگری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەزانن، پێویستە بزانن، کە پێشەوایەکەیان خواناسیی و ئازایەتیی و ڕاستیی لەدوای خۆی بەمیرات بەجێهێشتوە، نەك فیرعەون پەرستیی و ترسنۆکیی و بێ باریی!!

www.alibapir.com



## وەڵامی ڕەخنەی چوارەم و مەسەلەی مەلای خەتێ:

**سەبارەت بە خاڵی چوارەمیش، یان ئێوە گوتەنی: پێلاقەی چوارەم! دەڵێین:**

١- کەس نکووڵیی لەوە نییە، کە بەناوی ئایینەوە و لە بەرگی ڕابەر و پێشەوای ئایینییدا، ساختەیی و خیانەت کراوە و دەکرێ، بەڵام بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ ئەوە ببێتە هۆی، قین هەڵگرتن لە ئیسلامی پاك و بێگەرد، چونکە:

أ- هەروەك زۆرجاری دیکە گوتوومانە: ناتەواویی و هەڵەی شوێنکەوتووی هیچ ڕێبازێك، ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی ناتەواویی ئەو ڕێبازە.

ب- وەك لە خاڵی سێیەمدا گوتمان: هەروەك چۆن بەناو زانای ناپاك و دین فرۆشمان، هەبوون و هەن و دەبن، زانا و پێشەوای واشمان هەبوون و هەشن، کە جێی شانازیی، نەك هەر ئێمە، بەڵکو جیهانن، کەواتە: ئەگەر تۆ بابایەکی وەك مەلای خەتێ، یان شێخی (.....) بە وێنە دێنیەوە، نابێ بێویژدانیی وات لێ بکات، سەعیدی نورسی و سەلاحەددینی ئەییوبیشت لەیاد بچێ.

٢- سەبارەت بە هەڵوێستی (مەلای خەتێ)ش لە سەردەمی میر موحەممەد ڕەواندزییدا، کە زۆر کەس کردوویانە بە بنێشتە خۆشکەی سەر زاریان و، پێیان وایە: پتەوترین بەڵگەی زیانبەخش بوونی ئیسلامە بۆ گەلی کورد، دەڵێین:

بەر لە هەموو شتێك، با سەرنجی مێژوو بدەین! تاکو بزانین لەو بارەوە، چی دەڵێ و چۆن چۆنی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە؟

(محمد أمين زكي بگ) لە کتێبی (کورد و کوردستان)دا دەڵێت:

((ئەم میرە گەورەیە زۆر دیندار بووە و، هیچ ئیشێکی بەبێ فتوای زانایانی شەرع نەکردوە و، بەپێی قورئانی گەورە و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەفتاری کردوە، خەڵکی لە سەردەمی ویدا لە هێمنییدا ژیاون.

www.alibapir.com



محمد پاشا، دوای ئەوەی سنووری حوكمڕانییەتەكەی خۆی فراوان كرد، تا لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە كۆیە و ڕانیە و، لە باكورەوە گەیشتە ئامێدیی و زاخۆ و هەموو بادینانی گرتەوە و، لە ڕۆژئاواوە، تا دەوروبەری موصڵ و سنجار چوو.

بەڵام دەوڵەتی عوسمانیی چاوی بەرینایی نەدا و، (مصطفی رشید پاشا)ی نارده سەری و، والی موصڵیشی ئاگادارکردن بۆ كۆمەكیی.

لەشكری (مصطفی رشید) بە جەزیرە و زاخۆدا، گەیشتە موصڵ و لەوێوە ڕوویكردە ڕەواندزێ و، لەشكری بەغداشی پێگەیشت و لە دەشتی حەریر هەڵیاندا.

(محمد پاشا) گەلی عەلی بەگی گرتبوو، (مصطفی رشید پاشا) نامەی بۆ (محمد پاشا) نووسی و بەڵێنی پێدا: ئەگەر خۆی تەسلیم بكات لێی دەبووری و دەینێرێتەوە شوێنی خۆی.

لەسەر ئەوە (میر محمد) نەیویست خوێن لەنێواندا بڕژێ و لەسەر وەعد و پەیمانی (مصطفی رشید پاشا) خۆی تەسلیم كرد، ئنجا ئەویش ناردیە ئەستەمبووڵ و، لەوێ داوای لێخۆش بوون و گەڕانەوەی بۆ كرد، بەڵام لەكاتی گەڕانەوەی (میر محمد)دا، (مصطفی رشید) مرد و (علي رضا پاشا)، كە دوژمنی (مصطفی رشید) و (محمد پاشا) بوو، دەستبەجێ بۆ ئەستەمبووڵی نووسی، كە ئەگەر (محمد پاشا) بگەڕێتەوە بۆ ڕەواندزێ، هەڵسوڕانی كاروبار وەزەحمەت دەكەوێ.

لەسەر ئەوە ئەستەمبووڵ، یەكسەر تەتەرێكی لەگەڵ فەرمانی كوشتنی (محمد پاشا)دا نارد و، لە (سیواس) لەلایەن والی سیواسەوە لەسێدارە درا، ئنجا (محمد پاشا)، بەرەبەرە موڵكەكەی كەوتە دەست تورك و، حوكمڕانییەكەی تێكچوو)).

ئنجا (محمد أمین زكي) لە پەراوێزی كتێبی ناوبراودا نووسیویەتی:

((بەپێی ڕیوایەتێكی دیكە، ڕۆژی جومعە دواندەر(خطیب)ی ڕەواندزێ، باسی بێشەرعی جەنگەكەی كردوە و لەشكرەكەی سارد كردۆتەوە و، محمد پاشاش بە ناچاری تەسلیم بووە، ئەو مەلایەش بە (خطي أفندي) بەناوبانگە))[1].

---

(١) بڕوانە: خولاصەی تەئریخی كوردستان، بەرگی چوارەم، بەشی دووەم، لاپەڕە ٢٨٢ و ٢٨٣، ساڵی: ٢٠٠٦ز، ئامادەكردنی ڕەفیق صاڵح، سلێمانی بنكەی ژین.

www.alibapir.com



ئەمە بە کورتی چۆنیەتی ڕوودانی ئەو کارەساتە بوو، کە هەندێك کەسی بێئاگا، ئیسلامی پێ تاوانبار دەکەن!

ئێستاش با ئەو کارەساتە هەڵسەنگێنین و لە مەحەکی ژیریی و ویژدانی بدەین، تاکو بزانین هیچ شتێك لەو کارەساتەدا دەبینرێ، کە بگونجێ بکرێتە بەڵگەی زیانبەخش بوونی ئیسلام بۆ کورد!!

ئەگەر ئەوەی (أمين زکي) لە دەقی کتێبەکەیدا نووسیویەتی لەبەرچاو بگرین - پێویستە هەر ئەویش لەبەرچاو بگیرێ بە بەڵگەی ئەوەی کە (أمين زکي بەگ) بۆ خۆیشی خستوویەتە دەقی کتێبەکەیەوە و، وەك ڕیوایەتەکەی دیکە نەیخستۆتە پەراوێز - ئەوە گومانی تێدا نیە، کە ئەو ڕووداوە، هیچی تێدا نیە، ئیسلامی پێ تاوانبار بکرێ.

بەڵام ئەگەر ئەو ریوایەتە وەربگیرێ، کە (أمين زکي بگ) لە پەراوێزدا نووسیویەتی - بێگومان بۆیەش لە پەراوێزدا نووسیویەتی، چونکە زۆر جێی بڕوا و متمانەی نەبووە - ئەوە ئێمە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەم تێبینیانە لەو بارەوە دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** ئیسلام بە یەك چاو سەیری هەموو تیرە و گەلەکان دەکات و، ئیمتیاز بەهیچیان نادات، لەم بارەشەوە دەقی ئیسلامیی زۆرن، بۆ وێنە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((الناس بنو آدم وآدم خُلق من تراب..)) رواه الترمذي وأبوداود ورواه أحمد والبيهقي نحوه. واتە: خەڵك وەچەی ئادەمن و، ئادەمیش لە گڵ دروست کراوە..

هەروەها فەرموویەتی: ((...ليس لأحد على أحد فضل إلا بدين أو تقوى أو عمل صالح..)) رواه احمد والبيهقي. واتە: هیچ کەس لەهیچ کەس چاکتر نییە، مەگەر بە دینداریی، یان پارێزکاریی، یان کردەوەی چاك.

دیسان (أبوذر الغفاري) (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆمان دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووە: ((أُنظر! فإنّك لست بخير من

www.alibapir.com



أحمر ولا أسود إلا أن تفضله بتقوى لله)) رواه أحمد. واتە: تەماشابکە! تۆ نە لە سوور نە لەڕەش چاکتر نی، مەگەر بەهۆی پارێز لەخوا کردنەوە چاکتر بی!

مادام وابێ، بۆ هیچ گەل و نەتەوەیەك نییە - بە هەر ناوێکەوە بێ - ستەم و زۆر لە نەتەوەیەکی دی بکات و، نیشتمانی داگیر و مافەکانی زەوت بکات، و هیچ نەتەوەیەك بۆی نییە بەبێ ڕەزامەندیی نەتەوەکان، پێ لە سنووری نیشتمانیان بەرێتە ئەودیو، مادام هەموویان مسوڵمان، یان ملکەچی حوکمی ئیسلامیی بن.

کەواتە: هەڵوێستی سوڵتانی عوسمانیی، کە بریتی بووە لە تەماع تێکردنی خاك و ئاوی کوردان، هەڵوێستێکە لەگەڵ ئیسلامدا ناسازێ.

**دووەم:** لە ڕوانگەی ئیسلامەوە کاربەدەست و دەسەڵاتدار تەنها کاتێك فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆکرانی پێویست دەبێ لەلایەن گەلەوە، کە بەشێواز و چۆنیەتییەکی ئیسلامییانە، ئەو پلەوپایەیەی وەرگرتبێ - واتە لەسەر بنچینەی ڕاوێژ و پرس کردن بە خەڵك.[1]

هەروەها بەگوێرەی شەریعەت و یاساکانی خوا ڕەفتار بکات، چونکە: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة: ٤٤.

واتە: هەرکەس بەپێی ئەو بەرنامە و دەستوورە ڕەفتار نەکات، کە خوا ناردوویەتی، ئەوە ئەوانەن کافران.

ئاشکراشە کە سوڵتانی عوسمانیی[2] - و ئەو کەسەش لەسەر ڕچەی سوڵتانی عوسمانی دەڕوا - هیچ کام لەو مەرجانەی تێدا نەهاتوونە دی.

کەواتە: لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ بابایەکی وا نەك هەر پێویست نییە، بەڵکو دروستیش نییە و حەرامیشە، خوای زانا دەفەرموێ:

---

(١) نەك وەك کاربەدەست و دەستەڵاتدارەکانی ئێستا، کە بە زەبری ئاسن و قەمچی خۆیان بەسەر گەلدا دەسەپێنن.

(٢) خەلیفە عوسمانییەکان زۆربەیان چاك بوون و بەتەنگ ئیسلامەوە بوون، لەگەڵ هەبوونی کەم و کوڕیی و ناتەواوییشدا، کەواتە: لێرەدا مەبەست هەر لەو سوڵتانەیە، کە ئەو جۆرە کارانەی کردوون.

www.alibapir.com



﴿ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ النساء: ٥٩.

واته: فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەن و، ئەو کاربەدەستانەی، کە لە خۆتانن.

سەیربکەن! چۆن وشەی (مِنكُمۡ)ی کردوە بە (قَید)ی (أولي الامر)!!

کەواتە: گەورە و کاربەدەستێك فەرمانبەریی کردنی پێویستە، کە لە مسوڵمانان بێت، واتە ملکەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە فەرموویەتی: ((على المر و المسلم السمع والطاعة فيما أحب وكره، إلا أن يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية، فلا سمع ولا طاعة)) متفق عليه عن ابن عمر. واتە: گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی، لەسەر ئینسانی مسوڵمانە، لە هەر شتێك دا پێی خۆش بێ و پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە کردنی تاوانێك، ئەگەر فەرمانی پێکرا بە کردنی تاوانێك، نەگوێگرتنی لەسەرەو نە فەرمانبەریی.

کەواتە: بەگوێرەی پەیڕەوی ئیسلام، هەڵوێستی میر محمد - کە بریتیە لە ڕاپەڕین بۆ بەرەنگارییکردنی داگیرکەران - هەڵوێستێکی ئیسلامییانە بووە و هەوڵدان بووە بۆ بەجێهێنانی پێویستییەکی ئیسلامی.

**سێیەم:** یەکێك لە یاسا بەڵگەنەویستەکانی ئیسلام ئەوەیە: کە بێجگە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هیچ کەسێکی دیکە بە پارێزراو و لە گوناهـ (معصوم) دانانرێ.[1]

کەواتە: مەرج نییە هەرچی پێی گوترا: زانای ئایینی و، ناوو دروشمی پێشەوایەتیی هەڵگرت، لە هەموو هەڵوێست و هەموو کات و شوێنێکدا، هەر

---

(١) ئیمام مالیك لەو بارەوە گوتوویەتی: (كل أحد يؤخذ من كلامه ويرد عليه، إلا صاحب هذا القبر (صلى الله عليه وسلم)). بڕوانە (كشف الخفا ومزيل الإلباس، عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس) ب٢، ل١٥٥.

www.alibapir.com



لەگەڵ ئیسلام و لەگەڵ ڕاستییدابێ، چونکە مرۆڤ مرۆڤە و قەت نابێتە فریشتە و وای لێ نایەت، کە نەگونجێ هەڵە و تاوان بکات.

لەلایەکی دیکەشەوە: لە قورئانی بەڕێز و سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، لە چەند جێیەکدا ئاماژە بۆ ئەو بەناو زانایانە کراوە، کە دنیادۆستیی و مادەپەرستیی لە بەرنامەی خوا، هەتڵە و لاڕێیان دەکات.

بۆ وێنە: خوای باڵادەست سەبارەت بەو جۆرە بەناو زانایانەی کە لە پێناوی ڕابواردنی کاتیی دنیادا، چاو لە ڕاستیی دەقووچێنن و، لە ڕاستەشەقامی خوا لادەدەن، فەرموویەتی:

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾

الاعراف.١٧٥-١٧٦.

لێرەدا دەبینرێ، کە زانای دنیاپەرست و لاڕێ بوو، بەراوردی لەگەڵ سەگدا پێکراوە و، وەك سەگێکی چاوچنۆکی ئێسك بەدەمەوەگر، سەیر کراوە! چونکە هەروەك چۆن سەگ هەمیشە تەنگەنەفەسە و زمان دەردێنێ، بە هەمان شێوەش زانای دنیاپەرستیش، هەمیشە چاوبرسی و چاوچنۆکە و، بە هیچ شتێك سێبووریی نایەت، هەرچەند زۆریش خەریکیماندووبوون و گەڕان و سووڕان بێ بەدوای دنیا و ئارەزووەکانیدایە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) سەبارە بەو جۆرە بەناو زانایانە، فەرموویەتی: ((يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ: يَا فُلانُ، مَا لَكَ؟! أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ: بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلا آتِيهِ وَأَنْهَى

www.alibapir.com



عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ.)) متفق عليه. واتە: لەڕۆژی دواییدا، پیاوی وا دەهێنرێ فڕێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخ، ڕیخۆڵەکانی لە ورگی دێنە دەرێ و، وەك كەرێك كە ناعوورێی پێڕادەكێشن و، بە دەوریدا هەڵدەسووڕێ، ئاوا هەڵدەسوڕێ، ئیجا خەڵكی دۆزەخێ لێی كۆدەبنەوە و دەڵێن: هۆ فڵان كەس! ئەرێ ئەوە چیتە؟! ئەدی تۆ فەرمانت بە چاكە نەدەكرد و، بەرهەڵستیی خراپەت نەدەكرد؟

ئەویش دەڵێت: با - بەڵام - فەرمانم بە چاكە دەكرد و خۆم نەمدەكرد، بەرهەڵستیی خراپەم دەكرد و خۆم دەمكرد!

لەجێیەكی دیكەدا، خوای بەرز و بێهاوتا هەر سەبارەت بەو جۆرە كەسانە دەفەرموێ:

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾ ﴾ الجمعة: ٥.

لێرەشدا دەبینین زانای بەدڕەفتار و ئیش نەكەر، بەو كتێب و بەرنامەیەی خوا بۆی ناردوە، بە گوێدرێژێك چوێنراوە، كە بارێك كتێب و نووسراوی لێنراوە!

بەڵێ، هەروەك چۆن كەر، سوودمەند نابێ لەو بارە كتێبەی لەسەر پشتیەتی، بەناو زانای دین فرۆش و دنیاپەرستیش، بە هەمان شێوە، هەرچەندە بەڕواڵەت هەڵگری زانیاریی و بەرنامەی خوایە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، كە خۆشەویستیی ژیانی دنیا و ئارەزووە ماددییەكان دڵیان داپۆشیوە، هیچ لەو زانیاریی و شارەزاییە بەهرەمەند نابێ، كە هەڵیگرتوە.

بێگومان وادیارە كاتێك، كە بابای شارەزا و زانا تاوان دەكات و لاڕێ دەبێ، خراپە و زیانێكی زۆر لە تاوان كردن و لەڕێ لادانەكەی وەدی دێ، بۆیە خوای قسە لەجێ و زانا، جارێك بەراوردی دەكات لەگەڵ پیسترین گیانداردا، كە سەگە و، جارێك بەراوردی پێدەكا لەگەڵ گیاندارێكدا، كە لە هەموو شتێك بێعەقڵترە، خوای گەورە دەیەوێ پێمان بفەرموێ: بابای زانا و چاوساغ لە بەرنامەی خوادا، هەركاتێك لایدا، لە پیسیەتییدا، دەچێتە ڕیزی سەگ و لە نەفامیی دا، دەچێتە ڕیزی كەرێ!!

www.alibapir.com



ئنجا ئەگەر بێت و ئەو ڕیوایەتە ڕاست بێت، کە (أمین زكي بگ) لە پەراوێزدا نووسیویەتی - واتە: مەلای خەتێ فتوای دابێ، کە جەنگکردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانییدا بێشەرعیی و تاوانە - ئەوە ئەو کاتە ئەو مەلایە لە دوو حاڵان بەدەر نییە. ١- یان لە فتوایەکەیدا بەهەڵەدا چووە و مەبەستی خراپی نەبووە، ئەوە لەم حاڵەتەدا بە بەهەڵەداچوو دادەنرێ، بەڵام تاوانبار نییە، هەرچەندە ئەم ئەگەرە زۆر دوورە، چونکە دەڵێن: مەلای خەتێ زۆر وریا و دادگەر بووە. ٢- یان خۆی و ئایینەکەی و نیشتمانەکەی فرۆشتوە و، خۆی ڕوو زەرد و شەرمەزاری لای خوا کردوە و، هەگبەی تاوان و گوناهی پڕکردوە.

ئنجا ئەگەر گریمان مەلای خەتێ، هەڵە و تاوانێکی واشی کردبێ - کە وەك باسمان کرد ئیحتمالێکی لاوازە - ئەوە ئەوپەڕی دەگوترێ: یەکێك لە ڕابەر و پێشەوا و زاناکانی ئیسلام، لەڕێی خوا لایدا و ناپاك دەرچوو، بەڵام تاوانی ئیسلام لێرەدا چییە؟ !![1]

---

(١) ئەگەر بەوردیی و بابەتییانە سەرنجی مێژووی میرنشینی سۆران و هۆی ڕووخان و تێکچوونی بدەین، دوو جۆرە هۆکاری نێوخۆیی و دەرەکیی دەبینین، کە هەرکامێکیان ڕۆڵی خۆی هەبوە لەو بارەوە:

**یەکەم: هۆکارە نێوخۆییەکان:**

١- نابەرانبەریی هێزی سۆران و هێزی پەلاماردەر، چ لە ڕووی چۆنایەتیی و، چ لە ڕووی چەندایەتییەوە، چونکە سێ هێزی گەورە بەشدارییان کرد لەو هێرش و پەلامارەدا، یەکیان بەسەرۆکایەتیی ڕەشید پاشا، ئەوی دیکە بە سەرۆکایەتیی والی موصڵ و، سێیەمیشیان بە سەرۆکایەتیی عەلی ڕەزا، والی بەغدا، وێڕای ئەمەش زیاتر لە دە هەزار (١٠٠٠٠) سەربازی نیزامیی ئێرانیی بە سەرۆکایەتی میر نیزام و پڕچەك کردنی لەلایەن ڕووسیاوە و، سەرباری ئەمەش پشتیوانیی نێودەوڵەتیی، بە تایبەتی بەریتانیا، کە میر محمد ئەو کاتە دژی سیاسەتیان بوو، یان ڕاستتر بڵێین: سیاسەتی ئەوان، دژی میر محمد و کیانە سیاسییەکەی بوو!

٢- لاوازیی گیانی خۆبەخت کردن و ئامادەیی بۆ بەرگریی، لە سۆنگەی:

(أ) ڕەقیی و زبریی میر محمد، لەگەڵ خزم و دۆست و دەوروبەرەکەیدا، کە بەزۆری بەزەبری کوتەك و خوێن ڕشتن سەری پێدانەواندبوون.

(ب) عەقڵیەتی خێڵەکی و عەشایەریی، کە سەرۆك خێڵ پتر لە خەمی خێڵ و عەشیرەتەکەی دایە، هەتا شتی دیکە.

٣- نەبوونی بیروباوەڕ و ستراتیژێکی ڕوون و دامەزراو، لەلای سەرکردەکانی میرنشینی سۆران، هەتا خەڵکی لەسەر کۆبکرێتەوە و گیانی بەرەنگاریی و فیداکارییان تێدا دروست بێت، بەڵێ، ڕوون

www.alibapir.com



نەبوو، ئایا هەستان و ڕاپەڕین و کیانە سیاسییەکەی میری کۆرە، لەسەر بنەمایەکی ئیسلامیی، یان نەتەوەیی، یان چینایەتییە!!

دیارە هەبوونی پیاوانی زانا و خواپەرست و ڕێزلێگیران و پرس و ڕاوێژ پێکردنیان لەو میرنشینەدا و، دینداربوونی شەخسی میری کۆرەش، بەس نییە بۆ ئیسلامیی لەقەڵەم دانی کیانە سیاسییەکەی.

٤- کاریگەریی مەعنەویی سوڵتانەکانی عوسمانیی، لەسەر خەڵکی بەگشتیی و بەتایبەتی، لەسەر زانا و شێخەکان، کە هەیبەت و حورمەتێکی تایبەتییان هەبوو.

**دووەم: هۆکارە دەرەکییەکان:**

١- دەوڵەتە گەورەکان، کاریگەریی زۆریان بەسەر ساحەی کوردستانەوە هەبووە و، هەرگیزیش هەبوونی کیانێکی کوردییان بە قازانجی خۆیان نەزانیوە، بەتایبەت دەوڵەتی عوسمایی و ئێران و، لەپشت ئەمانیشەوە هەرکام لە ڕووسیا و بەریتانیا، کە چاوی تەماعیان بڕیبۆ زۆربەی خاکی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێران.

٢- هاتنی عەلی ڕەزا بۆ وڵاتی بەغدا و، دانانی میر محمد و، بیرقدار بە والی ویلایەتی موصڵ و شارەزوور، لە ساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا، کە پێشتر بە دەسەڵاتی مەرکەزیی بەڕێوە دەچوون و گوێیان نەدەدایە سەرهەڵدانی کیانێکی دیکە، وەك میرنشینی سۆران، هەرچەندە ئەگەر سوپای ڕەشید پاشا نەهاتبایە، هەردووك والی بەغدا و موصڵ و شارەزوور، نەیان دەتوانی زیانی گەورە لە میرنشینی سۆران بدەن، بەڵام یەککەوتنەوەی هەرسێکیان، هیوای بەرەنگاری و بەرهەڵستی لە میری کۆرە و سوپاکەی بڕی.

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز! ئەمانە هۆکارە ئەسڵیی و ڕیشەییەکانی ڕووخانی میرنشینی سۆرانن، ئەگەر بویستریێ بەشێوەیەکی واقیعییانە و بابەتییانە سەرنجی مێژوو بدرێ و کەووشەن بکرێ، نەك بەشێوەیەکی عاتیفیی و سەرکێڵ و، بەمەبەست لە دڵگرتنی پێشتر - وەك خەتابارکردنی ئیسلام - کە بەداخەوە زۆربەی ئەو مێژووزان و ئەدیب و سیاسییە ناسیۆنالیستانەی لەو بارەوە قسەیان کردوە و، شتیان نووسیوە و کردوویانەتە پیشە، کە ویستویانە و دەیانەوێ بەبێ لەبەرچاوگرتن و حیساب بۆ کردنی ئەو هەموو هۆکارە بنەڕەتیی و بەرچاوانە، ئۆباڵی ڕووخان و تێکچوونی میرنشینی سۆران، بخەنە ئەستۆی مەلایەکی خواناسی کوردەوە، کە من نازانم ئەو برادەرانە چۆن قەناعەت بەخۆیان دێنن، کە بڕوا بکەن بە قسەیەك و فتوایەکی مەلایەك، حکوومەتێك بڕووخێ و هیچی بەسەر هیچەوە نەمێنێ.!!(*)

**تێبینی**: بۆ نووسینی ئەم پەراوێزە - کە هی چاپی دووەمە - پشتم بە نامیلکەیەکی (کامەران جەمال) بەستوە لەگەڵ تۆزە دەستکاریی و پوخت کردنەوەیەك دا، بەناوی (میرنشینی سۆران)، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر مێژووی سیاسیی میرنشینی سۆران، سەرەتای سەدەی پازدەهەم، ١٨٣٦، چاپی یەکەم، ١٩٩٧، هەولێر.

(*) زۆرن ئەو برادەرانەی بەناوی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و بەرگریی لە کورد! ئەو قسە و تۆمەتەیان لە کتێبەکانیان دا نووسیوە، بۆ وێنە: حسێن حوزنی موکریانی و، د.عبدالرحمن قاسملۆ و، د.جەلیلی جەلیل..

www.alibapir.com



سەلمێنرانی وەڵامەکان لەلایەن خاوەن پرسیارەوە :

(هەتا ئەم قسانەم کردن نزیکەی سەعاتێکی خایاند، بەڵام - خوا هەڵناگرێ - بێتاقەتییم لە دانیشتووانی کۆڕەکەدا بەدی نەکرد، چونکە وادیار بوو لەو جۆرە قسانەیان نەبیستبوو!

ئەمجار ڕووم کردە کابرای ڕەخنەگر و گوتم: )

ها، کاکە! ئێستا ڕات چۆنە دەربارەی خراپە و زیانی زانایانی ئیسلام بۆ گەلی کورد؟!

گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ پێش ئەم دانیشتنە، قەت بڕوام نەدەکرد، ڕۆژێك لەڕۆژان دڵم لە داخ و قینی ئیسلام پاك بێتەوە، بەڵام بڕوا بکە بیروباوەڕم لەو بارەوە گۆڕانێکی بنجیی بەسەر داهات و ئێستا دەزانم، کە بەرنامەی خوا چەندە ڕاست و پاك و بێخەوشە و، ماقووڵ نییە هیچ تاوانێکی بدەینە پاڵ.

یەکێکی دیکە لە دانیشتوان گوتی: ئەرێ کاکە، وەك گوتراوە: (الإحسان بالتمام)، بۆچی لەو بارەوە زیاتر نادوێی، چونکە من یەکەبارێ خۆم لە زۆر مەسەلاندا، ئێستاش نەگەیشتوومەتە دڵنیایی تەواو.

گوتم: ئنجا فەرموون ئێوە پرسیار بکەن، منیش ئەوەندەی دەزانم بە ڕاست و دروستی و بێ پێچ و پەنا وەڵامتان دەدەمەوە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ كَتَمَ عِلْمًا أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) رواه أبوداود والترمذي والحاكم. واتە: هەرکەسێك زانیارییەك بشارێتەوە، خوا لە ڕۆژی دواییدا، لغاوێکی ئاگرینی دەزاری دەکات!!

گوتی: ئایا ئیسلامەتیی ڕای چییە سەبارەت بە بیری نەتەوایەتیی و خۆشویستنی گەل و نیشتمان؟!

www.alibapir.com



## ڕای ئیسلام سەبارەت بە بیری نەتەوایەتیی و خۆشەویستیی گەل و نیشتمان

((سەبارەت بە پرسیاری ئەو برادەرە، دەربارەی گەل و نیشتمان و بیری نەتەوایەتیی)) گوتم: خوای زانا و کاربەجێ پشتیوان بێ، دەتوانین لەبەر تیشکی تاقە ئایەتێکی قورئانی قسەلەجێدا، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، خوا لە سوورەتی (الحجرات)دا، فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ الحجرات:١٣.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێر (ئادەم) و مێ (حەووا)یەك خوڵقاندوە و، کردوومانن بە چەند گەل و تیرەیەك، بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، بەڕێزتریشتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

ئەم ئایەتە بەپێزە، دەگونجێ بکرێتە سەرچاوەی وەڵامی تێکڕای ئەو پرسیارانەی سەر بە مەسەلەی نەتەوایەتیین، دەتوانین لەم ئایەتە موبارەکەدا ئەم یاسایانەی خوارێ دەستگیر بکەین:

**یاسای یەکەم:** لە بەرنامەی ئیسلامدا بە یەك چاو سەیری مرۆڤایەتیی دەکرێ و، هیچی بەسەر هیچیدا هەڵناکێشرێ و، کەس بەرزتر دانانرێ.

بەڵێ! لە ئایینی خوادا، مرۆڤایەتیی بە گشتی، وەك یەك حیسابیان بۆ دەکرێ، لە قورئانی بەپێزدا لە چەندەها شوێندا وشەی: (الناس) خەڵك، (الإنسان)

www.alibapir.com



مرۆڤ، (بني آدم) ئادەمیزادەکان، دووبارە کراونەوە، بێگومان هەرکامێکیشیان دەلالەت لەسەر تێکڕای ئینسانەکان بە یەکسانیی و بێجیاوازیی، دەکات.

بەڵێ، ئیسلام هەموو مرۆڤەکان، وەك یەك تەماشا دەکا و نالێت: فڵانە میللەت،[١] یان فڵانە ڕەگەز،[٢] یان فڵانە نەتەوە،[٣] یان فڵانە چین،[٤] یان فڵانە ڕەنگ،[٥] یان فڵانە وەجاخ،[٦] ئیمتیاز و زیادیی هەیە، بەسەر باقی خەڵکیدا.

ئەم یاسایەی گوتمان، لە نیمچە ڕستەی (ياأيها الناس) وەردەگیرێ.

**یاسای دووەم:** کە لەم ئایەتە وەردەگیرێ، ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار، بەدیهێنەر و سەرپەرشتیکاری هەمووانە بەبێ جیاوازیی و، هیچ کام لە مرۆڤەکان یان نەتەوە و تیرەکان لەوانی دیکە، زیاتر بەشی بەخواوە نییە و لێی نزیکتر نییە، ئەم یاسایەش لە ڕستەی (إنا خلقناكم) وەردەگیرێ.

**یاسای سێیەم:** کە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات، ئەوەیە، کە بەندەکان تێکڕا، لەیەك ڕەچەڵەك و بنەڕەتەوە هاتوون و وەك یەك خوڵقێنراون و، خوا هەندێکیانی لەوانی دیکە باشتر نەخوڵقاندوە، وەك جوولەکە و ڕەگەزپەرست و نەتەوەپەرست و چین پەرست و ڕەچەڵەك پەرستەکان، دەڵێن.

پێغەمبەری پێشەواش (صلی الله علیه وسلم) لەم بارەوە دەفەرموێ: ((لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَفْتَخِرُونَ بِآبَائِهِمْ الَّذِينَ مَاتُوا، إِنَّمَا هُمْ فَحْمُ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الْجُعَلِ الَّذِي يُدَهْدِهُ الْخِرَاءَ بِأَنْفِهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا

---

(١) وەك جووەکان دەڵێن: (نحن شعب الله المختار) ئێمە میللەتی هەڵبژاردەی خواین!

(٢) وەك نازییەکان و فاشییەکان دەیانگوت.

(٣) وەك ڕەگەزپەرست و نەتەوەپەرستەکان گوتوویانە و دەیڵێن.

(٤) وەك شیوعیی و مارکسییەکان دەڵێن.

(٥) وەك شارستانییەتی ڕۆژئاوای سەدەی بیست دەڵێت.

(٦) وەك هەندێك لە ئاغا و بەگ و شێخەکان دەڵێن، (بێگومان هیچ کام لەمانە لەبەر خودی ناوەکەی بەخراپ دانانرێ، مادام خۆی بەڕەچەڵەکەکەیەوە هەڵنەکێشێ و، خۆی بە زیاتر نەگرێ).

www.alibapir.com



بِالآبَاءِ، إِنَّمَا هُوَ مُؤْمِنٌ تَقِيٌ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، النَّاسُ كُلُّهُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ))
رواه أبوداود والترمذي وحسنه.

واته: کەسانێك، کە خۆیان بە باب و باپیرانێکیانەوە هەڵدەکێشن کە مردوون و، بێگومان بوونەتە خەڵووزی دۆزەخ، دەبێ واز لەو ڕەفتارەیان بێنن، ئەگەرنا لەلای خوا لەو قالۆنچەیە نابووتتر دەبن، کە بە لووتی، پیسایی خڕ دەکات و خلۆری دەکاتەوە، بێگومان خوای بەرز، خۆبەزلگریی سەردەمی نەفامیی و شانازیی کردن بە باب و باپیرانی لەئێوەدا لابردوە، ئینسان - لە تەرازووی خوادا دوو جۆرە - بڕوادارێکی پارێزکار و، خراپەکارێکی بەدبەخت، خەڵکی وەچەی ئادەمن و، ئادەمیش لەگڵ دروست بووە!

دیسان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ((اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنْ أَمِّر عليكم عبد حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ)) رواه البخاري. واتە: گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بکەن، تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی - ڕەشی - حەبەشەییشتان لەسەر کرایە سەرۆك و فەرمانڕەوا، کە سەری وەك مێوژێ وابوو.

بەڵێ، سەرچاوەی هاتنەدی و درووستبوونی هەموو مرۆڤایەتیی، دایك و بابێکن و، هەموویان لە ئادەمن و ئەویش لە گڵە، کەواتە: هیچ مرۆڤێك ناتوانێ لافی ئیمتیاز و زێدەیی لێ بدات، بەسەر غەیری خۆیدا، ئەم یاسایەش لە نیمچە ڕستەی (من ذكر وأنثى) فامرایەوە.

**یاسای چوارەم:** مرۆڤایەتیی بەپێی ویستی خوای باڵادەست، کراوە بەچەند تیرە و نەتەوەیەك، ئەو یاسایەش لە ڕستەی (وجعلناكم شعوباً وقبائل) وەردەگیرێ.

ئەم بەشەی ئەم ئایەتەش لە هەموو بەشەکانی دیکە، زیاتر وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە، کە لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتیی هەڵدەستن، کەواتە: پێویستیی بە توێژینەوە و تێوەڕامانێکی زیاتر دەکات.

www.alibapir.com



**پێش هەموو شتێك پێویستە چەمك و مانای بێژە(لفظ)ەكانی بزانین:**

١- وشەی (جَعَلَ) بە پێنج مانایان هاتوە:

**(أ)** بە مانای (صار) و (طفق) وەك: (جَعَل محمد ينشد الشعر).

**(ب)** بە مانای (صار) و (خلق)، وەك: (وجعل الظلمات والنور).

**(ج)** بە مانای پەیداكردنی شتێك لە شتێكی دی، وەك (جَعَل لكم فيها سُبُلاً).

**(د)** بەمانای گۆڕینی شتێك لەبارێكە بۆ بارێكی دیكە، وەك: (وجعلناكم شعوباً و قبائل لتعارفوا).

**(ه)** بەمانای حوكم كردنی شتێك لەسەر شتێك، وەك: (ويجعلون لله البنات).

دیارە ئەوەی كە (جعل) لێرەدا دەلالەتی لەسەر دەكات، مانای چوارەمیانە، چونكە خوای بەرز، دوای ئەوەی مرۆڤی لە دایك و باپێك خوڵقاند، كردی بەچەند تیرە و نەتەوەیەك، واتە: لە حاڵێكەوە گۆڕی بۆ حاڵێكی دیكە.

٢- وشەی (شعب)یش یانی: تیرەیەكی بڵاوبووەوە و پەل هاویشتوو (القبيلة المتشعِّبة).[١]

٣- وشەی (قبیلە)ش واتە: كۆمەڵە خەڵكێكی كۆبووەوە، كە هاموشۆی یەكدی دەكەن (جماعة مجتمعة يقبل بعضها على بعض)، هەڵبەتە (قبائل)یش كۆی (قبیلە)یە.[٢]

ئێستا، كە چەمك و مەبەستی یەك یەكی وشەكانی ئەم ڕستەیەمان توێژییەوە، با سەرنجێك لە دەریا قووڵە پڕ لە گەوەرە و مرواریییەكەی بدەین:

---

(١) (محمد فريد وجدي) لە (دائرة معارف القرن العشرين)دا دەڵێت: (الشعب مجموع قبائل الأمة الواحدة) واتە: گەل كۆی تیرە و هۆزەكانی نەتەوەیەكە. سەیری بەرگی (٥) ل٣٨٩ بكە.

(٢) مانای هەموو ئەو وشانە، لە كتێبی (معجم ألفاظ القرآن) نوسراوی (راغب الأصفهاني) وەرگیراوە.

www.alibapir.com



لەبەر تیشکی توێژینەوەی یەك یەكی وشەكانی ئەم ڕستە قورئانییەدا دەتوانین بەڕاشكاویی بڵێین: هەركام لە: (كورد و عارەب و تورك و هیند و فارس و..هتد). نەتەوە و گەلن، چونكە هەركامێكیان لە چەند تیرە و هۆزێك پێك دێن، بەڵگەنەویستیشە، كە هەموو گەل و نەتەوەیەك، پێویستە خاوەنی نیشتمانێكی سەربەخۆ و زمانێكی سەربەخۆ بێت.

بەڵێ، هەركام لە نیشتمان و زمان، شتێكی حەتمیی و پێویستن، بۆ هەر گەلێك، تاكو مانای گەلی بەسەردا بچەسپێ: ١- خاك و ئاو، تاكو بژێوی تێدا پەیدا بكەن و تێیدا بحەوێنەوە، ٢- زمانیش، تاكو پێی لە یەكدی حاڵی بن، ئنجا لێرەدا دەگەینە ئەنجامێكی بایەخدار:

.. ئێمە لە دەمی توێژینەوە و شیكردنەوەی بێژەی (جَعَل)دا گوتمان: پێنج مانایان هەڵدەگرێ و یەكێكیان لێرەدا دەگونجێ، ئەویش بریتییە لە گۆڕان بەسەر شتێك داهێنان، لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێكی دیكە.

واتە: خوای بەخشندە لە حاڵەتی نێر و مێیەكەوە، ئینسانی گۆڕی بۆ حاڵەتی دابەشبوون بەسەر چەندان گەل و تیرەدا.

دیارە ڕاناوی (نا) لە وشەی (جعلنا)دا، بۆ خوای بێهاوەڵ دەگەڕێتەوە، كەواتە: ئەوەی مرۆڤەكانی كردوون بە چەند گەل و تیرەیەكی جیاجیا، پەروەردگاری بێهاوتایە.

كەواتە: ئێستا دەتوانین بە ڕاشكاویی بڵێین: پەروەردگار هەر لە دەمی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەدا، كە مرۆڤەكانی دابەش كردوون بۆ چەند نەتەوە و تیرەیەك، ئەوەشی ڕاگەیاندوە، كە پێویستە هەركام لەو نەتەوانە، خاوەنی نیشتمان و زمان و ئەدەب و كەلەپوور و، خەسڵەتە نەتەوایەتییەكانی دیكەی خۆی بێت.

بۆ وێنە: گەلی كورد پێویستە لە نیشتمانی خۆیدا - كە كوردستانە - نیشتەجێ بێ و، بە زمانی خۆی بدوێ و، پارێزگاریی لە هەموو ئەو خەسڵەتە نەتەوەییانەی دیكەی بكات، كە بەشدارن لە پێكهێنانی نەتەوەیەكدا و، كەسایەتییەكی سەربەخۆی پێدەبەخشن.

www.alibapir.com



ئنجا مادام هاتنەدی تیرە و نەتەوەکان بەویستی خوا بووبێ و، تیرە و نەتەوەکانیش بەبێ هەبوونی خەسڵەتە پێکهێنەرەکان، لە خاك و ئاو و ڕەنگ و زمان و نەریت و خوو و ئەدەب و کەلەپوور و...هتد، مەحاڵە، کەواتە: هەرکەسێك بیەوێ خەسڵەتە تایبەتییەکانی نەتەوەیەك بفەوتێنێ، مانای وایە ویستوویەتی: ببێتە جێی مەترسی بۆ تێداچوونی نەتەوەیەك.

هەر کەسێکیش بیەوێ نەتەوەیەك بفەوتێنێ، ئەوە دژ بە ویستی خوای کاربەجێ هەنگاوی ناوە و، هەر کەسێکیش دوژمنایەتیی لەگەڵ خوادا بکات، گوناهبار و ڕیسوا دەبێ.

لێرەدا ئەو برادەرە، کە پرسیارەکەی کردبوو گوتی: کاکەگیان، بەڕاستیی ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگ و بایەخ دارە، تکایە زیاتر بۆمان ڕوون بکەوە.

گوتم: بەڵێ بەچاوان، ئنجا مادام وایە، با لە چەند خاڵێکدا ئەو مەبەستانە ڕابگەیەنین، کە پێشتر بەکورتیی باسکران.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## یەکەم: ئیسلام و خۆشویستنی گەل و نیشتیمان:

گومان لەوەدا نییە، کە ئیسلام بەشێوەیەك نێرراوە، کە گشت داخوازییەکانی سروشتی ساغی مرۆڤ جێبەجێ بکا و، هەموو غەریزەکانی تێر بکات و، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی بداتەوە.[1]

ئنجا ئێستا با ڕامێنین: ئایا خۆشەویستیی گەل و نیشتمان، غەریزە و داخوازییەکی ڕەسەنی سروشتی ئینسانە، یان نا؟! هەڵبەتە ئەگەر غەریزە و داخوازییەکی ڕەسەنی سروشتی بێت، پێویستە ئیسلام نەك هەر دژایەتیی نەکات بەڵکو پێشوازییشی لێ بکات و بە گەرمییش بەخێرهاتنی بکات، بەڵام ئەگەر غەریزەیەکی ڕەسەن و داخوازییەکی سروشتیی نەبێت، دیارە ئیسلام پێی ڕازیی نییە و پێکەوە هەڵناکەن.

بۆ سەلماندنی ڕەسەنایەتیی غەریزەی خۆشەویستیی گەل و نیشتمانیش، لە سروشتی ئینساندا، پشکنین و گەڕانێکی زۆرمان گەرەك نییە و، هەریەکێکمان - ئەگەر لەخۆی نەگۆڕێ - هەستی پێدەکات.

بە تایبەتیش ئەو هەست پێکردنە، لەکاتێکدا زیاتر دەبێتە شتێکی دیار و بەرچاو، کە ئینسان لەگەل و نیشتمانەکەی دوور دەکەوێتەوە و بۆیان تامەزرۆ دەبێت.

---

(١) خوای بەخشندە لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم: ٣٠.

واتە: ڕووی خۆت ڕابگرە بەرانبەر بە ئایینی ڕاست و تەواو - و پێیەوە پابەند بە - و خۆتی بۆ یەکلا بکەوە، ئەو ئایین و بەرنامە خواییەی، کە بەپێی ئەو سروشتە ناردوویەتی، کە خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە، ئەو سروشتەش گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونکە دەستکردی خوایە، ئەو ئایین و بەرنامەیەش، تاقە ئایین و پەیڕەوێکی ڕاست و تەواوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

www.alibapir.com



کێ هەیە، کە لەژیانی ئاوارەیی و دوورە وڵاتیی، لە دەمی دیتنی هاوزمان و هاونیشتمانییەکیدا دڵی نەپشکوێ و خۆشحاڵ نەبێ؟!

هەڵبەتە لێرەدا قسەم لەگەڵ بابایەکی بێ هەست و نەست و دڵ مردوو نییە و، بەڕیزپەڕان (شواذ)یش یاسا هەڵناوەشێنەوە.

بەڵێ! نیشتمان لەبەرچاوی مرۆڤ دڵگیر و خۆشەویستە، هەر بۆیەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((إِنَّ أُحُداً جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ)) رواه الشيخان عن أنس.[1] واتە: (ئوحود) شاخێکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێ.

دیسان فەرموویەتی: ((أَللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنا المدينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشدُّ...)) رواه الشيخان عن عائشة رضي الله عنها.[2] واتە: ئەی خوایە! شاری مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە، وەك خۆشەویستییمان بۆ شاری مەککە و زیاتریش.

..هەروەها لە فەرمایشتکێکی دیکەدا سەبارەت بەشاری مەککە، فەرموویەتی: ((مَا أَطْيَبُكِ مِنْ بَلَدٍ وأَحَبّكَ إِلَيَّ، ولو لا أن قومي أخرجوني منك، ما سكنتُ غيركِ)) رواه الترمذي عن ابن عباس.[3] واتە: چەند نیشتمانێکی خۆشی و، چەندم لەلا خۆشەویستی!! ئەگەر گەلەکەم لەتۆ وەدەریان نەنابام، بێجگە لەتۆ، لەهیچ جێیەکی دی دانەدەنیشتم!!

دیارەهاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، کە چاکترین و ڕاستترین نموونەی جێبەجێکردن (تطبيق)ی، ڕاست و دروستی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو ون، سەبارەت بەو هەست و نەستە سادە و سروشتییەی، کە ناومان لێنا: (سۆزی نەتەوایەتیی)، هەر هەمان هەڵوێستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان هەبووە، بۆ وێنە:

---

(١) بڕوانە (تاج الأصول) ب٢، ل١٨٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٦.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٣.

www.alibapir.com



دەگێڕنەوە[1]: کە (بیلالی حەبەشەیی) خوا لێی ڕازی بێ، پاش کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە، نەخۆش دەکەوێ و، هەست و نەست و سۆزی کوڵی گەرم و بەتینی نێودەروونی، سەبارەت بە شاری مەککە، لەم چەند دێڕە شیعرەدا دەردەبڕێ:

ألا ليت شعري هل أبيتن ليلة     بفخ وحولي إذخر وجليل
وهل أردن يوما مياه مجنة     وهل يبدون لي شامة وطفيل

واتە: ئەرێ خۆزگە زانیبام، داخوا ڕێ دەکەوێ، هیچ شەوان لە (فخ) - کە ناوی شوێنێکە - بمێنمەوە، لە حاڵێکدا کە (إذخر) و (جليل)م لە دەورە بن.

ئایا هیچ ڕۆژان دەچمەوە سەر ئاوی (مجنە)؟ ئایا جارێکی دی (شامة) و (طفيل)م لێ وەدەردەکەون؟![2]

ئێستا کە بۆمان ڕوون بۆوە، خۆشەویستیی گەل و نیشتمان، خەسڵەتێکی سروشتییە لە مرۆڤدا و، غەریزەیەکە و بەشێکە لە پێکهێنەرەکانی ئینسان، دەتوانین بەڕاشکاویی بڵێین:

ئیسلامەتیی نەك هەر دژایەتیی و ناکۆکیی لەگەڵیدا نییە، بەڵکو فەرمانیشی پێدەکات، هەروەك چۆن دژایەتیی لەگەڵ غەریزەی جینسییدا نییە و، زیاد لەوەش، تێرکردن و بەدەنگەوەچوونی، بەچاکە و خواپەرستیی دادەنێ، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((...وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَيَأتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟! قَالَ أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ، كَانَ لَهُ أَجْرًا)) رواه مسلم. واتە: لەسەرجێیی[3]

---

(١) بڕوانە (مجموعة رسائل الإمام الشهيد حسن البنا) ل١٧-١٨، هەروەها (إسلام وناسيوناليزم)ی أبو الأعلى المودودي، ل٤٧.

(٢) (فخ ومجنة وشامة وطفيل) ناوی چەند شوێنێکن لەناوچەی مەککە، (إذخر و جليل)یش دوو جۆرە گیان.

(٣) سەرجێیی کردن کینایە بۆ جووت بوونی پیاو لەگەڵ هاوسەریدا.

www.alibapir.com



کردنی یەکێکتاندا پاداشت هەیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا!، ئایا کەیەکێك لەئێمە ئارەزووی جێبەجێ دەکا، پاداشتیشی هەیە؟! فەرمووی: ئایا ئەگەر ئەو ئارەزووەی خۆی لە جێیەکی حەرامدا جێبەجێ کردبایە، تاوانی لەسەر نەدەبوو؟ هەر ئاواش، ئەگەر ئارەزووەکەی لەگەڵ حەڵاڵی خۆیدا جێبەجێ بکات، پاداشتی چاکی هەیە.

**بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە پێویستە چاوێکی پێدا بخشێنین:**

ڕەنگە هەندێك کەسی کەللە وشك و زیادەڕەو بڵێن: چۆن بۆت هەیە (خۆشەویستیی گەل و نیشتمان) بە غەریزەرەکی ڕەسەن و شتێکی سروشتیی و ڕەوا دابنێی؟!

مەگەر بێئاگای لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ، وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ، وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ)) رواه أبوداود عن جبير بن مطعم.[1]

واتە: هەرکەسێك بانگەوازیی بۆ دەمارگیریی بکات، لەئێمە نییە و، هەرکەسێك لەسەر دەمارگیریی بجەنگێ، لەئێمە نییە و، هەرکەسێك لەسەر دەمارگیریی بمرێ، لەئێمە نیە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم فەرمایشتە ناکۆکیی و دژایەتیی نییە لەگەڵ ئەو مەبەستەدا، کە ئێمە لێی دەدوێین، چونکە خۆشەویستیی گەل و نیشتمان لەگەڵ دەمارگیرییدا، لێك جوێن.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەم فەرمایشتەی دژ بە دەمارگیریی (تعصّب) فەرمووە، نەك دژ بە خۆشەویستیی گەل و نیشتمان، ئێستاش بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست و سەلماندنی هەبوونی جیاوازیی لەنێوان دەمارگیریی و خۆشەویستیی گەل و نیشتمان دا، دوو خاڵان دەخەینە ڕوو:

---

(١) بڕوانە: فیض القدیر، ب٥، ل٣٨٦، بەژمارە (٨٦٨٣)، هەروەها سنن أبي داود، ب٢، ل٦٢٥.

www.alibapir.com



١- کچی وائیلەی کوڕی ئەسقەع دەڵێ: ((سَمِعت أَبِي يَقُولُ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا الْعَصَبِيَّةُ؟ قَالَ أَنْ تُعِينَ قَوْمَكَ عَلَى الظُّلْمِ)) رواه أبوداود.[١]

واتە: لە بابم بیست، دەیگوت: بەپێغەمبەرم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! دەمارگیری (عصبية) چی یە؟!

فەرمووی: ئەوەیە، کە لەسەر ناهەق، پشتگیریی گەلەکەت بکەی.

بەڵێ! خۆشویستنیی گەل و نیشتمان، ئەگەر بەشێوەیەکی هەڵە و ناتەواو بێ، دەبێتە نەتەوەپەرستیی (ناسیۆنالیزم) و دەمارگیریی، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی میانەڕەوانە و ڕاست بێ، ئەوە نەك هەر خراپ نییە، بەڵکو بە یەکێك لە خەسڵەتە باشەکانی ئینسانی مسوڵمان دادەنرێ، وەك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((خَيْرُكُمْ الْمُدَافِعُ عَنْ عَشِيرَتِهِ مَا لَمْ يَأْثَمْ)) رواه أبو داود.[٢]

دیسان دەربارەی دەمارگیری و نەتەوەپەرستیی، ڕابەرمان(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ نَصَرَ قَوْمَهُ عَلَى غَيْرِ الْحَقِّ، فَهُوَ كَالْبَعِيرِ الَّذِي رُدِّيَ، فَهُوَ يُنْزَعُ بِذَنَبِهِ))رواه أبوداود.[٣]

---

(١) بڕوانە: سنن أبي داود، ب٢، ل٦٢٥.

(٢) بڕوانە: سنن أبي داود، ل٦٢٥. هەندێك لە زانایان ئەم فەرموودەیە لەڕووی (سند)ەوە بە لاواز دەزانن، بەڵام نێوەڕۆکەکەی ڕاست و بەجێیە و بێگرێ یە.

(٣) پوختەی قسان ئەوەیە: کە (عصبية)، کە زانایان بە (پشتگیرییکردنی تیرە و گەل لەسەر ناهەق) لێکیان داوەتەوە و، ئێمەش لە زمانی کوردییدا (دەمارگیریی)مان لە بەرانبەردا داناوە، بەپیشەی سەردەمی نەفامیی و بە هەڵوێست و ڕەفتارێکی بێشەرعیی لەقەڵەم دەدرێ،[*] چونکە بنچینەی ئەو خەسڵەتە پیسە بریتییە لە: وەلانانی تەرازووی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ هەڵس و کەوتکردن و، دانانی تەرازوویێکی دیکەی لاتەڵ.

بەڵێ، مسوڵمان: تیرەو گەل و نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ، بەڵام نایان پەرستێ، خۆشی دەوێن، بەڵام خۆشەویستیی وان، وای لێناکات بیانکاتە تەرازووی هەڵس و کەوت و جۆر و چۆنیەتی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵك دا و، دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی و (الموالاة والمعاداة)ی لەسەر بنیات نانێ!

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، هیچ کاتێك شانازیی بە تیرە و نەتەوە و ڕەچەڵەکییەوە ناکات و خۆی پێوە هەڵناکێشێ.

(أبي عقبة)ش، کە کابرایەکی فارس بووە و، یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله

www.alibapir.com



واتە: هەرکەسێك لەسەر ناهەق پشتگیریی گەلەکەی بکات، وەك ئەو حوشترە وایە کە کەوتۆتە چاڵێکەوە و بە کلکێی دەری دەهێننەوە.

٢- هەرچەندە گەل و تیرەپەرستییش، هەر لە غەریزەی خۆشەویستیی گەل و نیشتیمانەوە، پەیدا دەبێ، بەڵام نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە حوکمی هەردووکیان وەك یەك بێ - وەك بە چەند دەقێك ڕوونمان کردەوە -، ئایا ئەو کەسەی، کە لەڕێی زینا و داوێن پیسییەوە، غەریزەی جینسیی تێر دەکات، وەك ئەو کەسە وایە، کە لە ڕێیەکی حەڵاڵەوە تێری دەکات ؟!

بێگومان نا، بەڵام هەردووکیشیان هەر لەسەر غەریزەی جینسییەوە هەڵدەستن!!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

علیه وسلم)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دا لە جەنگی ئوحوددا ئامادەبووم، زەبرێکم لە کابرایەك لە بت پەرستەکان دا و گوتم: بیگرە لە دەستم و منیش کوڕێکی فارسم! پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاوڕی لێدامەوە و فەرمووی: دەبووایە گوتبات: بیگرە لەدەستم و منیش کوڕێکی ئەنصارییم!!(**)

(*) بڕوانە: فیض القدیر، ب٥، ل٣٨٦.

(**) بڕوانە: سنن أبي داود، ب٢، ل٦٢٥.

www.alibapir.com



## دووەم: ئیسلام و داب و نەریتە نەتەوایەتییەکان:

لەم بارەوە هەڵوێستی ئیسلام ئاوایە:

هەرچی لەگەڵ یەکێك لە بەند و یاساکانی ئیسلامدا دژایەتیی نەبێ، ئەوە ئیسلامەتیی بە شتێکی ڕەوا و ماقووڵی دەزانێ و، بە پێچەوانەوە: هەرچی دژ بەیەکێك لە یاسا و دەستوورەکانی ئیسلام بێت، ئەوە لە تەرازووی بەرنامەی خوادا، بێکێش و سەنگە و ناڕەوایە.

بۆ وێنە: جل و بەرگی کوردیی ڕەسەن،[١] چ پیاوانەو چ ژنانە، شتێکی لەبار و گونجاوە لەگەڵ یاساکانی ئیسلام دا و، ئەوە هیچ، کە ئیسلام هەوڵی فەوتاندنی نادا، بگرە مانەوەی بە پێویستیش دەزانێ، بەڵام عادەتێکی پووچی وەك ڕەش بەڵەك -کە لەو بڕوایەش دا نیم نەریتێکی نەتەوەیی گەلی کورد بێ- ئیسلام دژایەتیی دەکات و پێی ڕازیی نیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) بۆیە دەڵێین: (ڕەسەن)، چونکە ئێستا -حەیفێ- لە ئەنجامی لاساکردنەوەی کوێرانەی هێندێك لە مسوڵمانانندا!! جۆرە جل و بەرگێکی بەناو کوردانەی ناڕەسەن و بێشەرمانەی ئافرەتان پەیدا بووە، کە هیچی وای لە جل و بەرگە بێشەرمانەکەی ڕۆژهەڵاتیی و، ڕۆژئاواییە ئاژەڵ سیفەتەکان کەمتر نیە!!

www.alibapir.com



## سێیەم: ئیسلام و زمان و ئەدەب و کەلەپوور

لە دەمی وەرگرتنی یاسای چوارەمدا -کە هەتا ئێستاش هەر خەریکی شیکردنەوەی ئەو یاسایەین - گوتمان: مرۆڤایەتیی بەپێی ویستی خوا، دابەش بووە بۆ چەند گەل و تیرەیەك، دواییش ڕوونمان کردەوە، کە هەبوونی نیشتمان و زمانێکی سەربەخۆ، شتێکی پێویست و حەتمییە، بۆ نەتەوە حسێب کرانی هەر گەل و نەتەوەیەك، کەواتە زمانی هەر گەلێك - بە هەر شێوەیەك، پەیدا بووبێ - بە ویست و خواستی خوای پەروەردگار، هاتۆتە دی.

تەنانەت خوای زانا لە سوورەتی (الروم)دا فەرموویەتی:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الروم:٢٢.

واتە: لە نیشانەکانی - گەورەیی خوا - دروست کرانی ئاسمانەکان و زەویی و جیاوازیی زمان و ڕەنگەکانتانە، بەڕاستیی لەوەدا، نیشانە و بەڵگەی زۆر هەن - لەسەر هەبوونی خوا - بۆ زانایان.

لێرەدا دەبینین، خوای کاربەجێ، جیاوازیی ڕەنگ و زمانی نەتەوە و گەلەکانی، کردۆتە نیشانەو بەڵگەی هەبوونی خۆی.

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە: ئایا بابایەکی مسوڵمانی کورد، کە بیەوێ بەرنامەی خوا بۆ گەلەکەی ڕوون بکاتەوە، بەبێ شارەزایی و بەڵەدیی لە زمان و ئەدەبی کوردییدا، ئەمەی بۆ دەکرێ؟! بێگومان نەخێر.

کەواتە: خزمەتکردن بە ئەدەب و زمانی هەر نەتەوەیەك، بەجێهێنانی یەکێکە لە یاساکانی ئیسلام، مادام ئەو ئەدەب و زمانە، بۆ ڕوون کردنەوە و خستەڕووی ئیسلام بەکاربهێنرێ، یان هەر زانیارییەك، کە سوودبەخش بێ، بۆ گەل و میللەت.

www.alibapir.com



کەواتە: ئیسلام دژی هیچ جۆرە زمان و ئەدەبێك نییە، کە بۆ کاری خراپ بەکار نەهێنرێ، چونکە وەك گوتمان: ئەو زمانانە بەپێی ویستی خوا هاتوونە دی و، بەڵگەن لەسەر هەبوونی خوا، وێڕای ئەمەش، زمان و ئەدەبی هەر گەلێك، دەگونجێ بەکاربهێنرێ بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی ئیسلام و، هەر زانیارییەکی سوودبەخشی دیکە.

ئنجا بەپێی یاسای: (ما لا يتم الواجب إلاَّ بِهِ، فهو واجب)، واتە: (ئەو شتەی، کە فەرزێك پەکی لەسەر بکەوێ، ئەویش پێویستە)، دەتوانین بڵێین: خزمەتکردن بەئەدەب و زمان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، پێویستە، چونکە زمان و ئەدەبێکی ڕێك و پێك و تەواو، بەبێ مشوور لێخواردن نایەتە دی و، بەبێ زمان و ئەدەبێکی تەواویش، ناتوانین[1] خزمەت بە ئیسلام بکەین و بەچاکی ڕایبگەیەنین، هەڵبەتە ڕاگەیەنرانی ئیسلامیش پێویستە، کەواتە:

هێنانە دی زمان و ئەدەبێکی ڕەسەن و تەواو، لەنێو هەر گەلێکدا پێویستە، بەڵام لێرەدا تێبینییەك هەیە، ناگونجێ فەرامۆش بکرێ، ئێمە، کە دەڵێین: هەوڵدان بۆ هێنانەدی ئەدەب و زمانێکی تەواو و ڕەسەن، لەنێو هەر گەلێکدا پێویستە، نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ، کە مەبەستی ئێمە لە ئەدەبی ڕەسەن، ئەو ئەدەبەیە کە لەگەڵ یاساکانی بەرنامەی خوادا دژایەتیی نییە.

ئەو ئەدەبەش، کە لەگەڵ پەیڕەو و شەرعی خواییدا ناکۆکیی نییە، دەتوانین بەکورتیی بڵێین: ئەدەبێکە، کە دەبێتە پاڵنەری مرۆڤ بەرەو چاکە و خێرخوازیی و خزمەتکردنی خەڵك، کەواتە: هەر ئەدەبێك بە پێچەوانەی ئەمەوە بێت، ئەوە ئەدەبێکی نارەسەن و ناشەرعییە، چونکە لەگەڵ بەرنامەی خوادا دژایەتیی هەیە.

(لێرەدا برێك بێدەنگ بووم و ژوورەکەمان بێ هەست و خوست بوو، بەڵام دەنگی یەکێك لە دانیشتووان خامۆشیی ژوورەکەی ڕەواندەوە و گوتی: )

ئەرێ پێم وابێ، تەفسیری ئایەتەکە برێکی ماوە!

---

(١) هەروەها بەبێ زمان و ئەدەب و .... هتد ناتوانین پێکەوە بدوێین و لە یەکدی حاڵی بین و، بەبێ لە یەکدی تێگەیشتنیش، ژیانی بەشەر ناسوڕێ.

www.alibapir.com



گوتم: بەڵێ، مەبەستم بوو پشوویێکی بدەم و، بشزانم داخۆ ماندوو و بێتاقەت نەبوون!

گوتی: کاکە ماندووبوونی چی؟ بە قەراریێ پیاوان، من بەش بە حاڵی خۆم، ئەگەر هەتا بەیانی دابنیشم، بێتاقەت نابم.

(ئنجا دانیشتوانی دیکەش، بەیەك دەنگ گوتیان: )

کاکەگیان ماندووبوونی چی، ئێمە لەمێژ ساڵە ئەو گرفت و گرێ کوێرانەمان لەسەر دڵ کۆبوونەتەوە و، لە دەرفەت و هەلێکی ئاوا دەگەڕاین، کە یەکێك هەبێت، بتوانێ بەخێرا خۆی بۆمان بکاتەوە.

گوتم: مادام وابێ زۆر چاکە، با بچینەوە سەر توێژینەوە و لێکدانەوەی، پاش ماوەی ئایەتەکە.

**یاسای پێنجەم:** دابەشبوونی مرۆڤایەتیی بەسەر چەند تیرەو گەلێکدا، بە مەبەستی پەیداکردنی هۆگریی و تەبایی و خۆشەویستییە لەنێوانیاندا، نەك ڕق و قین و دووبەرەکیی و دوژمنایەتیی، ئەم یاسایەش لە وشەی (لتعارفوا) دەستگیر دەبێت.

بەڵێ ئیسلام دەڵێ: نابێ جیاوازیی تیرە و هۆز و گەلەکان، ببێتە هۆی ناکۆکیی و تێك هەڵپڕژان و وێك هەڵنەکردن و پێکەوە مەدار نەکردنیان، ئنجا لێرەشدا، پێویستە ئەم ڕاستییە ڕابگەیەنرێ و تەئکیدی لەسەر بکرێ:

کە ئیسلام هەر هێندە خۆشەویستیی و سۆزی نەتەوایەتی، بە غەریزەیەکی ڕەسەن و شتێکی سروشتیی و ڕەوا لە قەڵەم دەدات، کە لە ڕێی پێك ئاشنابوون (تعارف)دا نابێتە پەرچ و تانە، بەڵام کاتێك ئەو سۆزە نەتەوەیییە، ڕێ لە برایەتیی و یەکترناسین دەگرێ و، دەبێتە ماکی ناکۆکیی و دووبەرەکیی و لێکدان و پێکدادان، ئەو دەمی، هەڵوێستی ناوبراو، نەك هەر بەشتێکی شەرعیی و ڕەوا دانانێ، بەڵکو بەکوان[1] و خۆرکەیەکی ترسناکی دادەنێت، ئەمەش سنووری نێوان نەتەوایەتیی ئیسلامیی و، نەتەوایەتیی نائیسلامیی و نەفامییە.

---

(١) کوان: دوومەڵ.

www.alibapir.com



ئیسلام ڕێ لە هیچ ئینسانێك ناگرێ، كە گەل و نیشتمانەكەی خۆی خۆش بوێ و پێی هەڵابڵێ، چونكە ئیسلام دەزانێ، كە سۆزی مرۆڤ سەبارەت بەگەل و نیشتمانی، شتێكی ڕەسەنە لە سروشتی دا، بەڵام بە دوو مەرجی گرنگ:

**(أ)** خۆشەویستییەكە لە ئەندازەی ماقووڵی خۆی دەرنەچێ و، لەسەر حیسابی لایەنەكانی دیكە نەبێت، سادەتر بڵێین: گەل و خاك و ئاوەكەی، نەكاتە بت و سەنەم و، لەجیاتی خوا نەیان پەرستێ.

**(ب)** لەو خۆشەویستیی و سۆزەیدا، لەمپەر و چەپەرێك دروست نەكات، كە ببێتە هۆی گۆشەگیركردن و دابڕانی گەلەكەی، لە كۆمەڵگای بەرفراوانی مرۆڤایەتیی، بە واتایەكی دیكە: نابێ سۆزی نەتەوایەتیی وای لێبكات، بەس خۆی بێتە بەرچاو و كەسی دی بە بیردا نەیەت و، لە قاوغ و قەپێلكی نەتەوایەتیی خۆیدا خۆی كوشمەڵە بكا و، هەست بە بوونی كەسی دیكە نەكات، یان ئەگەر هەستیشی پێبكات، بە كەم و كورت و ناتەواوی حسێب بكات.[1]

---

(١) دەتوانین بڵێین: مەسەلەی خۆشویستنی گەل و نیشتمانیش، وەك زۆر مەسەلەی دیكە، پێنج حوكمە شەرعییەكان (الأحكام الشرعية الخمسة)ی بەسەردا دەچەسپێن، چونكە:

١- لە حاڵێكدا خۆشویستنی گەل و نیشتمان و بەرگریی لێكردنیان، مەرج و پێویست بێ بۆ شتێكی فەرز و پێویست، وەك بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوا، ئەوە پێویست (فرض) دەبێ، چونكە (ما لا يتم الواجب إلاّ به، فهو واجب).

٢- لە حاڵێكدا، كە بەڕێوەبردن و هێنانەدی سوننەتێك، پەكی لەسەر خۆشویستن و پاراستنی گەل و نیشتمان بكەوێ، بۆ وێنە: مرۆڤ بۆیە گەل و نیشتمانەكەی خۆی خۆش بوێن، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای كردوە، ئەوە دەچێتە قاڵبی سوننەت(مندوب)ەوە.

٣- بەڵام ئەگەر هیچ حوكمێكی پێویست، یان سوننەت پەیوەندیی بە خۆشویستنەوە نەبێ، ئەوا هەر لەسەر ئەسڵی خۆی، كە (إباحة)یە دەمێنێتەوە، چونكە (الاصل في الأشياء: الإباحة).

٤- بەڵام ئەگەر خۆشەویستییەكە سەری كێشا، بۆ شتێكی ناپەسەند (مكروه)، وەك بەچاكتر دانانی گەلەكەی و ئیمتیاز پێدانی بەسەر گەلانی دیكەدا، بە مەرجێك نەگاتە ڕادەی دەمارگیریی و ڕەگەزپەرستی، دەنا حەرام دەبێ، ئەوا ئەو جۆرە خۆشەویستییە، حوكمی ناپەسندی (كراهية) وەردەگرێ.

٥- ئەگەر خۆشەویستییەكە، مرۆڤی پەلكێش كرد بۆ شتی حەرام، وەك: (سوێند پێخواردن) و (وەك ئایین لەقەڵەم دان) و (دەمارگیریی و ڕەگەزپەرستیی) و...هتد. ئەوا لەو حاڵەتەدا خۆشەویستییەكە حەرام دەبێ و، جاری وایە دەبێتە هۆی كافر بوون و لە ئایین وەرگەڕانیش.

www.alibapir.com



**یاسای شەشەم:** پێوەری گەورە و بچووکیی و، تەرازووی گرانیی و سووکیی ئینسانەکان لە ئیسلامدا، بەس تەقوایە.

بە واتایەکی دیکە: گۆڕەپانی ئەسپ تێدا تاودانی ئینسانەکان، لە پێشبڕکێ (مسابقة)ی ژیانی دنیایاندا، بریتییە لە پابەندیی بە بەرنامەی خواوە.

ئەم یاسایەش لە ڕستەی: (إن أكرمكم عند الله أتقاكم)[1] دەستگیر دەبێ.

ئنجا برادەران! ئەم یاسایە، یەکجار گرنگ و بەرزە و، پێویستیی بە سەرنج لێدان و تێوەڕامانێکی ورد و قووڵ دەکات، چونکە:

خوای بەرزومەزن ئیسلامی بۆیە نارد، تاکو مرۆڤایەتیی لە چنگ ئەو پێوەرە لەنگ و لاتەڵ و گچکانە ڕزگار بکات، کە بیروبۆچوون و هەوا و ئارەزووی مرۆڤانەی خۆیان، پەیدای کردوون، بۆ کێشانە و پێوانەی شتان.

هات تاکو لێیان حاڵی بکات، کە هیچ کام لە: (جینس و ڕەگەز و نەتەوە و دارایی و ڕەنگ و زمان و وەچاخ و بنەماڵە و...هتد). بۆ ئەوە ناشێن بکرێنە پێوەری هەڵسەنگاندن و نرخاندنی چاکیی و خراپیی ئینسانەکان.

هات تاکو تێیان بگەیەنێ، کە هیچ کەس ئیمتیاز و زیادیی بەسەر یەکێکی دیکەدا پەیدا ناکات، لە سۆنگەی ئەوەوە کە:

---

ئەمەش چەند نموونەیەك، لەو قسە و تەعبیرانەی، کە بوونەتە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری زۆر کەسی (کورد پەروەر!!) و دەبنە هۆی گوناهباربوون و، بەڵگەی لە ئیسلام و شەرع بێهەواڵ بوونی خاوەناکیانیشن: (سوێند بە کوردستان، بەسەری فلان کەس،(*) بە گۆڕی فلان کەس، دینمان ئایینمان، هەر نیشتمان، ...هتد.

(*) کە سەرکردەیەکی نیشتمانیی، یان هەرکەسێکی دیکە بن، چونکە سوێند بە غەیری خوا و سیفەتەکانی، شیرکە.

(١) {التقوى: جعل النفس في وقاية مما يخاف، وفي اصطلاح الشرع: حفظ النفس عما يؤثم}، واتە: (تقوى) لە زماندا، خۆپاراستنە لەو شتانەی، کە جێی مەترسیین، لە زاراوەی شەرعیش دا، بریتییە لە خۆپاراستن لەو شتانەی کە ئینسان پێیان تاوانبار دەبێت.. تەماشای (معجم مفردات ألفاظ القرآن)ی راغب الأصفهاني بکە، ل٥٦٨.

www.alibapir.com



- نێرە و مێ نییە، یان مێیە و نێر نیە.

- ئارییە و سامیی نییە، یان سامییە و ئاریی نیە.

- عەجەمە و عارەب نییە، یان عارەبە و عەجەم نیە.

- دەوڵەمەندە و نەدار نییە، یان نەدارە و دەوڵەمەند نیە.

- سپییە و ڕەش نییە، یان ڕەشە و سپیی نیە.

- بە عارەبی دەدوێ و بە کوردیی نا، یان بە کوردی دەدوێ و بە عارەبی نا.

- شێخ و سەییدە و، ڕەشۆکیی نییە، یان ڕەشۆکیی یە و شێخ و سەیید نیە.

- ئاغا و بەگە و مسکێن نییە، یان مسکێنە و ئاغا و بەگ نیە.[١]

بەڵێ! ئیسلام هات، تاکو لە گوێی هەموو مرۆڤایەتیی بچکێنێ، کە لەسەر بنچینەی: (جینس و ڕەگەز و نەتەوە و ئابووریی و ڕەنگ و زمان و بنەماڵە و... هتد)، ڕەوا و ماقووڵ نییە، دەستەیەك باڵاتر دابنرێ، لەباقی خەڵك، چونکە هیچ کام لەو پێوەرانە، کەڵکی ئەوە ناگرێ، چاکیی و خراپیی و بەرزیی و نزمیی، مرۆڤایەتیی پێ بزانرێ، بەڵێ ئەو ڕێچکە و کوێرە ڕێیانەی، کە بە بۆچوونی ئەوان، ئینسان لە ئاژەڵ بەرزتر و چاکتر نییە، ڕێی تێدەچێ ئەو پێوەر و تەرازووانە بۆیان دەست بدەن، چونکە مرۆڤ، کە لە ئاژەڵ جوێ نەکرایەوە، هەموو ئەو خەسڵەتە تایبەتییانەی، کە ئیمتیازی بۆ پەیدا دەکەن بەسەر ئاژەڵدا، لەدەستیان دەدات، ئەو کاتیش هەر ئەو خەسڵەتانەی تێدا دەمێنێتەوە، کە ئاژەڵەکان تێیاندا بەشدارن، ئنجا ئەو کات، ئەو پێوەرانە: هەروەك چۆن بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ئاژەڵانیان دەست دەدا، بۆئەو جۆرە مرۆڤانەش، دەست دەدەن و دەگونجێن!!

---

(١) لەڕاستیدا هەرکام لە زاراوەی: شێخ، ئاغا، بەگ، لەلایەکەوە و زاراوەی: مسکێن، ڕەشۆکیی، لەلایەکی دیکەوە، لە فەرهەنگی ئیسلامدا نین و، لە ڕژێمی قریی و پریی و چینایەتییدا، لەدایك بوو ون، هەڵبەتە وشەی: (المسکین) لە قورئاندا هەیە، بەڵام لە قورئانێدا مەبەست بابای نەدارە، نەك نیوەکاری ئاغا و میر و شێخ !!

www.alibapir.com



بەڵێ! ئەو کات هەروەك چۆن بۆت هەیە بڵێی: گا و ئەسپ، لە مانگا و ماین چاکترن، چونکە بەهێزتر و بەدەوترن، بۆشت هەیە بڵێی: پیاو لە ئافرەت باشترە، چونکە بەهێزترە و بەکارترە.

هەروەها بۆت هەیە بڵێی: ئینسانە سپی پێستەکان، لە ڕەش پێستەکان باشترن، هەروەك چۆن مراویی سپی، لە ئی ڕەش بەڕمێن تر و چاکترە!

من نازانم کەسێك هەر کەمێك ژیری و لێکدانەوەی هەبێت، چۆن بەم جۆرە هەڵسەنگاندنە ڕازیی دەبێت.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئیسلام لە هیچ کام لەو پێوەرانە ڕانابینێ، بتوانن چاکیی و خراپیی و بەرزیی و نزمیی، مرۆڤەکان بخەنە ڕوو، هەرهەموویان بە کەم و کورت و هەڵە و پەڵە لە قەڵەم دەدات.

ئێستاش با بچینە سەروکاری بەرنامەی خوا و، بزانین پێوەری هەڵسەنگاندنی مرۆڤەکان، لەوێدا چییە:

**بەکورتیی دەڵێین:**

پێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسان و نرخاندنی، لە بەرنامەی ئیسلام دا، هەر خودی ئینسانە و هیچی دی!!

بەڵێ، ئیسلام کە نەمامی دەستنێژی خوایە، سەیری ئەوە ناکات، داخۆ ئەو ئینسانە، نێرە یان مێیە، ئاریی یە، یان سامیی، کوردە یان تورك، دارایە یان نەدار، سپییە، یان ڕەش، فارسیی زمانە، یان هیندیی، شێخە یان ڕەشۆکیی، بەڵکو جێی تێوەڕامانی ئیسلام، بەس خودی ئینسان خۆیەتی بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێکی دیکە.

بۆیە ئیسلام، کەسایەتیی و خودی ئینسان، لەبیرو باوەڕ و ڕەفتار و کردارەکانیدا دەبینێ، تاقە بیرو بیروباوەڕ و ڕەفتاریش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە، کە خوای زانا بە (محمد)دا (صلی الله علیه وسلم) ناردوویەتی.

www.alibapir.com



کەواتە: مەیدانی پێشبڕکێ و تەرازووی هەڵسەنگاندن، بریتییە لە (مسوڵمانەتیی)، کە لەم ئایەتە بەڕێز و پیرۆزەدا، وشەی (تقوی)ی بۆ بەکارهێنراوە و، هەر کەسێك مسوڵمانتر بێ و زیاتر گەردن کەچی پەیڕەوی خوا بێت، مرۆڤێکە چاکترە و لەلای خوا ڕێز لێگیراوترە، بەپێچەوانەشەوە: هەتا مرۆڤ نامسوڵمان تر بێ و کەمتر پابەندی ئایینی خوا بێت، مرۆڤێکی خراپترە و لەلای خواش بێنرختر و سووك ترە.

ئێستاش، کە زانرا پێوەری پێوان و تەرازووی کێشانی مرۆڤان، لە ئیسلامدا چییە! با بزانین هۆی هەڵبژاردنی ئەو پێوەر و تەرازووە چییە؟!!

ئیسلام، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە مرۆڤێك دانەناوە، هەوا و ئارەزوو بیخاتە بەر تین و تەوژمی خۆیەوە و، کەڕەتێك بەلای پیاودا[1] بیشکێنێتەوە و، جارێك بەلای ئافرەت[2] دا، یان جارێك بەلای فلانە ڕەگەزدا ڕای بکێشێ و جارێك بەلای فیساردا، یان دەمێك بەلای فلان گەلدا پاڵی بدا و، دەمێك بەلای فیساردا، یان کەڕەتێك بەلای چینی بورژوادا تاوی بدا و، کەڕەتێك بەلای چینی پرۆلیتاردا، یان تاوێك بەلای فلان ڕەنگدا هەڵی پێچێ و، تاوێك بەلای فیساردا.. یان .. یان ...هتد.

نەخێر، ئیسلام مرۆڤ نەیناردوە، تاکو هەر جارە ڕەشەبای هەوا و ئارەزوو و بۆچوونی مرۆڤانەی، بەلایەکدا ڕاپێچی بکات.

بۆیە ئیسلام بۆ دەرخستنی باشیی و بەدیی و بەرزیی و نزمیی بەندەکان، زەمینە و گۆڕەپانێکی هێندە بەرین و فراوانی سازداوە، کە جێی هەموانی تێدا ببێتەوە، بەبێ جیاوازیی.

---

(١) وەك فەیلەسووفەکانی یۆنان دەیان کرد، تەنانەت لەوەدا مشت و مڕیان بوو، ئایا ئافرەتیش وەك پیاو ئینسانە، یان نا!!

(٢) وەك ئەوانەی کە بەناو لەسەر ئافرەت دەکەنەوە و بەرگریی لێدەکەن! ئەمما لە ڕاستییدا دەیانەوێ لە مرۆڤایەتی بیشۆرێنن و لە ڕەوشتی بەرزی بتۆرێنن!!

www.alibapir.com



... هەر کام لەو پێوەر و تەرازووانەی زادەی بیروبۆچوونی مرۆڤانن، وەك دەلاقەیەکی گچکە وایە، کە یەکێك لێیەوە تەماشای مەزرایەکی پان و بەرین دەکات، بەڵام لەبەر تەسکیی و گچکەیی، مەودای بینینی سەرتاپای مەزرایەکە نادا و، بەس گۆشە و سووچێکی لێ دەبینێ.

با بزانین بۆچی؟

١- جینس بکە بە تەرازوو و پێوەر، هەرجارەی نیوەی مرۆڤایەتیی تێدەچێ.

٢- ڕەگەز بکە بە پێوەر، تاوێك ئاریی دادەکەون، تاوێك سامیی و...هتد.

٣- نەتەوەپەرستیی بکە بە سەنگی مەحەك، مرۆڤایەتیی دەبێتە هەزار و یەك دەستە و، وەك ئاردی نێو دڕکانی لێ دێ!

٤- هەرکام لە ئابووریی و ڕەنگ و زمان و وەجاخیش هەر بەو پێودانە.

بەڵام پێوەر و تەرازووی ئیسلام، وەك پەنجەرەیەکی گەورە وایە، کە لە یەك کاتدا دەتوانی سەر لەبەری مەزرایەکەی تێڕا بەدی بکەی و لێی ورد ببەوە، ئیسلام کە دەڵێت: کامەتان مسوڵمانتر و پارێزکارتر بن، ئەو کەسە لەلای خوا بەڕێزتر و لەپێش ترە، دیارە مەیدانی پێشبڕکە(مسابقة)ی مرۆڤەکانی هێندە بەرین کردوە، کە جێی هەمووانی تێدا دەبێتەوە، چ نێر بن چ مێ، چ ئاریی بن چ سامیی، چ عەجەم بن یان عارەب، چ دەوڵەمەند بن، چ نەدار، چ سپیی بن چ ڕەش، چ مسکێن و عەوام بن، چ ئاغا و شێخ.[1]

---

(١) دووپاتی دەکەینەوە کە وشەی: (ئاغا، شێخ، بەگ، میر، ڕەشۆکیی، عەوام، مسکێن) ئەگەر بەو ئیعتبارە بەکاربهێنرێن، خەڵك چین چین و توێژتوێژەو، هەندێکیان هەر بە ڕەچەڵەك وەجاخ بەرز و گەورەن!! وەك: (ئاغا و شێخ و میر و بەگ)ەکان و، هەندێکیش ئەگەر سەریان بگاتە کەهکەشانی فەلەك، هەر بە ڕەچەڵەك نزم و کەم و سووکن، کە: (مسکێن و عەوام و نەدار)ەکانن، ئەوا بێگومان هەر کام لەم ناوانە، بە هەڵە و بێمەعنا لەقەڵەم دەدرێن، چونکە وەك لە لاپەڕەکانی پێشوودا گوتمان: تەرازووی گرانیی و سووکیی و، سەنگی مەحەکی چاکیی و خراپیی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەس پارێزکاریی (تقوی) و مسوڵمانەتییە، لەبەر ئەوەی، کە ڕەچەڵەك و بەرەباب و باقی شتەکانی دیکە، وەك: ڕەنگ و زمان و سامان و...هتد. هیچیان بەویستی مرۆڤ پەیدا

www.alibapir.com



**یاسای حەوتەم:** لە وشەی (عند الله)ی نێو ڕستەی: (إن أكرمكم عند الله أتقاكم) وەردەگیرێ و، دەتوانین ئەوا تەعبیری لێ بدەینەوە: بەس پەروەردگار شیاوی ئەوەیە ڕێز لە بەندەکانی بگرێ، یان بە پێچەوانەوە: بێحورمەتیان بکات!

واتە: هەرکەسێك لە تەرازووی خوادا، جێی ڕێز و حورمەت و ئیتعیبار بوو، ئەوە جێی خۆیەتی بە ئینسانێکی چاك و بەڕێز دابنرێ و، هەرکەسێکیش لەلای خوا و بەپێی بەرنامەی وی، سووك و بێحورمەت بێ، ئەوە پێویستە بە سووك و بێنرخ، تەماشا بکرێ و، لەهیچ حاڵاندا سەرنجی ئەو شتانە نەدرێ، کە لە تەرازووی خوادا بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵکی، جێی ئیتعیبار نین.

خوای بەرز و مەزنیش، دەربارەی ڕێگا و چۆنیەتیی ڕێز و حورمەت وەدەست هێنان، فەرموویەتی:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ﴾ فاطر:١٠.

دەربارەی هۆی بێڕێزیی و بێقیمەت بوونیش، فەرموویەتی:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ

---

نابین و ئازایەتیی، یان نا ئازایەتی ئینسانیان تێدا نییە، ئنجا هیچ ماقووڵیش نییە، مرۆڤ بە شتێك خراپ، یان چاك بێ، کە هیچ دەستی لە بوون و نەبوونی دا نەبووە!!

بەڵام ئەگەر بەو ئیعتیبارە بەرکاربهێنرێن، کە ئەم ناوانە چەند ئیتعیبارێکی عورفیی نێو کۆمەڵگان و، هیچ پەیوەندییان بە چاکیی و خراپیی خاوەنەکانیانەوە نییە، ئەوە ئاساییە، بەڵام نابێ لەوەش بێهەواڵ بین، کە وشەی (شێخ)، کە کاتی خۆی ڕەواجی پەیداکردوە، نازناوی ئەو مامۆستا و ڕابەر و چاوساغە خواییانە بووە، کە میراتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان پاراستوە و خەڵکیان ڕێڕوونیی کردووە، دیسان وشەی (ئاغا، میر، بەگ) شۆرەت و نازناوی ئەو براگەورە و فەرمانڕەوایانە بوو ون، کە خەڵك لەنێو خۆیاندا هەڵیان بژاردوون، تاکو سەرپەرشتییان بکەن، بەڵام دوایی ئەرکی هەر کام لە: شێخ و میر و بەگ و ئاغا، بۆتە شتێکی میراتیی و کراوەتە ئامراز (وسیلة)ی خۆ پێژیاندن و، خەڵك چەوساندنەوە و فیرعەونایەتیی کردن. (هەڵبەتە بێجگە لە چەند حاڵەتێکی کەم و ڕیزپەڕ).

www.alibapir.com



﴿وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ﴾ الحج:١٨.

وەك دەبینین لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (فاطر)دا، خوای زانا، بێ پێچ و پەنا خستوویەتە ڕوو، کە هەرکەسێك بەدوای عیززەت و سەربەرزیی و ڕێز و حورمەتی دنیا و دوارۆژدا دەگەڕێ، با بزانێت، کە هەمووی لەلای خوایە!

**ئنجـا ڕێگای وەدەستهێنانیشی، لەدوو شتاندا، دەخاتە ڕوو:**

**یەکەم:** قسەی چاك (الكلم الطيب)، کە زۆربەی توێژەرەوان گوتویانە: وشەی خوا بەیەکگرتن (كلمة التوحيد)ە، واتە: (لا الله الا الله).

**دووەم:** کردەوەی چاك (العمل الصالح)، کە بریتییە لە: ڕەفتار بە گوێرەی (لا اله الا الله)!!

لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سوورەتی (الحج)یشدا، دوای ئەوەی ڕایدەگەیەنێ، کە تێکڕای بوونەوەر، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و شاخەکان و درەخت و گیاندارەکان و، زۆر لە خەڵکی، فەرمانبەریی خوا دەکەن و کڕنووشی گەردن کەچیی بۆ دەبەن، دوای ئەوەی دەیخاتە ڕوو، کە زۆر کەسیش هەیە لەخوا یاخیی دەبێ و خۆی بەزل دەگرێ و، کڕنووش بۆ خوا نابات و، بەو ڕەفتارەشی خۆی وا لێدەکات: شایستەی سزا و جەزرەبەی خوا بێت و، تووشی زەبوونیی و ڕیسوایی دنیا و دوارۆژ بێ و، دەفەرموێ: [وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ] هەرکەسێك خوا زەبوونی بکات، هیچ کەس نییە ڕێزی لێ بنێ!

www.alibapir.com



**کەواتە بەڕێـــزان!**

ئەوەی، کە ئیسلام کردوویەتی بە لووتکەی هەرەبەرزی ئامانجی پێشبڕکەی مرۆڤەکان و، بە مایەی سەربەرزیی و ڕووسووریی دنیا و دوارۆژان، بریتییە لە: وەدەست هێنانی ڕێز و حورمەت و قەدر و قیمەت لە خزمەت خواو، تاقە ڕێی وەدەست هێنانی ئەو ئامانج و مەبەستە بەرز و پیرۆزەش بریتییە لە: پەرستنی پەروەردگار - پارێزکاریی و کڕنووش بۆ بردنی و فەرمانبەریی بۆ کردنی-.

ئنجا گومانیشی تێدا نییە، کە ئامانجی ناوبراو و ڕێگای پێگەیشتنیشی چەند شتێکن، هەموو کەس دەستی وێڕا دەگەن و، هیچ کەسیش زیاتری بەش پێوە نین و بۆ هەموو کەس وەك یەکن.

کەواتە: هەرکەسە دەتوانێ ئازا بێ و پشك و بەشی زیاتر بۆ خۆی بڕ بدات و پلە و پایەی بەرز لەلای خوا دەستگیر بکات!

بەڵێ، خێر و خۆشیی و بەختەوەریی دنیا و قیامەت، لە گرەوی خواپەرستیی و بەندایەتییدایە، هەروەك پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ أَحَبَّ ان يكون أقوى الناس، فليتوكَّلْ على الله تعالى، وَمَنْ أحبَّ أن يكون أغنى الناس، فليكن بما في يد الله عز وجل، أوثق منه بما في يديه، وَمَنْ أحبَّ أن يكون أكرم الناس، فَلْيتَّق الله عز وجل.)) رواه ابن أبي حاتم.

واتە: کێ پێی خۆشە بەهێزترین کەس بێت، با پشت بە خوای بەرز ببەستێ، کێ پێی خۆشە دەوڵەمەندترین کەس بێت، با بەوەی، کە لە دەستی خوای بەرز و مەزن دایە، متمانەدارتر بێت لەوەی، کە لەدەستی خۆی دایە و، کێ پێی خۆشە لە هەموو کەس بەڕێزتر بێت، با پارێز لە خوای بەرز و مەزن بکات.

www.alibapir.com



**ئنجا بەڕێـــزان!**

ئێستا کە لە تەفسیری ئەو ئایەتە بەپێزە بووینەوە، کە لە پێشەوە گوتمان: بەپشتیوانیی خوا: وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەدەینەوە، کە سەر بە مەسەلەی نەتەوایەتین، حەز دەکەم بەر لەوەی بۆ دوایین جار لێك جیا ببینەوە و، کۆتایی بە وتووێژەکەمان بێنین، بەخێرایی چاوێك بەو قسانەدا بگێڕینەوە کە تا ئێستا کردوومانن و، ئنجا لە کۆتاییدا ڕامێنین و بزانین، چ ئەنجامێکی سروشتیی و ژیربێژییان لێوەردەگیرێ.

گوتیان: فەرموو فەرموو!

گوتم: دەتوانین پوختەی ئەو قسانەی، تا ئێستا کردوومانن، لە چەند خاڵێکدا بخەینە ڕوو:

**پوختەی قسان لە چەند خاڵێکدا:**

**یەکەم:**

کاتی خۆی، کە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) هاتوونە نێو نیشتمانی کورد و غەیری کوردیش، وەك داگیرکەر و چەوسێنەرێك نەهاتوون، کە ئامانجیان خۆ تێرکردن و گیرفان پڕکردن بوویێت، بەڵکو وەك خواپەرست و مرۆڤ دۆستێکی بە ویژدان و، ڕەوشت بەرز و ئاشتیی خواز و، بەئومێدی ڕزگارکردنی چەوساوە و بەشخوراوان، لەژێر نیری تاغووت و ستەمکاران، بە مەبەستی ڕازیی کردنی خوا و چەسپاندنی حوکمی ئیسلام و خەڵکی پێکەوە کردنە برا، هاتوون.

**دووەم:**

ئیسلام نەك هەر کاری خراپی نەکردۆتە سەر گەلی کورد و گەلانی دیکەش، بەڵکو بە پێچەوانەوە: لە هەموو جۆرە بێسەرەدو بەرەیی و ناڕێکیی و خراپەکارییەك، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ڕزگاری کردوون:

www.alibapir.com



**أ)** لە بواری پەرستندا: ڕزگاری کردوون لە بت پەرستیی و ئەفسانەدۆستیی و، گەیاندوونییە بن سێبەری درەختی بەرزی پڕ بەپیت و پیّزیی: خواناسیی و زانست دۆستیی.

**ب)** لە بواری ڕامیارییدا: لە پەرتەوازەیی و هەزار پارچەیی و بێقەوارەیی ڕزگاری کردوون و، هەمووی لەسەر یەك زەمینە بەپێی یەك بنەڕەت و بنچینە، کردوونە برا و کۆی کردوونەوە و، یەك ئوممەتی مەزنی لێ پێکهێناون.

**ج)** لەبواری کۆمەڵایەتییدا: لە چینایەتیی و ڕەوشت نزمیی و، ئافرەت کردنە کۆیلە و زیندەبەچاڵ کردن و، هەزار و یەك دەردی دیکەی ڕزگارکردوون و پاکی کردوونەوە.

**د)** لە بواری ئابووریدا: لە قڕیی و پڕیی و یەکدی چەوساندنەوە و هەژار ڕووتاندنەوە، قوتاری کردوون و، خستوونییە ژێر سێبەری حوکمێکی ئیسلامییانەی پڕ لە دادگەریی و خێر و خۆشیی.

هەروەها لە هەموو بوارەکانی دیکەی ژیاندا.

**سێیەم:**

هەبوونی چەند کەسێکی ترسنۆك و دنیاپەرست و بێ بڕست، لەنێو زانا و پێشەوایانی ئیسلامدا، بەهیچ ڕەنگێك ڕەوا نییە، بکرێتە بەڵگەی خراپیی ئیسلام و لەبەرچاو کەوتنی زانا و پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام.

**چوارەم:**

بەرنامەی ئیسلام، نەك هەر ڕێ لە مرۆڤ ناگرێ، کە نیشتمان و گەلی خۆی خۆش بوێ و بیانپارێزێ، بەڵکو ئەمەی لە سەریش پێویست دەکات و لێشی داوا دەکات! بەڵام بە مەرجێك ئەو خۆشەویستییە لە ئەندازەی سروشتیی خۆی تێنەپەڕێ و نەبێتە بتپەرستیی.

www.alibapir.com



**پێنجەم:**

لەڕوانگەی ئیسلامەوە، گەل و تیرەکان هەموویان یەکسانن و، هیچ گەل و تیرەیەك بۆی نییە بەنیازی ستەم کردن و چەوساندنەوە، پێ بخاتە لە سنووری نیشتیمانی گەل و تیرەیەکی دیکە.

**شەشەم:**

لەڕوانگەی ئیسلامەوە دروست نییە، هیچ کام لە ڕەگەز و نەتەوە و ڕەنگ و زمان و دارایی و ڕەچەڵەك، بکرێتە پێوەری پێوان و تەرازووی هەڵسەنگاندنی ئینسانەکان، بەڵکو تەنها خواناسیی و مسوڵمانەتیی و پارێزکردن و چاکەکاریی، سەنگی مەحەکی چاکیی و گەورەیی بەندەکانە.

**حەوتەم:**

بەرزترین ئامانجی مرۆڤ لەم ژیانەیدا، بریتییە لە وەدەست هێنانی ڕێز و پایەی بەرز و ڕەزامەندیی لەلای خوا.

وەدەستهێنانی ئەم ئامانجەش، پەیوەستە بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە، کە خوای زانا بۆیی دیاریی کردوە، واتە: ئەرکی جێنشینایەتیی، بەهۆی پارێزکاریی و گەردن کەچیی و فەرمانبەرییەوە.

ئێستاش با بزانین، ئەنجامی سروشتیی و مەنتیقیی ئەمەی ڕابرد، چییە؟!

www.alibapir.com



## ئەنجامی مەنتیقیی ئەم وتووێژە :

تاقە ئەنجامی سروشتیی و ژیربێژیی (منطقي)یانەی ئەوەی ڕابرد، ئەمەیە کە:

١- ئایین و بەرنامەی خوا، تاقە بەرنامەیەکی ڕاست و هەمەلایەنەی ژیانە، بۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتیی، بەبێ جیاوازیی، هەتا دنیا دنیایە.

٢- بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ و توانیویەتی، کە هێمنیی و ئاسایش و دادگەریی و تەبایی و یەکسانیی و، خۆش گوزەرانیی و ڕەوشت بەرزیی، بۆ بەرەی ئادەمیزاد بهێنێتە دی.

٣- بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ و توانیویەتی، قەڵای کوفر و زۆرداریی بڕووخێنێ و، مافی خوراوی چەوساوان بستێنێ و، تاغووت و فیرعەونان لە ڕیشەو بیخەوە دەرێنێ و بەرەو زبڵدانی مێژوو بیانڕەتێنێ.

٤- تاقە بەرنامەیەکە، کە بتوانێ ڕێز و حورمەتی زۆر و پلە و پایەی بەرز و، ڕەزامەندیی لەلایەن خواوە، بۆ مرۆڤ فەراهەم بێنێ.

**بەکورتـــیی:**

ئیسلام تاقە بەرنامەیەکە، کە بتوانێ مرۆڤ لە دنیا و دوارۆژدا، بە مراد بگەیەنێ و وەحەسێنێ.

کەواتە: با تەنها ڕوو بکەینە خوا و بەرنامەکەی، با بۆ چارەسەرکردنی هەموو گیروگرفتێك و بۆ دەرمان کردنی هەموو دەردێکمان، بەس پەنا بەرینە بەر خوا و بەرنامەی خوا، بەڵکو وێڕای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان و سارێژ بوونی برینەکان و لاچوونی دەردان و، سەربەرزیی لە ژیانی دنیادا، ڕەزامەندیی خوای زانا و بەرز و قسەلەجێ و کارزانیش، لە ژیانی دوارۆژدا وەدەست بێنین.

با چاکیش بزانین: کە هەرچی ڕێچکە و بیردۆزە و کوێرە ڕێی مرۆڤکرد هەن، تێکڕا کۆبکرێنەوە، بە هەموویان ناتوانن، نەگەلی کورد و نەهیچ گەلێکی

www.alibapir.com



دیکەش بە ئامانج بگەیەنن و، لەمەینەتیی دەری بێنن، چونکە ئەو بیردۆزە دەستکردانە بۆ خۆیان دەردن، جا نازانم کەی دەرد بە دەرمان دانراوە؟![1]

**قسەی کۆتایی دانیشتووان :**

خوا پاداشتت بداتەوە، بەڕاستیی چاکمان ماندوو کردی، بەڵام ئیشەڵڵا ماندووبوونەکەت بە خۆڕایی نەبووە، چونکە بێگومان زۆر شت، کە پێشتر بەبەراوەژوودەوە لێی حاڵی بووبووین، بۆت ڕاست کردینەوە و، زۆر گرفت و گرێکوێرەی چەند ساڵەت بۆ کردینەوە و، پاش ئەوەی مەودایەکی زۆر لە پەروەردگاری بەخشندە و بەدەستەڵات دوور کەتبووینەوە، وات لێکردین لێی نزیك بکەوینەوە و، سەر لەنوێ بە بەرنامە و ڕێبازی خوای بێهاوتات ئاشنا کردینەوە و، پێکەوە ئاشتت کردینەوە، دڵ و دەروونی ڕەش داگەڕاو و بەگومانی بەد و، دوودڵیی بێجێ تەنراومانت، سپی کردەوە و، لە چڵك و چەپەری پیسی ڕێچکە و بیردۆزە پەرستیی، شۆردەوە و پاککردەوە.

بەڵام ئێمەش لە کۆتاییدا داوایەکمان هەیە، ئومێدەوارین لێمان وەربگری.

گوتم: فەرمووون! هەر لەتوانامدا هەبێت، بێدڵییتان ناکەم و بۆتان جێبەجێ دەکەم.

گوتیان: بێگومان تۆش لەئێمە چاکتر دەزانی، کە لەنێو گەلەکەماندا هەزاران کەسی وا هەیە، کە وەك ئێمە دڵی لەو جۆرە گرفت و گرێکوێرانە پڕ بووەو مێشکی بەو جۆرە ئەفسانە و بیرە پووچانە ئاخنراوە، جا بۆیە بە پەسندی دەزانین، کە ئەم وتووێژە بنووسرێتەوە و چاپ بکرێ، بۆ ئەوەی هەرکەسێك، کە

---

(١) پێغەمبەری ڕابەرمان (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((إن الله تعالى لم يجعل شفاءكم فيما حَرَّم عليكم)) رواه الطبراني عن أم سلمة ورمز السيوطي لصحته. واتە: بێگومان خوای بەرز، شیفا و چارەسەری ئێوەی لە شتێکدا دانەناوە، کە لێی قەدەغە کردوون.. بڕوانە (فيض القدير) ب٢ ل٢٥٢.

www.alibapir.com



بەمەرەدی ئێمە چووە و ڕێی لێ تێکچووە، وەك ئێمە گرێ و گرفتەکانی دڵ و مێشکی لاچن و، بگەڕێتەوە نێو باوەشی بەرنامەی خودا.

گوتم: بەچاوان، هەرچی لە توانامدا هەبێ لەو بارەوە دەیکەم.

منیش لە کۆتاییدا دەڵێم: سوپاستان دەکەم و خوا ڕێڕوونییتان بکات و، لە تاوانەکانی ئێوە و منیش ببوورێ و، لوتف و بەزەیی خۆیتان لەگەڵدا بنوێنێ، دڵتان بەلای خۆیدا بهێنێ و زیاتر ڕێچکە و کوێرە ڕێی ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاوایی و خۆماڵییەکانتان لەبەرچاو ببێزرێنێ، چونکە بە مەبەستی لە هەق حاڵی بوون، لەگەڵم دانیشتن و بە ویژدانەوە گوێتان گرت و، لە ئاقار وەرگرتنی ڕاستییدا ملەجیرە و لاسارییتان نەکرد.

"هەڵبەتە، تاکو ئەنجامی قسان بەمە گەیشت، شەوگار دەمێك بوو، بەتارییکی ئەنگوستەچاوی خۆی، هەموو کەلێن و کونی پڕ کردبوون و، دیاربوو چاوەڕوانیی ئێمەی دەکرد، کە چیدی شەونخوونیی نەکێشین و لە بن باڵی هێدیی و ئارامیدا بخەوین خوا هەقە، ئێمەش بێدڵییمان نەکرد و لێی نووستین".

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١- مەبەستمان لە زاراوەی نەتەوایەتیی چییە؟!

ئێمە لە بەکارهێنانی وشەی (نەتەوایەتیی)دا، مەبەستمان ئەو چەمك و مانایە نییە، کە زاراوەی (ناسیۆنالیزم) دەیگەیەنێ.

(ناسیۆنالیزم، یانی نەتەوە و نیشتیمان پەرستیی).[1]

چونکە وەك پێشتر ڕامانگەیاند: ئیسلام لەگەڵ نەتەوەپەرستیی و نیشتیمان کردنە بت و سەنەمدا، نییە و پێکەوە هەڵناکەن، لەبەر ئەوەی نەتەوەپەرستیی،

---

(١) وشەی (ناسیۆنالیزم) وشەیەکی لاتینییە، چونکە (ناسیۆ) و (نیتۆس) واتە: شوێنی تێدا لەدایك بوون، کە وشەی نەتەوەپەرستیی و نیشتمان پەرستیی، مانای پڕ بەپێستی ئەو وشەیە.

هەڵبەتە لێکۆڵەرەوان و سیاسەتمەداران، پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ وشەی ناسیۆنالیزم داناون، بۆ وێنە:

١- {کارلتون هیس} دەڵێ: ((نەتەوە، کۆمەڵێکی سەربەخۆی سیاسییە، کە بیروباوەڕ و کلتوورێکی هاوبەشی هەیە)).

٢- {بوبگی} دەڵێ: ((گەل، کۆمەڵە خەڵکێکە، کە خاك و ئاو و خوێن، یان زمان، یان کلتوور و مێژوو پێکەوە گرێیان دەدەن)).

٣- {هانس کوهن} دەڵێ: ((هەست و نەستی قووڵی خۆشەویستیی، سەبارەت نیشتیمان و بە ئەمەگیی بێسنوور و، هاوبەشیی کردن لە دیارییکردنی چارەنووسیدا، بنچینەی ناسیۆنالیزمە، ناسیۆنالیزم کاتێك بە ڕەسەن دادەنرێ، کە هیچ شتێك نەتوانێ ببێتە پەرچ لە ڕێی وەفادارییی لە پێناوی نیشتیماندا))!!

٤- ئینسکلۆپیدیا (دائرة المعارف)ی ئەمریکیی دەربارەی ناسیۆنالیزم دەڵێ: ((لە چەمکە سەرەکییەکانی ناسیۆنالیزم بریتییە لە: وەفاداری و خۆشەویستیی سەبارەت بە گەل، زیاتر لە هەر شتێکی دیکە، لە دروشمەکانی دیکەی ناسیۆنالیزم (القومية)، شانازییکردنە بە بەرهەمە نەتەوایەتییەکانەوە و، بڕوابوونێکی قووڵ بە لێهاتوویی نەتەوە و، تەنانەت بەرزیی و گەورەیی وی بەسەر گەلانی دیکەدا)). بڕوانە (إسلام ومليگرائی)ی دکتۆر محمد نقوي، ل٥٠-٥٢.

www.alibapir.com



یەکسەر لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامییدا دژن و تێك دەگیرێن، ئاخر لە بیری نەتەوەپەرستییدا، نەتەوە و نیشتیمان، وەك خوا، دەکرێنە پەرستراو، یان لایەنی کەم دەبرێنە ڕیزی خوا، بێگومان لەئەنجامی ئەوەشدا، لە حاڵەتی یەکەمدا کوفر و لە هی دووەمدا: هاوبەش پەیداکردن (شرك) ڕوودەدات، هەردووکیشیان گەورەترین تاوانن و هەڵوەشێنەرەوەی شایەتمانن.

کەواتە: ئێمە لە بەکارهێنانی زاراوەی نەتەوایەتییدا، مەبەستمان پێی ئەو هەست و سۆزە سادەیەیە، کە هەڵقوڵاوی سەرچاوەی سروشتی ساغی مرۆڤە، بەواتایەکی دی: مەبەستمان لە نەتەوایەتیی، نیشتیمان دۆستیی و گەل خۆشویستنە و هیچی دی.[1]

جیاوازیی نێوان سۆز و خۆشەویستیی نەتەوەیی، ئیسلامانە و نائیسلامانەش ئەوەیە، کە لە حاڵەتی یەکەمدا: سۆز و خۆشەویستییەکە لە سنوور و جوغزی غەریزەیی و سروشتی خۆی ناچێتە دەر، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا: لاقان لەبەرێ تێدەپەڕێنێ و دەبێتە بیروبڕوا (ئیدۆلۆژیی)، ئەوکاتیش لەگەڵ بیروبڕوای ئیسلامییدا تێکدەگیرێن و، حەتمەن دەبێ یەکیان بۆ ئەوەی دیکە وەلا بنرێ!!

---

(١) وەك لە ڕابردووشدا گوتمان: دووپاتی دەکەینەوە: نابێ خۆشەویستی گەل و نیشتمانیان لەسەر حیسابی ئیسلام بێت، واتە: نابێ گەلێکت خۆش بوێ، کە لە ئیسلامەتییدا هاوبەشییت ناکات و، وە نابێ سۆزی نیشتیمان وات لێ بکات، سەر بۆ ستەم و زۆرداریی کوفر نەوی بکەی و، دڵت نەیەت لە پێناوی پاراستنی بیروبڕوایەکەتدا، بەجێی بهێڵی، نا! بەڵکو دەبێ، کە زانیت ناتوانی مسوڵمانانە تێیدا بژی، هەروەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی، نیشتمانی ئازیزی خۆیانیان بەجێهێشت، تۆش بەجێی بهێڵی، بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆچکردن و نیشتیمان بەجێهێشتنەکەت، هەڵاتن و ڕاکردن نەبێت، بەڵکو بۆ خۆ کۆك کردن و ڕیز پتەوکردن و دووبارە گەڕانەوە و سەرکەوتن بێت، ئنجا گومانیشی تێدا نییە، کە بابای مسوڵمان، هەتا چاری بکرێ پێویستە خۆی ڕابگرێ و بەرهەڵستیی و بەرەنگاریی بکات.

کورتەی قسان ئەوەیە: کە بابای مسوڵمان، دەبێ ئامادەبێ هەرچی هەیەتی و، تەنانەت خۆیشی فیدای بەرنامەی خوا بکات، چ جای خاك و ئاو و نیشتیمانی و، لە ڕاستییدا خاك و نیشتیمانیشی هەر لەبەر ئەوە خۆش دەوێت، کە خواپەرستیی تێدا بکات و، ئایین و بەرنامەی خوای لەسەر پیادە بکات.

www.alibapir.com



## ٢ - سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوایەتیی، وەك بیروباوەڕ

سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوایەتیی (القومية) وەك بیروباوەڕێكی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی، دەگەڕێتەوە بۆ كاتی پاش ڕوودانی شۆڕشی فەڕەنسا.

(جان جاك ڕۆسۆ) بە یەكەمین هەڵگری پەیامی نەتەوایەتیی دادەنرێ، چونكە زۆر پێداگیریی لەسەر ئەوە كرد، كە دەبێ چین و توێژ و تیرە و هۆزەكانی گەل (شعب)، یەك بگرن و پاڵ وێك بدەن، دەبێ مرۆڤ زۆر بەتوندیی بەنیشتیمان و خاك و ئاوی خۆیەوە بچەسپێ، دەبێ نیشتیمان ببێتە چەق (مركز) و سووڕگە (محور)ی بیركردنەوە و، ئاوات و خولیای تاك و كۆمەڵ.

هەروەها (ڕۆسۆ) خۆشەویستیی گەل و نیشتیمانی، گەیاندە سەر حەدی پێویستی پیرۆزیی ئایینیی و، زۆر بە توندی بیروباوەڕی پەیوەندیی مرۆڤایەتیی و ئایینیی ڕەفز كرد.

وێڕای سەركەوتنی شۆڕشی فەڕەنسا، زۆربەی یاسا و بنچینە و تایبەتییەكانی بیری نەتەوایەتیی پەیدابوون، وەك:

١- وروووژاندنی هەست و نەست و سۆزی خەڵكی سەبارەت بەنیشتمان و ئاڵای وڵات.

٢- ڕێزدانان بۆ پاڵەوانە نەتەوەییەكان.

٣- دانانی سرووده نەتەوەییەكان.

٤- پێداگیرییكردن لەسەر پیرۆزیی زمان و ڕەگەزی فەڕەنسیی.

٥- داهێنانی ئاهەنگ و جێژنە نەتەوەییەكان لەسەر ڕچەی جێژنە ئایینییەكان.

www.alibapir.com


٦- شانازیی کردن بە مێژووی فەڕەنساوە.

٧- بڕوابوون بە پەیامی مەزنی گەلی فەڕەنسی.

هەموو ئەم پایە و بنچینە سەرەکیی و گرنگە نەتەوایەتییانە یەك لەدوای یەك، لە گەرمەی شۆڕشی فەڕەنسییدا پەیدا بوون.

دوایی لە ئەنجامی پەرەسەندنی دەسەڵاتی فەڕەنسیی لە ڕۆژئاوادا، بیری نەتەوایەتیی زۆر بەخێرایی وەك ئاگری نێو پووشێ، بڵاوبۆوە، پاشان بەهۆی دەرکەوتنی (ناپلیۆن)ەوە، شەپۆلی نەتەوایەتیی، هێندەی دیکە پەرەی سەند.

لە ئاکامی ئەمەشدا، گەلانی دیکەش دەماری نەتەوایەتییان بزووت و، لە هەرکام لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا، هەست و نەست و بیری نەتەوایەتیی سەری هەڵدا و، هاتە مەیدانی سیاسەت و ژیانی خەڵکەوە.

بەڵێ! سەدەی نۆزدەهەم بە چاخی زێڕینی نەتەوایەتیی (عصر القومية الذهبي) ناونراوە، چونکە لەو سەدەیەدا هەر کام لە: (جیفر سون) و (پین)، بنچینەکانی نەتەوایەتیی ئەمریکییان دامەزراند و، (جريمي بنتام)ی قەشە لە بەریتانیادا، چەند داڵانێکی دیکەی لە بیری نەتەوایەتییدا پەیدا کردن و، بەپەیدابوونی (وليام گلادستۆن)، بیری نەتەوەیی گەیشتە لووتکەی هەرە بەرزی و، وەك بیروباوەڕێك و ڕاپەڕینێکی فیکریی، سەرلەبەری ئەورووپایی مەرکەزیی و ڕۆژئاوای گرتەوە.

ئنجا هەرکام لە (گاریباڵد) و (مازینی) ئیتاڵیی و، (فیکتۆر هۆگۆ)ی فەڕەنسیی و (بسمارك)ی ئەڵمانیی، بە ڕابەر و بنیاتنەری بیری نەتەوایەتیی دادەنرێن.

www.alibapir.com



## ٣ - بیری نەتەوایەتیی لە ڕۆژئاوادا، بەرهەمی بێ بیروباوەڕیی بوو

گومانی تێدا نییە، کە ئینسان ناتوانێ بەبێ بیروباوەڕ بژی، ئنجا خەڵکی ڕۆژئاواش، ئایینی فەلەیی (الدين المسيحي)یان بە بیروباوەڕی خۆیان دەزانی، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئایینی ناوبراو بەدەستی قەشە و پاپایەکان و دەسەڵاتدارەکانەوە، زۆر دەستکاریی کرابوو و گۆڕا بوو، پاش ڕاپەڕینی زانیاری (ڕێسانس) و ئەو گۆڕانکارییانەی، کە بەدویدا هاتن، کڵێسا و پەیڕەوانی، چەند زەبرێکی زۆر گرچووبڕیان پێکەوتن و، ئیدی لەو ڕۆژەوە ئایینی فەلەیی لە ئەورووپادا، وەك بیروباوەڕێکی زیندوو لەنێو چوو.

ئنجا لەدواییدا: ڕۆژئاواییەکان، زیاتر ئایینی ناوبراویان لە مەیدانی ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی، دوور خستەوە، لە ئەنجامی ئەمەشدا، ئینسانی ئەورووپایی بۆشاییەکی زلی لە دڵ و مێشکدا دروست بوو، وەك پێشتریش گوتمان: ئینسان ناتوانێ بەبێ بیروباوەڕ بژی، بۆیە بت تاش (ئازەر)ی ئەورووپایی، ناچار بوو، کە بتی نەتەوایەتیی (صنم القومية) بۆ خەڵکەکە دابتاشێ و وەك ئایین و پەرستراوێکی نوێی ڕۆژئاوا، ڕای بنوێنێ!

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە بیری ناسیۆنالیزم، زیاتر وەك چوارچێوەیەکی خاڵیی و شتێکی بەتاڵ وایە و، دەبێ بە غەیری خۆی پڕ بکرێتەوە، بۆیە ڕۆژئاواییەکان، ناچار بوون دەست بکەن بە گەڕان و سووڕان بۆ پەیداکردنی کۆمەڵێك بیردۆزەی جۆراوجۆر، بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی بیری ناسیۆنالیزم، بەو جۆرە هەرکام لە: دیموکڕاسیی و سۆسیالیزم و لیبڕالیزم لەلایەك و، داریۆنیزم و فرۆیدیزم و مارکسیزم، لەلایەکی دیکەوە، ڕەواجیان پێدرا و، هەریەکەیان سووچێکی ڕێچکەی ناوبراویان پێ پڕکرایەوە.

www.alibapir.com



هەڵبەتە لێرەشدا، سادەیی و نەفامیی ئەو جۆرە خۆ بەڕۆشنبیرزانانەمان بۆ دەردەکەوێ، کە بە حوکمی لاساکردنەوەی کوێرانە، ویستوویانە و دەیانەوێ ئوممەتی ئیسلامیش بەرەو زەلکاوی بیری نەتەوایەتیی پەلکێش بکەن، بێخەبەر لەوەی، کە هەموو سمێڵ سوورێك هەمزاغا نییە و، ئیسلام و دینی گۆڕدراوی مەسیحیی، یەك نین و، قیاسی کەشکێ لە مەشکێیە.

چونکە ئیسلام بەرنامەیەکی تێر و تەسەل و تەواو و هەمەلایەنەی ژیانە و، پێویستیی بە پینە و پەڕۆیان نییە و، وزە و تینێکی ئەوتۆی هەیە، کە هەر پاش سەدەیەك لە سەرهەڵدانی، توانی لە سەرووی ئەفریقاوە، هەتا ئەوپەڕی ئاسیا و، لە ئیسپانیاوە، هەتا مەغۆلستان دابگرێ و، هەموو ئەو پارچە زەوییانە بکاتە یەك و، لەسەرجەمی ئەو هەموو گەل و ڕەنگ و زمانانە، یەك ئۆممەتی مەزنی خاوەن شارستانیەتیی پێك بهێنێ.

دیارە ئێستاش ئیسلام دەتوانێ، کە ئەوەی بۆ کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیی لە ڕابردوودا ئەنجامیدا، ئەمڕۆش ئەنجامی بدات، چونکە هەرچەندە ڕواڵەت و دیکۆری ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگاکان گۆڕاوە، بەڵام جەوهەر و ماهیەتی ئینسان و کێشە و دەردەکانی نەگۆڕاون و، هەروەك خۆیانن، هەرچەندە میکانیزمی چارەسەری کێشە و گیروگرفتەکان، لە ڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێکی دیکە جیاوازە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## ٤ - پەیوەندیی بیری نەتەوایەتیی
## بە ئیمپریالیست و سەرمایەدارەکانەوە

ئیمپریالیزمی جیهانخۆر و سەرمایەدار (کاپیتالیزم)ی بەزەبر و زۆر، ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان گێڕاوە لە پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتییدا، چونکە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، پێشبڕکەیەکی سەیر و زۆر لەنێو ڕۆژئاواییەکاندا پەیدا بوو، بۆ فراوانکردنی موستەعمەرەکانیان و، شەپ و گوپ لێدانی خێر و خێراتی وڵاتانی جیهانی سێیەم، بەو شێوەیە وڵاتەکانی: ئاسیا و ئەفەریقایان داگیر کرد، تاکو دانیشتووانیان بچەوسێننەوە و بیان دۆشن.

ئنجا ئیمپریالیزم و کاپیتالیزمی ڕۆژئاوا، چاکترین ئامراز (وسیلە)ی کاریگەریان بۆ وەدەست هێنانی ئامانج و مەبەستە شووم و گڵاوەکانیان، بریتی بوو لە: (بیری نەتەوایەتیی)، چونکە:

**یەکەم:** وەك لە پێشەوە باسمان کرد، پاش ڕاپەڕینی زانیاریی، ڕێ و ڕەسمی کڵێسا، جێی پێ لەق بوو، لە ئەنجامی ئەمەشدا، ئەورووپا دووچاری دەردی بۆشایی هزریی بیروبڕوا (الفراغ الفکری) بوو، دواییش هەم لەبەرئەوەی، کە خەڵك بەبێ مەدار ناکات و، هەم بۆ ئەوەی هاندەر و پاڵنەرێك ساز بکات، بۆ داگیرکردنی وڵاتان و زەوت کردنی خێر و بێریان، ناچار بوو بکەوێتە گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوەی شتێك، کە ئەو مەدارەی پێ ساز بکا و، ئەو بۆشاییەی پێ پڕ بکاتەوە، تا سەرەنجام لە بیری نەتەوایەتی، بت و سەنەمێکی دروست کرد و کردیە پەیژە و ئامرازی وەدەست هێنانی ئەو نیاز و مەبەستانە.

www.alibapir.com



**دووەم:** بیری نەتەوایەتیی، چاکترین و کاریگەرترین دینەمۆ و پاڵنەری ئیمپریالیزم و کاپیتالیزمە، چونکە هەرکام لە هەست کردن بە بەرزیی توخم و ڕەگەز و، شانازیی کردن بە مێژوو و شارستانییەتییەوە و، بەرژەوەندییەکانی نیشتیمان (المصالح الوطنية) و بەرەو پێش بردنی گەل، دەبنە هۆی ورە وەبەرنان و تیژکردن و هاندان و هێرش بردن و داگیرکردن و...هتد.

هەڵبەتە وردەوردە، بتی نەتەوایەتیی گەورەتر بوو و، پتر لاقی لە بەرێ تێپەڕاندن، هەتا وای لێهات بیردۆزەی: (داروێن)ی فراوان کرد و، لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بەکاری هێنا، بۆ وێنە:

(ئارنست هیگل) لەو بارەوە گوتوویەتی:

((بەس گەلە بەهێز و دەستەڵاتدارەکان مافی ژیانیان هەیە و، دەبێ گەلە بێهێز و دواکەوتووەکان، بفەوتێن و نەمێنن))!!

**سێیەم:** دیسان سەرمایەدارە زلەکان و خاوەن کارگەکان، بۆ پاراستنی بازاڕی نێوخۆ، تاکو بەرهەمە پیشەسازییە خۆماڵییەکان ساغ بکەنەوە، زۆر سوودیان لە بیری نەتەوایەتیی وەرگرت، چونکە لەو ڕێیەوە، هەست و نەستی خەڵکەکەیان دەبزواند، کە هەر شتی خۆماڵیی بکڕن و، بەچاوی سووك تەماشای شتی بێگانە بکەن، ئەگەر چاکتریش بێ.

دیسان لەلایەکی دیکەشەوە: بەناوی بەرژەوەندیی گەل و نیشتیمانەوە، کەوتنە وروژاندنی هەست و نەستی نەتەوایەتیی خەڵك و، بزواندنی دەماری خۆپەرستییان، بۆ پەیداکردنی چەند بازاڕێکی دیکەی نوێ و، دۆزینەوەی چەند موستەعمەرەیەکی دیکە.

هەر بۆیەش دەبینین: یەکسەر پاش سەرهەڵدانی سەرمایەداریی لە سەدەی نۆزدەیەمدا، بیری نەتەوایەتیی گەیشتە لووتکەی هەرەبەرزی خۆی.

**چوارەم:** هەروەها سەرمایەدار و خاوەن کارگەکان، لەلایەکی دیکەشەوە سوودیان لە بیری نەتەوایەتیی وەرگرت، ئەویش ئەوەبوو، کە بەهۆی وروژاندنی هەست و نەستی

www.alibapir.com



نەتەوەیی و نیشتیمان پەروەرییەوە، کارێکی وایان کرد، کە خەڵکەکە بەدەوڵەمەند و هەژار و چەوساوە و چەوسێنەرەوە، پاڵ لێك بدەن و لە بەرانبەر بێگانەدا بوەستن، دیارە ئەمەش ڕێگای لەوە گرت، کە هەژار و نەدار و چەوساوەکان، بیرێك لە حاڵ و وەزعی پەرێشانی خۆیان بکەنەوە و، نارەزاییییەك بەرانبەر بەسەرمایەدارە دنیاخۆرەکان دەربڕن، واتە: وایان لە چەوساوە و بەش خوراوەکان کرد، کە لەبەر هەست و نەستی نەتەوایەتیی و بەرژەوەندیی نیشتیمانی، ئاگایان لە ستەمی کۆمەڵایەتیی نێوخۆ نەمێنێ و دژی نەوەستن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
PDF
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٥ - بیری نەتەوایەتیی لە سەدەی بیست دا

دەگونجێ حاڵ و بەسەرهاتی بیری نەتەوایەتیی لە سەدەی بیستەم دا، بۆ دوو قۆناغ دابەش بکەین:

### قۆناغی یەکەم: لە نیوەی یەکەم دا:

بیری نەتەوایەتیی لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا و، هەتا کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم زۆر بە زەقی لە (ئەورووپا) و (یابان) دا هاتە مەیدانی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە و، هەرکام لە یابان و وڵاتە ئەورووپاییەکانی هیوادار کرد، کە خەیاڵ پڵاوی دەست بەسەر تێکڕای دنیادا گرتن، لە مێشکی خۆیاندا بچەسپێنن و، لە ئەنجامی ئەو خەیاڵ پڵاوەشدا، بیری نەتەوایەتیی جیهانی خستە تەندووری پڕ ئازار و کارەساتی دوو جەنگە جیهانییەکەوە.

بەڵێ! زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوەن، کە پاڵنەری سەرەکیی بۆ پەیدابوونی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، بریتی بوو لە: وروووژاندنی هەست و نەستە نەتەوەییەکان، ئەوانەش کە بوونە سەرقافڵە و پێشڕەوی بیری نەتەوایەتیی لەو قۆناغەدا، هەر کام لە: (مۆسۆلینی) ئیتاڵیی و (هیتلەر)ی ئەڵمانیی و (بیرۆن)ی ئەرجەنتینیی و (فرانکۆ)ی ئیسپانیی و (سالازار)ی پورتوگالیی، بوون.

www.alibapir.com



## قۆناغی دووەم: لەنیوەی دووەمدا

لەنیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا، میکرۆبی بیری نەتەوایەتیی، جیهانی سێیەمی تەنییەوە، ئنجا هەرچەندە بەڕواڵەت، بیری نەتەوایەتیی لە لابردن و دەرکردنی داگیرکەر و ئیمپریالیزمدا خۆی دەنواند، بەڵام پاش وردبوونەوە و سەرنجدانی قووڵ، دەردەکەوێ، کە واقیع بەو شێوەیە نییە، چونکە ڕاپەڕینی گەلانی جیهانی سێیەم، دژی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر، بە هاندەری هەست و نەست و بیروباوەڕی ئیسلامییەوە بوو، نەك بە پاڵنەری هەست و نەستی نەتەوایەتیی و نیشتیمان پەروەریی.

بەڵام دوای ئەوەی دەستەیەك لە دەروون بەزیوانی ئەوریوپاپەرست، بۆیان دەرکەوت، کە تازە ناگونجێ ئەورووپا ڕاستەوخۆ سەرۆکایەتی جیهانی ئیسلامیی بکات، دەستیان کرد بە زیاتر لێدانی دەهۆڵ و زوڕنای بیری نەتەوایەتیی، تاکو پێشینان گوتەنی: ((زەردر لەنیوەی وەگەڕێ)) و جڵەوی کاروباری گەلانی ئیسلامیی، ئەگەر نەشگونجێ ڕاستەوخۆ بەدەست (ئاغا) ئەوروپاییەکانەوە بێ، لانی کەم بەدەست (کوێخا و گزیر)ە هەلپەرست و خۆفرۆش و وابەستەو دابەستەکانیانەوە بێ و، بەدەردی پێشینان دەڵێن: ((پاروو، ئەگەر لە زاریش بکەوێتە خوار، بکەوێتە نێو کۆشێ چاکە!)).

ئێستاش لەم بارودۆخەی ئەمڕۆدا، دوای ئەوەی بە ڕواڵەت ئیمپریالیزم و داگیرکەران دەرکراون و، وڵاتە ئیسلامییەکان سەربەخۆییان وەدەست هێناوە، دەبینین بیری نەتەوایەتیی سەرلەنوێ هاتۆتەوە گۆڕێ، بۆ ئەوەی ببێتە خزمەتکارێکی دڵسۆز و جگەرگۆشەیەکی بەوەفای ئیمپریالیزم!

چونکە لەم سەردەمەدا، ئیمپریالیزمی جیهانیی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەوپەڕی توانایەوە هەوڵی ئەوە دەدات، کە گەلانی ئیسلامیی بە پەرتەوازەیی و

www.alibapir.com



جیاجیایی بمێننەوە و یەکگرتنیان لەنێودا پەیدا نەبێ، ئنجا دیارە کاریگەرترین چەکی (پەرتکە و زاڵبە) و، باشترین زەوی بۆ تێدا چاندنی تۆوی دووبەرەکیی، بریتییە لە بیری ژەهراویی نەتەوەپەرستیی و، خاك و ئاو پەرستیی و خۆ کورت هەڵهێنانی هەرکام لە گەلانی ئیسلامیی، لە جوغزی تەسکی نیشتیمان و ڕەنگ و زمانی تایبەتی خۆیاندا و، گوێنەدان بەو جوغز و زەمینە فراوانەی، کە دەتوانێ تێکڕای مرۆڤایەتیی - نەك هەر گەلانی جیهانی ئیسلامیی- کۆبکاتەوە، کە بریتییە لە: (برایەتیی ئیسلامیی).

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٦ - مێژووی پەیدابوونی بیری نەتەوایەتیی لە جیهانی ئیسلام دا

وەك لە باسەکانی ڕابردوودا گوترا: هەست و نەست و سۆزی نەتەوایەتیی، وەك غەریزەیەکی سادە و خوارسك، هەر لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤەوە هەبووە، کەواتە گەلانی نێو جیهانی ئیسلامیش، وەك باقی گەلانی جیهان، هەست و نەستی نەتەوایەتیی و نیشتیمان پەروەرییان هەر هەبووە و، ئەو هەست و نەستە سادە و سروشتییەش، نەك هەر هیچ دژایەتیی و ناکۆکیی لەگەڵ ئیسلامدا نەبووە و نییە، بگرە ئیسلام فەرمانیشی پێدەکات.

بەڵام ئەوەی، کە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ و تێك دەگیرێن و، لەمێژیش نییە لەنێو گەلانی ئۆممەتی ئیسلامیدا پەیدا بووە، بریتییە لە: بیری نەتەوایەتیی (الفكر القومي).

ئنجا ئێمە لەم کورتە باسەدا، دەمانەوێ ئاوڕێك لە مێژووی سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتیی بدەینەوە، لە جیهانی ئیسلامییدا.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، بانگەوازییەکانی (جمال الدین)ی ئەفغانیی و سوڵتان (عبدالحمید)و غەیری وانیش، بەرزبوونەوە و، بەنێو جیهانی ئیسلامییدا بڵاوبوونەوە، کە بانگی جیهانی ئیسلامییان دەکرد، لە: (عارەب و کورد و تورك و فارس) و گەلانی دیکەش، کە یەك بگرن و زیاتر ڕیزی برایەتییان پتەو بکەن و، شۆڕشی خۆیان دژی ئیمپریالیزم جۆش بدەن.

www.alibapir.com



هەڵبەتە مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامییش، پێشتر لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانییدا - هەرچەندە ناتەواویشی زۆر بوون - توانیبوویان: لێشاوی داگیرکەرانە و تەماع کارانەی ڕۆژئاوا بەرپەرچ بدەنەوە.

ئنجا کاتێك هێزە زلەکان، هەستیان بە مەترسیی ئەو هێز و پێزەی جیهانی ئیسلامیی کرد، کە لە یەکگرتن و برایەتییاندا خۆی دەنوێنێ، دەستیان کرد بە سازکردنی فێڵ و پیلان و تەڵەکەیەکی نوێ، کە لە زاراوەی سیاسیدا جەنگی دەروونیی (الحرب النفسية)ی پێ دەڵێن، چونکە ئیمپریالیزم بە ئەزموونی مێژوویی خۆی، بۆی دەرکەوتبوو، کە لەڕێی جەنگی چەکدارانەوە، مەحاڵە بتوانێ وا بە ئاسانیی دەست بەسەر وڵاتانی ئیسلامییدا بگرێ، بۆیە وای بەچاك زانی، لەپێشەوە بۆ ڕێخۆشکردن(تمهید) و کارئاسان کردن، گەرا و توخمی چەند بیروباوەڕێکی پیسی شەیتانانە، بەنێو گەلانی ئیسلامییدا بڵاوبکاتەوە، چونکە ئەو ڕۆژە باش دەیزانی، کە ئەوەی لە ڕێی ئەودا بۆتە کۆسپ و لەمپەرێکی گەورەو بەهێز و، ناهێڵێ پێ بنێتە نێو خاکی مسوڵمانانەوە، بریتییە لە (ئیسلام).

کەواتە چاکترین چارەسەر ئەوەیە، کە بەر لەوەی لەگەڵ مسوڵمانان لە مەیدانی جەنگێکی ئاشکرادا ڕووبەڕوو بێ، هەوڵی بێهێز کردن و نەهێشتنی ئەو دیوار و بەربەستە مەحکەمە بدات!!

ئنجا بۆ ئەم مەبەستەش، هێزە زلە جیهانخۆرەکان، کەوتنە بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی، چەند ڕێچکە و بیردۆزەیەکی بێخێر و سەرلێ شێوێن، ڕاستەوخۆ لەڕێی ڕۆژهەڵاتناس و قەشە و گەڕیدە فەلەکانەوە، یان ناڕاستەوخۆ لەڕێی دروستکردنی چەند دەستێکی کرێگرتە و، چڵکاوخۆرێکی وابەستە، لەنێو جەرگەی مسوڵماناندا.

لە هەموو شتێك پیستر و کاریگەرتریش بۆ پەرتەوازەکردنی مسوڵمانان و، پارچەپارچەکردنی نیشتیمانی ئیسلامیی و، سست کردنی پەیوەندیی برایەتیی نێوان گەلانی ئیسلامیی، بریتی بوو لە: بیری نەتەوەپەرستیی (ناسیۆنالیزم).

www.alibapir.com



لەسەرەتاوەئیمپریالیزمی فەڕەنسیی، دەستیکرد بەپەرەپێدانی (بیری نەتەوایەتیی) لە میسردا و، خەڵکی میسریان هاندا لەسەر جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانیی و، لەنێوان ساڵەکانی (١٨٦٣ و ١٨٧٩)ی زایینیدا، فەڕەنسیی و ئەمریکیی و ئیتاڵیی و ئەڵمانییەکان: حەفتاو حەفت (٧٧) قوتابخانەی سەربەخۆیان لە میسردا کردەوە و، چالاکیی قەشەکان گەیشتە پلەیەکی یەکجار بەرز.

ئنجا لە ئەنجامی ئەمەشدا، هەندێك ڕۆشنبیری ئەورووپا مەزەب پەیدابوون، کە ئاڵای سەربەخۆیی میسر و، شوێنکەوتوویی (تبعیة)ی میسر بۆ ڕۆژئاوایان بەرزکردەوە، کە (رفاعة طهطاوي) بە سەرقافڵەیان دادەنرێ و، (طه حسین)یش بە بەرنامەڕێژیان.

نابێ لەوەش بێئاگا بین، کە میسر لەو کاتەدا، وەك مێشك وابوو بۆ جەستەی جیهانی ئیسلامیی، ئنجا پاش میسر، بگرە هاوکات لەگەڵ پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتیی و (عارەبایەتیی) لە میسردا، وەك ڕۆژهەڵاتناسی ناودار (برناد لویس) دانی پێدا دێنێ، سێ (٣) کەس لە جوولەکەکانی ئەورووپاش، دەستیان کرد بەجووڵاندن و وورووژاندنی هەستی نەتەوەپەرستیی و تورکایەتیی لەنێو تورکەکاندا.

یەکەمی ئەو سێیانەش: (لوملي داڤید)ە، کە جوولەکەیەکی ئینگلیزیی بوو، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتیی، سەفەری بۆ تورکیا کرد و کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی: (دراسات تمهیدیة)، کە تەرخانی کردبوو بۆ سەلماندنی سەربەخۆیی ڕەگەزی تورك و، چاکتر بوونی لە عارەب و گەلەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات.

دووەمینی ئەو سێ کەسانەش (داڤید لیۆن کۆهین)ە، کە جوولەکەیەکی فەڕەنسیی بوو، دەورێکی گرنگی گێڕا لە وورووژاندنی هەستی بیری ناسیۆنالیزم لە دەروونی تورکەکاندا.

لەساڵی (١٨٩٩)دا نووسەری ناوبراو، کتێبێکی بەناوی: (تعریف عام بتأریخ آسیا) بڵاوکردەوە، کە لەوێدا زۆر پێداگیریی لەسەر بەرزیی و چاکتریی ڕەگەزی

www.alibapir.com



تورك كردوە و، زۆر بەو بەسەرهات و جەنگانەی هەڵاگوتوە، كە لەمێژووی پێش ئیسلامیاندا، كردوویانن!!

كتێبی ناوبراو لە دەساڵی سەرەتای سەدەی بیستدا، وەرگێڕرایە سەر زمانی توركیی و، بەشێوەیەكی زۆر بەربڵاو چاپ كرا و پەخش كرا.

هەركام لە پرۆفیسۆر (خدوري) و (برنارد لويس)یش بڕوایان وایە كە (كۆهین) ی جوولەكە بوو، كە بیری نەتەوەپەرستیی و توركایەتیی لەنێو ئەندامانی بزووتنەوەی (تركيا الفتاة)دا بڵاوكردەوە، كە لە ساڵی (١٩٠٨)دا، لەدژی دەوڵەتی ئیسلامیی، شۆڕشیان بەرپا كرد.

سێیەمین كەسی جوولەكەش، كە گەورەترین دەوری هەبوو لە بڵاوكردنەوەی بیری نەتەوایەتیی لەنێو گەلی عارەب و تورك دا، ڕۆژهەڵاتناسی ناسراو: (ئەرمینۆس فامبري) كوڕی (حاخام)ی جوولەكەكانی (مَجَرْ)ە، ئەم جوولەكەیەش وێڕای نووسینی چەند نووسراوی زۆر، سەبارەت بە پێویستیی بووژاندنەوەی نەتەوەی تورك، چەندان جۆرە پەیوەندیی پتەویشی، لەگەڵ كاربەدەست و سیاسییە دەمڕاستەكانی توركدا بەرپاكرد.

هەڵبەتە گەورەترین ئامانجی ئەورووپاش، بەتایبەتیی جوولەكەكان لە بڵاوكردنەوەی بیری توركایەتیی و عارەبایەتییدا، پاش پارچەپارچەكردنی نیشتیمانی ئیسلامی و پەرتەوازەكردنی مسوڵمانان، بریتی بوو لە: ڕێخۆشكردن بۆ داگیركردنی فەلەستین، چونكە جوولەكەكان زۆریان هەوڵدا، بە ترس و تەماع سوڵتان (عبدالحميد) ئیقناع بكەن، كە خاكی فەلەستینیان بداتێ بۆ جوولەكە كۆچ كەرەكان، ئنجا پاش ئەوەی هەڵوێستی مەردانەی سوڵتان (عبدالحميد)یان دی، زانییان، كە تاقە ڕێی گەیشتن بە زەوتكردنی خاكی فەلەستین، بریتیە لە: لەنێوبردنی دەوڵەتی ئیسلامیی، بەهۆی لێخستنی سوڵتان (عبدالحميد)ەوە!!

زۆر بەداخەوە، كە هەوڵ و پیلانەكەشیان سەری گرت و، بزووتنەوەی تۆڕانی (الحركة الطورانية) بەناوی (تركيا الفتاة) پێك هات و، لەساڵی (١٩٠٨)دا، سوڵتان (عبدالحميد)ی لێخست و لە كۆشكی خیلافەت دەریكرد!

www.alibapir.com



ئنجا دوای ئەوەی تورکەکان ئاڵای نەتەوایەتییان بەرزکردەوە و، دروشمی تورکایەتییان هەڵگرت و، کەوتنە دژایەتییکردن لەگەڵ عارەب و کورد و باقی گەلانی دیکەی پێکهێنەری ئۆممەتی ئیسلامی، ئەو گەلانەش بەتایبەتی عارەب، لە بەرانبەردا: کاردانەوە (رد فعل)ی خۆیان پێشاندا و، کەوتنە بیری دژایەتیکردنی تورك و داواکردنی سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە دەوڵەت و خیلافەتی ئیسلامییی!!

بێگومان بەمەش ئیمپریالیزمی جیهانخۆر، بە بەردێك سێچوار چۆلەکەی کوشتن و، ئاواتی پیسی لەمێژینەی خۆی هێنایە دی.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ، کە ئەو کەسەی جوولەکەکان فوویان تێکرد و، کردیانە فسۆس پاڵەوانی تورکیا و تورکایەتیی و، ڕووخانی خیلافەتی ڕاگەیاند، بریتی بوو لە: (کەمال ئەتاتورك)!!

ئنجا سێیەمین ناوچە، لەدوای میسر و تورکیا، کە ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا و سەهیۆنیزمی جیهانیی ڕەچاویان کردبوو، بۆ تێدا بڵاوکردنەوە و ڕەواج پێدانی بیری نەتەوایەتی، بریتی بوو لە: (سوریا و لوبنان و ئوردون)، چونکە لەو کاتدا بزووتنەوە و دامودەزگاکانی بە مەسیحیی کردن (التبشیر)، لە چڵەپۆپەی چالاکییاندا بوون، مەسیحییە (کاثۆلیك)ییەکان لە ساڵی (١٨٣٠)دا، چوبوونە شام، بەڵام برۆتستانتەکان لە ساڵی (١٨٢٠)دا، خۆیان گەیاندبۆیە!!

ناودارترین کەسیش، کە دەورێکی بەرچاو و باڵای هەبوو، لە پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتییدا لەو ناوچانەدا (نجیب عازوري) بوو، کە بە دامەزرێنەری بیری نەتەوایەتیی عارەبی دادەنرێ و، کرێگرتە(عمیل)ی هەرکام لە ئینگلیز و فەرەنساش بوو!

(نجیب عازوري) لە ساڵی (١٩٠٤)دا، کتێبێکی بەناوی (یقظه الشعب العربي) بڵاوکردەوە، ئنجا کۆمەڵێکی دامەزراند، بەناوی (اتحاد الوطن العربي) و گۆڤارێکی بەناوی کۆمەڵە(جمعیة) وەبڵاوکردەوە بەناوونیشانی (إستقلال العرب)!

www.alibapir.com



یەکێك لەو مەبەستانەی گۆڤاری ناوبراو زۆر داکۆکیی لەسەر کردوە و دووپاتی دەکردەوە، ئەوەبوو کە (عارەب) ڕەگەزێکی سەربەخۆ و جیان، لە ڕەگەزی تورك و، عارەب لە ڕەگەزێکی هەڵبژاردەن و، لە هەموو گەلانی دیکە چاکتر و پەسندترن!

(عازوري) بڕوای وابوو، کە بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیی دەبێ سێ شۆڕش بکرێن: شۆڕشێکی عەرەبیی و شۆڕشێکی کوردیی و، شۆڕشێکی ئەرمەنیی!!

ئنجا دەبێ ئەوەش بگوترێ، کە (نجیب عازوري) بە ئاشکرا، وەفا و وابەستەیی خۆی بەرانبەر بە ئیمپریالیزمی ئینگلیزیی و فەڕەنسیی، پێشان دەدا و، دەری دەبڕێ، کە ئامادەیە بە پشتیوانیی ئینگلیز و فەڕەنسا، لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی، شۆڕش بەرپا بکات.

جگە لە (نجیب عازوري)، چەند کەسێکی دیکەش دەورێکی گرنگیان گێڕا، لە ڕەواج پێدانی بیری نەتەوەپەرستیی و عارەبایەتی لەنێو عارەبەکاندا، وەك: (بطرس بستاني) و (ناصیف یازجي) و (ابراهیم یازجي) و (نوفل نوفل) و (میخائیل شحادة) و (جرجیس فیاض).

بەڵام ئەوەی، کە لەنێوان جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم دا، گەورەترین دەوری هەبوو لە پەرەپێدان و درەوشاندنەوەی بیری ڕەگەزپەرستیی و عارەبایەتییدا، (ساطع الحُصَري) بوو، کە ماوەیەك وەزیری مەعاریف بوو لە سوریا و ماوەیەك وانەبێژ (مدرِّس) بوو لە (معهد التربیة العالي) لە قاهیرە و، سەردەمێکیش (مدیر عام المعارف) بوو، لە عێراق!!

شایانی باسە، کە (ساطع الحصري) ماوەی (٢٠)ساڵ زیاتر، لە خزمەتی ئینگلیز دابوو لەعێراق دا، لەماوەی حوکمی هەرکام لە مەلیك فەیسەڵ (١٩٢١ - ١٩٣٣) و، مەلیك غازي (١٩٣٣ - ١٩٣٩) و دووساڵ لە سەردەمی نووری سەعید و (عبدالإله) دا!!

www.alibapir.com



ئنجا ئەوەی، کە هەوڵ و تەقەللا و پیلان و تەڵەکەی، ئەو ڕەگەزپەرست و ناسیۆنالیستانەی درێژە پێدا و، درەختی بەد و شوومی عارەبایەتی وەبەرهێنا و، تاجی واقیعییەت پێبەخشینی، لەسەری نەتەوەپەرستیی نا، بەڕواڵەت فەلەی لەڕاستییدا جوولەکەی فرچك گرتوو بە شیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانییەوە (میشێل عەفلەق)ی گاور بوو!

ئەو (میشێل عەفلەق)ەی، کە حیزبێکی شەیتانیی لە ساڵی (١٩٤٧)ی زایینیدا دامەزراند، بەناوی: (حزب البعث العربي الإشتراكي).

ئێستاش بە پێویستیی دەزانم، کە لە باسێکی سەربەخۆدا، ماهیەتی حیزبی بەعس، بە خوێنەر بناسێنین، چونکە لەم سەردەمەدا، حیزبی ناوبراو، بۆتە نوێنەر و بەرجەستەکەری: بیری ڕەگەزپەرستیی و نەتەوایەتیی لەنێو عارەبەکاندا.[١]

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) بۆ نووسینی ئەم پێنج باسانەی، کە ڕابردن، سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە:
١- (كيف هدمت الخلافة؟) عبدالقديم زلوم.
٢- (الحلول المستوردة) د.يوسف القرضاوي.
٣- (فكرة القومية العربية على ضو و الإسلام) صالح بن عبدالله العبود.
٤- (الإسلام والقومية) د. علي محمد نقوي.
٥- (الفكر القومي إسلامياً وتأريخياً) نجاح عطا الطائي.
٦- (إسلام وناسيوناليزم) أبو الأعلى المودودي.

www.alibapir.com



## ٧ - پێناسەی حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیست

ئەو حیزبە، لە سەرەتای چلەکاندا سەری هەڵدا و، یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی، لەساڵی (١٩٤٧)دا گیرا،[١] وەك پێشتریش گوتمان: دامەزرێنەرەکەی (میشێل عەفلەق)ی گاورە.

**ئنجا لە چەند خاڵێکی گوشراو و کورتدا، هەوڵ دەدەین (حیزبی بەعس) پێناسە بکەین و، دەمامکی سەر ڕووی لابدەین:**

**یەکەم:** حیزبی بەعس، لەسەر دوو ڕەگی ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم، یان نەتەوەپەرستیی و ماددەپەرستیی، بنیات نراوە، ئەمەش هەر لەخودی ناوونیشانەکەیدا دەردەکەوێ: (حزب البعث العربي الإشتراكي).

بەڵێ، (حیزبی بەعس) ناوی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە، کە میشێل عەفلەق کۆی کردوونەوە و، (العربي الاشتراكي) دوو وشەن، نێوەڕۆك و ماهیەتی بیروباوەڕی ئەو حیزبە دەخەنە ڕوو.

**دووەم:** حیزبی بەعس دژی ئیسلامە، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩.

واتە: بەرنامە لەلای خوا، بەس ئیسلامە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾ آل عمران: ٨٥.

---

(١) بڕوانە (عروبة الإسلام وعالميته)ی شبلي العيسمي، لەپەڕە ٢٣٧.

www.alibapir.com



واتە: هەرکەسێك جگە لە ئیسلام، بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێیوەرناگیرێ..

دیارە جگە لە ئیسلامیش، کە بەرنامەی هەڵبژاردەی خوایە:

﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾ المائدة:٣.

هەموو بەرنامە و بیردۆزەیەکی دیکە، بە هەڵە و ناهەق دادەنرێ.

چونکە ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ.. ﴾ یونس:٣٢.

ئاشکراشە کە حیزبی بەعس، بە ڕاشکاویی و بێپەردە، خۆی پاڵ داوەتە لای عارەبایەتیی و سۆسیالیزم (العربي الإشتراكي) و، هیچ حیسابێکی بۆ ئیسلام نەکردوە.

**سێیەم:** دانپێداهێنانی سەرانی حیزبی بەعس بە دژایەتییان سەبارەت بە ئیسلام:

**یەك:** (مێشێل عەفلەق) دەڵێ: ((... إن الإستعمار والإقطاع والرجعية الدينية بمحاولتها هذه، تهدف إلى إجهاض جنين الثورة النامي في أحشا و شعبنا..))[1].

واتە: بێگومان ئیمپریالیزم و دەرەبەگایەتیی و کۆنەپەرستیی ئایینیی، بەم هەوڵدانەی دەیەوێ، کە کۆرپەی شۆڕشی پێگەیشتوو، لەنێو هەناوی گەلەکەماندا لەبار بچوێنێ.

**دوو:** (ناجي علوش)، کە یەکێکە لە سەرانی حیزبی گۆرین، گوتوویەتی: ((إن البعثيين مؤمنون بفصل الدين عن الدولة، التي يجب أن تكون علمانية))[2]، واتە: بێگومان بەعسییەکان بڕوایان بە لێك پچڕاندنی ئایین و دەوڵەت هەیە، دەڵێن: دەبێ دەوڵەت عەلمانیی بێ.

**سێ:** (منيف الرزاز)یش، کە یەکی دیکەیە لە دەمڕاستانی حیزبی بەعس، گوتوویەتی: ((الحركة القومية الإشتراكية، هي المرحلة الرابعة من مراحل تطور الحركة القومية ونضجها، فبعد أن مرت هذه الحركة بمرحلة رد الفعل الفطري، ثم

---

(١) (بيان البعث) القطر العراقي، كانون الأول ١٠٦١

(٢) (الثورة والجماهير) ناجي علوش، ل١٥٨.

www.alibapir.com



مرحلة الإصلاح الديني، فمرحلة الوطنية البرجوازية الليبرالية، كان حتماً أن تنتهي إلى مرحلة القومية الإشتراكية)).[١]

واتە: جووڵانەوەی نەتەوایەتیی سۆشیالیستیی، قۆناغی چوارەمە، لە گەشەکردن و پێگەیشتنی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی، چونکە دوای ئەوەی ئەو جووڵانەوەیە بەقۆناغی کاردانەوەی خورسکدا تێپەڕ بوو، دوایی قۆناغی چاکسازیی ئایینی و، پاشان قۆناغی نیشتیمانیی بورژوازیی لیبراڵیی، شتێکی پێویست بوو، کە بگوازێتەوە بۆ قۆناغی نەتەوایەتیی سۆشیالیستیی.

**چوار:** (صدام حسین)یش (شەرعی خوا) بە ئیشك و قاڵب بەستوو و نەگونجاو دەزانێ و، لەو بارەوە دەڵێ: ((.. الفقه الإسلامي: فقهٌ رجعيّ متحجّر وجامد، لا يتوافق مع متطلبات العصر، نحن لا ننسخ ولا نستنسخ من الماضي، نحن لا نريد من الدولة أو الحزب، أن يطبق التعاليم الدينية في دائرته، لأن ذلك يؤدي إلى التفرقة الطائفية وبذلك نخسر شعبنا، ونريد من رجل الدين أن لا يتدخل في شؤون الدولة..)).[٢]

واتە: فیقهی ئیسلامیی فیقهێکی کۆنەپەرستانەی دۆگمای وشك هەڵاتوویە، لەگەڵ داخوازییەکانی ڕۆژگاردا ناگونجێ، ئێمەش ڕابردوو کۆپی ناکەینەوە، ئێمە لە حکوومەت یان حیزب، داوا ناکەین کە ڕێنماییە ئایینیەکان لە فەرمانگەکەیدا جێ بەجێ بکات، چونکە ئەوە دەبێتە مایەی جیاوازیی تایفیی و گەلەکەمان لە کیس دەچێ، هەروەها نامانەوێ پیاوی ئایینی دەست وەربداتە کاروباری دەوڵەت.

بەڵێ، (صدام حسین) دەڵێ: شەرعی ئیسلامیی هیچی بەکەڵکی ژیان نایەت و، ئەگەر وە دوای بەرنامەی خوا بکەوین، خەڵکمان لەقیس دەچێت!! بەڵام زانایان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون، کە کەسێك بڵێ: (یەك یاسای) ئیسلام بەکەڵك نایەت، کافر دەبێ!!

---

(١) (فلسفة الحركة القومية العربية) منيف الرزاز، ل٩٤.

(٢) (نظرة في الدين والتراث) صدام حسين.

www.alibapir.com



**پێنج:** (إلياس فرح)یش، کە یەکی دیکەیە لە زلەزلەکانی بەعس، دەڵێ: ((إن نظرة حزب البعث للحياة وللدولة، هي نظرة علمية ومنهجية لا تؤمن بالفكر الغيبي)).[1] واتە: تێڕوانینی حیزبی بەعس بۆ ژیان و دەوڵەت، تێڕوانینێکی زانستیانە و بەرنامەییانەیە و، بڕوای بە بیری غەیبیی نیە.

**شەش:** لە یەکێك لە نامیلکەکانی (میشێل عەفلەق)دا، بەشێوەی پرسیار ڕوو لە (عەفلەق) کراوە و گوتراوە: ((لقد أكد الرفيق القائد المؤسس في أكثر من مناسبة على الروح.. رغم أنَّ فكرنا الثوري يعتمد العلمية ورفض الجانب الغيبي..))[2].

واتە: لە زیاتر لە بۆنەیەکدا، هەڤاڵی سەرکردەو دامەزرێنەر جەختی لەسەر ڕووح کردۆتەوە، لە حاڵێکدا کە بیری شۆڕشگێڕانەمان پشتی بەشێوازی زانستییانە بەستوەو، لەیەنی پەنهان (غیب)ی ڕەتکردۆتەوە!

**حەوت:** لە یەکێك لە نامیلکەکانی حیزبی بەعس دا گوتراوە: ((لم يتناول فكر حزب البعث العربي الإشتراكي الدين من حيث هو نظرة إلى ما ورا و الطبيعة..))[3]

واتە: بیری حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیستیی ناڕوانێتە ئایین، وەك ڕوانینێکی ئەودیو سروشت.

**هەشت:** (شبلي العيسمي)، کە یەکی دیکەیە لە ڕابەرانی حیزبی بەعسی کافر، دەڵێ: ((وراح رجال الدين المتعصِّبون يعتبرون الدين هو البديل المنشود ومادام هؤلا و يرون في الإسلام ديناً ودنياً، وفيه العلاج الشافي والكافي لكل ما تعانيه الأمة من أمراض ومشكلات في شتى ميادين الحياة، فقد أخذوا يبشرون الناس بإقامة الدولة على أساس الإسلام وتعاليمه؟!)).

واتە: پیاوانی دەمارگیریی ئایینی، ئایین وەك جێگرەوەیەکی ئومێد لێکراو تەماشا دەکەن، ئنجا مادام ئەوان ئیسلام وەك دین و دنیا و، چارەسەری تەواو،

---

(١) بڕوانە (الفكر القومي إسلاميا وتأريخياً) ل١٧٨.

(٢) (البعث والتراث) ميشيل عفلق، ل٦٠.

(٣) (سلسلة الثقافة الثورية في العقيدة العربية الثورية) ژمارە ٢٠، ل٤٢.

www.alibapir.com



بۆ سەرجەم كێشەو گرفتەكانی ئۆممەت دادەنێین لەهەموو بوارەكانی ژیاندا، بۆیە دەستیان كردوە بەموژدەپێدانی خەڵك بەوەی دەوڵەتێك لەسەر بناغەی ئیسلام و ڕێنماییەكانی دادەمەزرێنن!!

## كاكڵەی قسان:

١- حزبی بەعس وەك فیكر و پەیڕەو - منهج -، حیزبێكی كافرە، لەسەر بنچینەی ڕەگەزپەرستیی و سۆسیالیزم و ماددەپەرستیی دامەزراوە.

٢- حزبی بەعس، وەك كەلەپوورێكی نەتەوەیی دەڕوانێتە ئیسلام و، بڕوای بەنادیار و پەنهان(غیب) نیە.

٣- حزبی بەعس، ئیسلام بە كۆنەپەرستیی لە قەڵەم دەدات و، گاڵتە بەوانە دەكات، كە دەڵێن: دەبێ دەوڵەت لەسەر بنچینەی ئیسلام دابمەزرێ.

٤- حزبی بەعس، شەرعی ئیسلامی بە كۆن و ئیشك و بەكەڵك نەهاتوو لەقەڵەم دەدات.

٥- حزبی بەعس، دەڵێ: نابێ زانای ئایینی دەست لە كاروباری دەوڵەت وەربدات.

٦- حزبی بەعس، پێی وایە: بەهۆی بەڕێوەبردنی بەرنامەی خواوە، خەڵك پارچەپارچە دەبێ و پەرتەوازە دەبێ.

٧- حزبی بەعس، وەك ماركسیزم بڕوای وایە، كە دوایین قۆناغی گەشەكردن و گۆڕانی كۆمەڵ، سۆشیالیزمە.

## خوێنەری بەڕێز!

ئەمەی ڕابرد، كورتەیەك بوو لە پێناسەی حیزبی بەعسی كافر لەبەر تیشكی بیروڕا و پێڵێنانی سەركردە و ڕابەرانیدا، بەڵام ئەگەر بێت و ئەو حیزبە، لەبەر تیشكی پەرێز و شوێنەواری شووم و بێخێر و، هەڵوێستە دڕندانە و داخ لە دڵەكانیدا، پێناسە بكەین، كە كارەساتی كاولكاریی كوردستان و، قەتڵ عام

www.alibapir.com



کردنی خەڵکی مسوڵمانی کورد، بەتایبەتی کارەساتی یەکجار دڕندانە و بەدناوی (بەناو ئەنفالەکان) کە نزیکەی (١٨٠٠٠٠) سەد و هەشتا هەزار کەس لە پیر و گەنج و ژن و منداڵ زیندەبەچاڵ کران و، وێرانکردنی شاری (حەما) و کوشتنی نزیکەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار کەس لە دانیشتووانی و، بۆردومانکردن و کیمیابی باران کردنی شاری هەڵەبجە و، کوشتنی زیاتر لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار کەس لە دانیشتووانی و، کیمیایی ڕشێن کردنی دێیەکانی بادینان و ناوچەی خۆشناوەتی و قەرەداغ و...هتد، لە سێدارەدانی چەندان زانای وەك: (عبدالعزیز البدري) و (شێخ عارف البصري) و (محمد باقر الصدر) و (بنت الهدی) و، حەپس کردن و دەرکردن و لەسێدارەدان و ئەشکەنجەدانی هەزاران کەس، لە ژن و پیاو و پیر و گەنجی کورد و عەرەب لە عێراق و سوریادا و، شەڕ فرۆشتن بەکۆماری ئیسلامیی ئێران و، داخستنی حوجرەو قوتابخانە ئیسلامییەکان و، ڕووخاندنی مزگەوتەکان و قەدەغەکردنی چاپکردن و هێنران (إستیراد)ی کتێبە ئیسلامییەکان و، پەرەپێدان و ڕەواج پێدانی داوێن پیسیی و مەیخۆریی و قومار و جاسووسی و جاشەتی و ڕێگریی و دزیی و کوشتار و، قەدەغەکردنی بەرگ و پۆشاکی ئیسلامییانەی ئافرەتان و، سەربارەش کوشتن و بریندارکردنی هەزاران کەس، لە مسوڵمانانی دانیشتووی ئێران بەهۆی بۆردومانی فڕۆکە و تۆپ و ڕۆکێت هەڵدانییەوە. چەند دیمەن و تابلۆیەکی زەقی ئەو حیزبە کافر و ڕەگەزپەرست و شۆڤێنیەن.[١] ئەو کاتە ڕوووی ڕەش و دزێوی یەو حیزبە دیکتاتۆرو شۆڤێنی و سیکۆلاریستە، زیاتر دەردەکەوێ.

---

(١) جێی سەرسوڕمانە کە کەسانێکی خۆ بە زانا زان هەبن، دوودڵ بن سەبارەت بە کافرێتی حیزبی بەعسی عەفلەقی و سەرانی وەك: (میشێل عەفلەق و صدام حسین) و سەرانی دیکەی ئەو حیزبە کافر و دژ بە ئیسلامە. { واتە: ئەوانەیان کە کوفری ئاشکرا (بواح)یان لێ دەرکەوتوە، لێیشی پاشگەز نەبوونەتەوە و، مەرجەکانی کافربوونیان تێدا هاتبنە دی و پەرچەکانی لاچووبن}. شتێکی ئاشکراشە کە بەرنامەو پەیڕەوی هەر کۆمەڵ و حیزبێك کوفری ئاشکرای تێدابێ و، سەربارەش: پەیڕەوانی دژی ئیسلام و مسوڵمانان بن، لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام دادەنرێ، بەڵام بۆ بەکافردانانی یەکبەیەکی ئەندامانی، پێویستە وردبینیی تەواو بکرێ و بنچینەی: { چەسپانی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان} { ثبوت الشروط وانتفاء الموانع} بەسەریدا بچەسپێنرێ.

www.alibapir.com



## ١- ئیسلام تاقە ڕێی سەرفرازیی و بە ئامانج گەیشتنە

لەلای هەمووان ڕوونە، کە بناغە و بنچینەی وەدەست هێنانی هەموو ئاوات و ئامانجێك و، گەیشتن بە هەموو مافێك، بریتییە لە: (یەکگرتن و تەبایی و پێکەوە ڕێز بوون و برایی).

ئنجا ئەو یەکگرتن و ڕێزبوون و برایەتیی و تەبابوونەش، - لەنێو گەلێکی مسوڵماندا - مەحاڵە بێجگە لە ئیسلام، بەهیچ بیروباوەڕێکی دیکە بێتە دی، وەك لە مێژووی کۆن و نوێی خۆمان و گەلاندا دیتوومانە و، ئێستاش دەیبینین!

چونکە ئیسلام بە حوکمی ئەوەی، کە لەلایەن خواوە هاتوە، هیچ کەسێکی مسوڵمان و خواناس، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەی بەدڵدا نایەت، کە دەتوانێ بەرنامەیەك لە هی خوا چاکتر دابنێ، کەواتە: مرۆڤەکان تێکڕا لە ئاقار بەرنامەی خوادا، سەر دادەنەوێنن و گەردن کەچ دەکەن.

ئنجا بەپێی پەیڕەوی خواش: یەك پەرستراو (إله) و، یەك بەرنامە و، یەك پێشەوا و، یەك کێتب و، یەك ڕووگە و، یەك مەبەست، بۆ مرۆڤەکان دیاریی کراون، پەرستراو بەس خوا (الله)یە و، بەرنامە و پەیڕەو تەنها ئیسلامە و، ڕابەر و پێشەوا هەر پێغەمبەر (محمد)ە (صلی الله علیه وسلم) و، بەس قورئان کتێبی بڕواپێکراوە[1] و، تاقە ڕووگە، کەعبەی پیرۆزە و، بەرزترین مەبەست، خوا ڕازییکردنە.

---

(١) هەڵبەتە (سنة)یش، کە گوتار و کردار و بڕیار لەسەردان (القول والعمل التقریر)ی پێغەمبەرمان دەگرێتەوە، بریتییە لە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی جێبەجێکردنی قورئان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ النحل/٤٤.

www.alibapir.com


ئنجا لەبن سێبەری بەرنامەیەکی ئەوتۆدا، گەل پێکەوە دەبێتە براو، شان لێك دەدا و پشت وێك دەداو لە ئەنجامی ئەوەشدا، هەم خوا لەخۆیان ڕازیی دەکەن، هەم دەتوانن گشت مافێکیان دابین بکەن و، پشتی هەموو دوژمنێك لە زەوی بدەن.

کەواتە: با هەموو ئەوانەی بە تەمای هێنانەدی یەکگرتن و تەبایی و برایین و، پەنایان بردۆتە بەر چەند بیرو بیردۆزە و ڕێچکەیەك، کە مایەی هەرا و ئاشووب و گەل پەرتەوازەکردنن، چیدی خۆیان ماندوو نەکەن و، خۆشیان و خەڵکێکی دڵ ساف و سادە فریو نەدەن، با واز لەو کوێرە ڕێ چەوت و هەڵانە بێنن، کە لەپێش وانیشدا زۆر کەس کوتایاننەوە، بەڵام لە ئەنجامی ماندووبوون و گەڕان و سووڕانێکی زۆردا، دەستیان لە بنی هەمبانەوە دەرچووە و، تاقە دیارییەك کە لەکاتی گەڕانەوەدا لەگەڵ خۆیان هێناویانەوە، بریتی بووە لە: (هەناسە سواریی) و (پەنجەی پەشیمانیی گەزین) و (دەست لەخۆ شۆردن)!!

بەڵێ! با واز لەو ڕێچکە و بیردۆزە بێخێرانە بهێنن، کە تەنانەت لە نیشتمانی لەدایك بوونیشیاندا، هیچیان بۆ کۆمەڵ نەکردوە و، هەر زیاتر خەڵکیان پێك وەرکردوە.

ئنجا شتێکی ڕوونە، کە ئیسلام بە چەند قۆناغی تاقیکردنەوەدا تێپەڕیوە و لە کڵ[1] هاتۆتە دەرێ، بەڵام ئەو بیردۆزە دەستکردانە، لەژێر تین و فشاری چەکوچی واقیعی ژینی مرۆڤدا، بوونە تۆز و گەرد و بەهەوادا چوون و، لەنێو کوورەی گەرمی تاقیکردنەوەی مێژوودا، بوونە گاز و دووکەڵ و بێسەروشوێن بوون.[2]

---

(١) کڵ: بڵێسە و تینی ئاگر .

(٢) سپات بوونەوە و لەبرەو کەوتن و، بازاڕ شکانی بیردۆزە و ڕێچکە مرۆڤ کردەکان لەم سەردەمەدا، لەهەموو کاتێك چاکتر دەبینرێ و بۆتە دیاردەیەکی هەرە زەق و بەرچاوی ئەم ڕۆژگارە.

www.alibapir.com



**ڕەنگە یەکێك لێرەدا بپرسێ:**

باشە ئەگەر ڕاستە ئیسلام تاقەڕێی سەرفرازیی و بەمراد گەیشتنە، ئەدی بۆچی دەبینین، وڵاتە نائیسلامییەکان لەوپەڕی پلەی پێشکەوتن و شارستانییەتدان و، بە پێچەوانەوەش، وڵاتە ئیسلامییەکان، یەکجار پاشکەوتوو و بەجێماو و بێسەرەو بەرەن؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

دەربارەی پێشکەوتنی وڵاتە نائیسلامییەکان، خستنەڕووی چەند شتێك پێویستە:

١- پێشکەوتن لەبواری پیشەسازیی و تەکنۆلۆژیا و لایەنی ماددییدا، چەند هۆ و بنەمایەکی تایبەتیی هەن و، هیچ پەیوەندیی بە ڕاستیی و ناڕاستیی بیروباوەڕەوە نییە، (یابان)یش چاکترین نموونەیە لەو بارەوە.[١]

٢- پێشکەوتن و شارستانییەت، بەس بریتی نییە لە: دروستکردن و داهێنانی ئامێر و کەل وپەل و، بنیات نانی خانووبەرەو، چوونە سەرمانگ و، بن زەوی و نێو دەریا پشکنین!

٣- زۆربەی خەڵکی وڵاتە نائیسلامییەکان، ئێستا لەوپەڕی ژینتاڵیی و چارەڕەشیی و دڵەڕاوکە و نائارامیدا دەژین، وێڕای ئەمەش، هەرا و ئاژاوە و جەنگ و وێرانکاریی هەموو دنیاش، ئاگرێکە لە ڕیشی ئەوان هەڵدەستێ، زانا و بلیمەتە بەویژدانەکانیشیان، بەڕاشکاویی دانیان بەم ڕاستییە تاڵانەدا هێناوە.[٢]

---

(١) یابانییەکان، کە گەلێکی بت و سەنەم پەرستن، لەبواری تەکنۆلۆژیا و پێشکەوتنی ماددییدا ئەورووپا و ئەمەریکاشیان بۆڕداوە و بەجێهێشتوون.

(٢) بۆئیسپاتی ئەم ڕاستییە، سەرنجی کتێبی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) بدە، تەفسیری ئایەتی شەشەم.

www.alibapir.com



٤- بەپێلێنانی مێژووزانەکان، هەموو ئەو زانیارییانەی، کە بوونە بنچینە و سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەم بەرەوپێش چوون و گەشەکردنە ماددییەی ئێستای جیهانی نائیسلامیی، بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوە، کاتی خۆی ئەوروپاییەکان، لەڕێی وڵاتی ئەندەلوس (ئیسپانیا) و دوورگەی قوبروس و، جەنگی خاچ پەرستانەیانەوە، لە جیهانی ئیسلامییانەوە وەرگرت و، پاشان بۆ خۆیان زیاتر گەشەیان پێکرد و خەملاندیان!

کەواتە بەدەردی پێشینانمان دەڵێن: ئەم پێشکەوتنە ماددییە بەناو شارستانەتییەش، ((هەر ڕۆنی خۆمانە لە سەرمانی دەدەنەوە))!!

**دەربارەی پاشکەوتوویی و بەجێماویی جیهانی مسوڵماننشینی، بەناو (ئیسلامیی)یش دەبێ لەم ڕاستییانە بێئاگا نەبین:**

١- ئەگەر مەبەست لە (وڵاتە ئیسلامییەکان)، ئەو وڵاتانە بن، کە مسوڵماننشین و خەڵکێکی لەسەر ئیسلام حیساب کراویان تێدایە، ئەوە تەعبیرەکە ڕاست و بەجێیە، بەڵام ئەگەر مەبەست وڵاتانێك بن، کە بەرنامەی ئیسلامیان تێدا بەڕێوە دەبردرێ، ئەوە پێویستە تەعبیرەکە بگۆڕدرێ، چونکە تاکو ئێستا، یەك تاقە وڵاتی (ئیسلامیی) ڕاستەقینەی ئەوتۆمان نیە[1] و، لاف لێدانی ڕووت و بێکردەوە و بەرهەم و پەرێزیش، هیچی پێ ئیسپات ناکرێ!

٢- خوای کاربەجێ دوو کۆمەڵە یاسا و دەستووری بۆ داناوین، کۆمەڵێکیان لەشێوەی بەرنامە و ئاییندا ڕەوانە کراون و، کۆمەڵەکەی دیکەشیان لەنێو بوونەوەر و دیاردە سروشتییەکاندا ڕۆنراون، هەڵبەتە بۆ دروست بوونی ژیانێکی مرۆڤانەی ڕاست و، بنیات نانی شارستانەتیی(مدنیة)یەکی تەواو، ڕەچاوکردن و کارپێکردنی هەردووك کۆمەڵە یاسا و دەستوور، شتێکی پێویستە و، هیچیان بەبێ ئەوەی دیکە، بەرهەمی پێویست و چاوەڕوان کراویان نابێ، بەڵکو بە

---

(١) دیارە ئێران و سوودان و شیشان و شوێنی دیکەش هەن، کە - الحمد لله - کیان و قەوارەی سیاسییان بەناوی ئیسلامەوە تێدا دروست بووە، بەڵام حوکمڕانانی ئەو شوێنانە خۆشیان پێ لەو ڕاستییە دەنێن، کە جارێ کرچ و کاڵیی و کەم و کووڕییان زۆرە!

www.alibapir.com



دەردی زانایەکی ئەورووپایی گوتوویەتی: ((ئایین بەبێ زانیاریی، وەك بابای شەل وایە و، زانیارییش بەبێ ئایین، وەك بابای کوێر وایە))!![1]

ئنجا لەڕاستییدا، ئێستا مسوڵمانان لەبەر بێئاگایی لە یاسا و دەستوورەکانی سروشت و، نەبوونی زانیاریی، وەك مرۆڤی شەل و سەقەت، ناتوانن بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و هاوسەنگ (متوازن) لەسەر لاقی خۆیان بوەستن و، حەوجێی دەستی ئەملاو ئەولان و، ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاواییەکانیش، لە سۆنگەی نەبوونی ئایینێکی ڕاست و دروستەوە، وەك بابای کوێر ڕەفتار دەکەن و، هەر بەو چەك و تەکنۆلۆجیایەی، کە بەرهەمی زانیارییەکەیانە، بەربوونەتە گیانی یەکدی و خەریکن خۆیان و خەڵکیش لەبەین دەبەن!![2]

٣- نابێ لەوەش بێهەواڵ بین، کە مسوڵمانان سەردەمێك، کە بەڕاستی (ئیسلامیی) بوون و، خاوەنی دەوڵەتی ئیسلامیی بوون، لە هەموو بوارە ماددیی و مەعنەوییەکانی ژیاندا، سەرقافڵە و مامۆستا و چاوساغی جیهان بوون.


لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر


---

(١) جێبەجێ کردنی ڕاست و دروستی ئایین و دەستوور و یاساکانی، ڕاستەوخۆ دەبێتە مایەی وەرگرتن و ڕەچاوکردنی یاسا زانستیی و سروشتییەکان، وەك کاتی خۆی زانا و توێژەرە ئیسلامییەکان، لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، کردیان.

(٢) مەبەست جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانییە: ئەگەرنا ئێستا هەر سەرگەرمی هەڵایساندنی شەڕ و کوشتارن لە نێو گەلانی مسوڵماندا و چەك و جبەخانەکانی خۆشیانیان پێ ساغ دەکەنەوە!

www.alibapir.com



## ٢- بۆچی دوایین بەرنامەی خوا لەنێو گەلی عارەبدا هاتە خوار ؟!

ترسناکترین نەخۆشیی، کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی میکرۆبی ناسیۆنالیزم بەنێو گەلانی ئیسلامدا و، لەنێو گەلی کوردماندا پەرەی سەندوە و، زۆر کەسی بە هەڵە بردوە و کەواندوە و، لە ئیسلامەتیی تۆراندوە، بریتییە لە: ڕەفزکردن و نەویستنی ئیسلام، چونکە لەنێو گەلی عارەبدا و بەزمانی عارەبیی نێرراوە!!

ئنجا سەیر لەوەدایە، کە هەرکام لەو بە ڕەچەڵەك مسوڵمانانەی، کە بە ئیسلام ڕازیی نین، لەبەر ئەوەی لە نیشتمانێکی عەرەبی و، لە هەل و مەرجێکی وادا نێرراوە، هیچ پێی نەنگ و شوورەیی نییە، کە لە ڕۆژێکی ساردی زستاندا، پاڵتۆیەکی ڕووسیی دەبەر بکا و، چەترێکی ئەمەریکیی لەسەر خۆی هەڵبداو، گۆرێیەکی ئینگلیزیی دەپێ بکا!!

بەڵام، کە باس دێتە سەر ئیسلام، میزاجی تێك دەچێ و، نێوچەوانی گرژ دەبێ و دەڵێ: مەگەر ئیسلام لەنێو عارەباندا و بەزمانی عارەبیی نەنێرراوە؟! کەواتە هیچ پەیوەندیی بە ئێمەوە نیە.

ئەم قسەیەی ناسیۆنالیستەکان، کە گوایە: ئەوان بۆیە ئیسلام ڕەفز دەکەن، چونکە دیاردەیەکی نەتەوەیی گەلی کورد نییە و، ئەوانیش بەس بەشتی خۆماڵیی و نەتەوەیی ڕازین،[1] ناتوانێ ئیقناعمان بکات، چونکە خۆ نە پاڵتۆ ڕوسییەکە و،

---

(١) لەڕاستییدا ئەم خەسڵەتەی نەتەوەپەرستەکان، دیاردەیەکی نەفامییە و، لەگەڵ چەمکی مرۆڤایەتییدا ناگونجێ، سەرەڕای دژایەتیی لەگەڵ ئیسلامدا.

www.alibapir.com



نەچەترە ئەمریکییەکە و، نە گۆڕێ ئینگلیزییەکەش، دیاردە و بەرهەمی نەتەوەیی کورد نەبوون!

بێگومان ناشلوێ بگوترێ: ئاخر کەل و پەل و بیروباوەڕ لێك جودان، چونکە:

١- ئێمە هەر نموونەمان بە کەل و پەل هێنایەوە، ئەگەرنا ئەو جۆرە کەسانە، بەر لەوەی کەل و پەل، لەو نەتەوە بیانیانە وەربگرن، بیروبۆچوون و بیردۆزەیان لێ وەردەگرن، مەگەر بیردۆزەی (مارکسیزم - لینینیزم)، زادەی بیرو هۆشی کوردەکانی سلێمانی و دیاربەکر و سابڵاغە، یان هی مارکسی ئەڵمانیی و لینینی ڕووسیاییە؟!

یان مەگەر بیردۆزەی داروێنیزم، مام پیرۆتی هەڵشۆیی بنیاتی ناوە، یاخود داروینی ئینگلیزی؟!

یان ئایا بیری بوونایەتیی (الوجودیة)، هەڵوقلاوی زەینی کوردێکی شارباژێڕییە، یان بابایەکی ئەمەریکیی؟!

٢- هەروەك چۆن سوود وەرگرتن لە کەل و پەلەکان، لەسەر هیچ گەل و تیرەیەك تاپۆ نەکراوە، ئایینی ئیسلامیش، موڵکی تایبەتیی هیچ گەل و تیرەك نییە و، هەموو مرۆڤایەتیی تێیدا بەشدارە بە یەکسانیی، خۆ ئەگەر کەل و پەلەکان مۆر و ناوونیشانی کارگە و وڵاتێکی دیاریکراویان پێوەیە، ئایین -مەبەست لە ئایین بەس ئیسلامە-[1] ئەوەندەشی نییە و، بێجگە لە مۆری کارگەی خوایەتیی و ناوونیشانی بەرنامەی ژیانی مرۆڤایەتی، هیچ شتێکی دیکەی پێوە نیە.

کەواتە: پێشگیریکردن لە وەرگرتنی ئیسلام، بە بڕوبەهانەی ئاوا بێجێ، شتێکی ماقووڵ و ژیرانە نیە.

---

(١) چونکە تاقە ئایینی ڕاست و تەواو و ئیعتیبار پێکراو، بەس ئیسلامەو، جگە لە کتێبەکەی ئیسلام (قورئان) سەرجەم کتێبەکانی تێکڕای بەرنامە ئاسمانییەکان، بە ئیعتیرافی شوێنکەوتووانیان گۆڕراون و دەستکاریی کراون، بەڵام (قورئان) ڕستەیەك، وشەیەك، بگرە پیت (حرف)ێکیشی نەگۆڕاوە، چونکە خوای کارزان بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیی ناردوە و دەبوایە بەسەلامەتیی و دەستکاریی نەکراوییش لەبەردەستدا بمێنێتەوە.

www.alibapir.com



مادام وابێ، با بزانین هۆی ڕاستەقینەی پێشگیرییکردن و، ڕازیی نەبوونی ناسیۆنالیستەکان لە ئیسلام چییە؟!

بە بۆچوونی بەندە، دوو شتی سەرەکی هەن، کە بوونە هۆی دوورەپەرێزیی ئەو جۆرە کەسانە لە بەرنامەی خوا:

**یەکەم:** هەبوونی دەستەیەك عارەبی خوانەناسی ڕەگەزپەرست (مەبەست عارەبە بەعسی و شۆڤێنیەکانن)، کە بەشێکیان هەر بێپەردە دەری دەبڕن، کە بڕوایان بەئیسلام نییە و دەڵێن: ئیسلام بۆیە لەنێو گەلی عارەب دا سەری هەڵداوە، چونکە لە هەموو گەلانی دیکە لێهاتووتر و زیرەك ترن و، (محمد) عارەبێکی بەمشوور و بلیمەت و لێزان بووە، بۆیەش بەناوی ئایینەوە خەڵکی بانگ کرد، چونکە زانی ئەگەر بەناوی خواوە قسە بکات، چاکتری لێوەردەگرن و فەرمانبەریی دەکەن!

هێندێکیش دەڵێن: بەڵێ، ئیسلام ئایینێکی خواییە و (محمد) (صلی الله علیە وسلم) پێغەمبەری خوایە، بەڵام خوای زانا بۆیە دوایین بەرنامەی خۆی لەنێو نەتەوەی عارەب دا نارد، چونکە خوا گەلی عارەبی لەنێو گشت گەلانی جیهاندا هەڵبژاردوە و، ئیمتیازی پێداون و ویستوویەتی لە هەموانیان بەرزتر بکاتەوە و، پتر ڕێزیان لێ بگرێ!

بەکورتیی: ئەو عارەبە ناسیۆنالیستانە دەڵێن: دیارە گەلی عارەب لە هەموو گەلانی دنیا باشترن و، خوا لە هەموانی خۆشتر دەوێن، بۆیە دوایین پەیڕەوی خۆی لەنێو واندا ناردوە.

ئنجا لە ئەنجامی ئەم جۆرە قسانە و، زۆر شتی دیکەی نەتەوەپەرستانە و نائیسلامییانەدا، هەندێك لەو ڕۆڵە کوردانەی، کە یان چاك لە ئیسلام حاڵی نەبوون و بڕوا دامەزراو نین، یان هەر مسوڵمان نین و، کەوتوونە بەر تین و تەوژمی ڕێچکە دەست کردەکان، لە بەرانبەر هەڵوێستی نەتەوەپەرستانەی ئەو پێڕە عارەبە ناسیۆنالیستەدا، کاردانەوەیەکی نەتەوەپەرستانەتریان گرتۆتە بەر و، بەهیچ ڕەنگێك ئامادە نین، کە تەنانەت گوێبیستی باس و خواسی ئیسلامیش بن، چ جای بڕوا پێهێنان و شوێن کەوتنێ.

www.alibapir.com



چونکە ئەو ڕۆڵە کوردە، لە ئیسلام بێئاگایانە، کە ئەم جۆرە قسە و هەڵوێست و ڕەفتارە نائیسلامییانە لەو پێڕە نەتەوەپەرستە دەبینن، دەڵێن: ڕەنگە ئەو عارەبانەش، کە لە سەرەتاوە قورئانیان لەنێودا هاتە خوار، هیچ جیاوازیان لەگەڵ ئەمانەی ئێستا نەبێ! ئنجا لە ئەنجامی ئەو بەراورد کردن و قیاس و پێك گرتنەدا، نەك هەر ڕق و قین لە عارەبە مسوڵمانەکانی پێشین هەڵدەگرن، بەڵکو لە ئیسلامیش دەتۆرێن و زیز دەبن و، بە مەرەدەی ئەو کەسە دەچن، کە پێشینان لەبارەیانەوە گوتوویانە: ((زاری بەشیر سووتابوو، فووی لە - دۆ - ش دەکرد))!

**دووەم:** بەڵام وەنەبێ تاقە هۆی دوورەپەرێزیی هەڵگرانی ئاڵای ناسیۆنالیزم و، هەموو شتە ئیزم دارەکانی دیکەش - لەنێو گەلەکەماندا - بەس بێئاگایی لە ئیسلام و، دیتنی هەڵوێستی نەتەوەپەرستانە و خۆسەپێنەرانەی عارەبی بەدفەڕ و نامسوڵمان بێ، بەڵکو هەشیانە زۆر چاك دەزانێ کە ئیسلام ئایینێکی خوایی و جیهانییە و، بۆ هەموو گەلانی سەر زەوی یە، بەڵام هەر بڕوای پێی نییە و کەوتۆتە شوێن ڕێچکە و بیردۆزەیەکی دیکە.

بۆیەش لە ڕەفزکردنی ئیسلام دا، پەنا دەباتە بەر بیری ناسیۆنالیزم، تاکو بە دەردی کورد گوتەنی: (بە بەردێکی دوو کێلان بشکێنێ):

١- هەم گەلەکەی هەڵخەڵەتێنێ بەوەی، کە گوایە ئەو، ڕقی لە ئیسلام هەڵناستێ و بێبڕوا نییە، بەڵام بۆیە گوێڕایەڵی نابێ، چونکە ئایینی عارەبانە.

٢- هەم بیری ناسیۆنالیزم و هەر بیردۆزەیەکی دیکەش، کە بیەوێ لەجیاتی ئیسلام بیخاتە بیر و مێشکی گەلەوە، بێئەوەی لۆمە و سەرکۆنە بکرێ و بەخراپ ناوی بێنن!!

ئنجا سەیر لەوەدایە، کە لەنێو هەردووك بەرەی ناسیۆنالیستی عارەب و کورددا، کارو کاردانەوە (فعل ورد فعل)ێکی توندوتیژ هەیە، لەلایەکەوە عارەبە ناسیۆنالیستەکان دەڵێن: ئێمە هەڵبژاردەین و هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوەی عەرەب باڵاتر نییە و، عارەب ئیمتیازیان بەسەر هەموو گەلانی جیهاندا هەیە و،

www.alibapir.com



لە کاردانەوە (رد فعل)ی ئەو درۆ و دەلەسە بێ بنچینانەی ئەواندا، بەرەی ناسیۆنالیستی کوردیش دەڵێن: گەلی عارەب خراپترین و دواکەوتووترین و کەودەن ترین گەلی سەر زەوین و، ئیسلامەتیش چونکە بۆوان هاتوە، دیارە بێکەڵك و پووچە!!

بەڵام گومانی تێدا نییە، کە هیچ کام لەو دوو بەرەیە، هەڵوێستێکی ڕاست و واقیعییان نەگرتۆتە بەر، چونکە هەرکامێکیان، سواری ئەسپی سەرکێشی بیری گەل پەرستیی بووە و، لەپڕتاویان، لاقی دەبەرێك ئاڵقاون و سەرچەنگ چووە.

بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، کە بەشی زیاتر لە عارەبە ناسیۆنالیستەکان، دەستیان لە هەڵایساندنی ئاگری ئەو هەرا و ئاژاوەیەدا هەیە و، گەلی کورد بەزۆریی وەك کاردانەوە (رد فعل)ی عارەب و تورك و فارسە نەتەوەپەرستەکان، کەوتوونەتە چاڵی نەتەوەپەرستییەوە، بەس بەرپەرچدانەوەی قسە و ئیددیعای ئەوان بە پێویست دەزانم.

کەواتە با بزانین، خوای کاربەجێ لەبەرچی دوایین بەرنامەی خۆی لەنێو عارەباندا نارد؟!

**دەتوانین لە چەند خاڵێکدا ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە:**

١- بەر لە هەموو شتێك پێویستە بزانین، کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ڕەوا نییە هیچ تیرە و گەلێك خۆی بەسەر تیرە و گەلانی دیکەدا هەڵکێشێ و، شانازییان بەسەردا بکات، بەڵکو لەڕاستیدا، ئەو خۆبادان و خۆ هەڵکێشانە، لە قورئانی قسەلەجێ و، فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دا، بەتوندیی تاوانبار کراوە، وەك لە لاپەڕەکانی پێشوودا ڕوون کرایەوە، بۆ وێنە: خوای زانا لە بەرپەرچدانەوەی جوولەکەکاندا، کە دەیانگوت:

﴿ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴾ ئێمە کوڕانی خوا و خۆشەویستانی ئەوین، فەرمووی: ﴿ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ﴾ المائدة: ١٨.

www.alibapir.com



واتە: بڵێ: ئەدی - ئەگەر ڕاستە کوڕ و خۆشەویستی خوان - بۆچی بەهۆی تاوانەکانتانەوە سزاتان دەدات؟! نەخێر، بەڵکو ئێوەش مرۆڤێکن لەو خەڵکەی، کە دروستیکردوون.

دیسان خوای کاربەجێ لەکاتێکدا، فەرمانی بەشەیتان کرد، کڕنووشیی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرێ، وێڕای کۆمەڵی فریشتان، شەیتان یاخیی بوو و سەرپێچیی کرد: لەعنەت و نەفرینی لێکرد و، لە بەزەیی خۆی دووری خستەوە، هەڵبەتە کاتێك شەیتان فەرمانی خوای جێبەجێ نەکرد، خوا لێی پرسی: بۆچی و چ شتێك ڕێی لێگرتی، کە کڕنووش ببەی؟! شەیتان لە وەڵامدا گوتی: من لە ئادەم چاکترم، ئەو لە قوڕێ دروستکراوە و من لە ئاگر:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف: ١١-١٢.

واتە: بەدڵنیایی ئێمە خوڵقاندومانن، دوایی وێنەتانمان کێشا، ئنجا بەفریشتانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، جا هەموویان کڕنوشیان برد، بێجگە لە شەیتان، ئەو لە کڕنووش بەران نەبوو، - خوا - فەرمووی: چ شتێك پێشگیریی لێکردی، کە کڕنوش ببەی، کاتێك فەرمانم پێکردی؟ گوتی: من لەو چاکترم، منت لە ئاگر دروستکردوە و، ئەوت لە قوڕێ دروست کردوە.

وەك لێرەدا دەبینین، شەیتانی بەد، بۆ پاکانە(تەبریر)ی هەڵوێستی یاخی بووانەی خۆی، پەنا دەباتە بەر هەمان بەڵگەی جوولەکە و نەتەوەپەرستەکان!

بەڵێ! شەیتانیش وەك وان، لەجیاتی ئەوەی شانازیی بە کردار و ڕەفتارێکەوە بکات، کە بە ئازایەتیی خۆی وەدەستی هێناوە، شانازیی بە ماددەو توخم و ڕەگەزەکەیەوە کردوە، کە هیچ دەستی وی تێدا نیە!

کەواتە: هەرکەسێك بیەوێ بەهۆی شتێکەوە خۆی بادا و، شانازیی بەسەر خەڵکدا بکات، کە بە ئازایەتی و تێکۆشانی خۆی وەدەستی نەهێناوە و، خوا بۆی بڕیار داوە،

www.alibapir.com



وەك: (ڕەگەز، نەتەوە، نیشتیمان، ڕەنگ و زمان)، ئەوە ڕچەی شەیتانی بەدی گرتوە و، بە بەڵگەیەکی شەیتانیی، خۆی بە سەهوو بردوە و، ڕێی ڕاستی بزرکردوە.![1]

**٢**- لەڕوانگەی قورئانەوە، گەلی عارەب بەر لە هاتنی ئیسلام، گەلێکی سادە و نەخوێندەوار و سەرگەردان بوو ون، وەك خوای زانا فەرمووییەتی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة: ٢.

واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە لەنێو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لەخۆیان نارد. بێگومان ئەو گەلە، بەر لە هاتنی، ئەو لەنێو سەرگەردانییەکی ئاشکرادا بوون.

دیسان وەك قورئان هەواڵی پێداوین: کە عارەبەکان پێش هاتنی ئیسلام پێکەوە دوژمن بوون و شیریان لە یەکدی دەسوو:

﴿ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا ﴾ آل عمران: ١٠٣.

واتە: یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، کاتێك - بەر لە ئیسلام- پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام خوا دڵتانی پێکەوە بەست، ئنجا بەهۆی بەرنامەی خواوە، بوونە برا.

هەروەها وەك قورئان هەواڵی پێداوین، ئەگەر هاتبا و خوای کارزان قورئانی ناردبایە سەر گەلێکی دیکەی غەیری عارەب، عارەبەکان ئامادە نەبوون بڕوای پێ بێنن، وەك فەرمووییەتی:

﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَـٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾

الشعراء: ١٩٨-١٩٩.

---

(١) بێگومان ئەو شێخ و سەیید و ئاغا و میر و بەگانەش، کە خۆیان بە وەجاخ و ڕەچەڵەك (نسب)ەوە هەڵدەکێشن و، هەر لەبەر ئەوەی بە عورفی کۆمەڵگا ناوی: شێخ و سەیید و ئاغا و میر و بەگیان بەسەردا براوە، خۆیان لە خەڵکی بە زۆرتر دەگرن، وەبەر ئەو حوکمە دەکەون.

www.alibapir.com



واتە: ئەگەر هاتبا و - قورئانمان - ناردبایە سەر هەندێك لە عەجەمەكان[١] و بەسەر - عارەبەكان - یدا خوێندبایەوە، بڕوایان پێ نەدەهێنا.

لەم دەقە قورئانییەدا وا دەردەكەوێ، كە خوای كاربەجێ بۆیە قورئانی لەنێو گەلی عارەبدا ناردۆتە خوار، چونكە گەلێكی هێندە كەللە وشك و خۆپەسەند و گۆشەگیر بوون، ئەگەر نێررابایە سەر غەیری خۆیان، بڕوایان پێ نەدەهێنا، بەڵام وادیارە عەجەم، لە عارەب زەین ڕوونتر و، ئاسۆی بیریان فراوانتر و ئامادەتر بوون، بۆ وەرگرتنی حەق لە هەر كەسێكەوە بێ.

**ئێستا خوێنەری ئازیز!**

لە خاڵی یەكەمدا ڕوون بۆوە، كە گەل و نەتەوەكان هەموو یەكسانن و، هەر گەل و نەتەوەیەكیش لافی ئیمتیاز و گەورەیی لێبدات، بەسەر گەلانی دیكەدا، ئەوا بە هەڵە داچووە و ڕێی ڕاستی بزركردوە و، ڕچەی شەیتان و جوولەكانی گرتوە.

لەخاڵی دووەمیشدا خراوەتە ڕوو، كە قورئان فەرموویەتی: گەلی عارەب بەر لە هاتنی ئیسلام، سادە و نەخوێندەوار و سەرگەردان بوو ون[٢] و، پێكەوە ناكۆك و ناتەبا و دوژمن بوو ون، دیسان ڕاگەیەندراوە، كە ئەگەر قورئان نێررابایە سەر گەلێكی دیكەی غەیری عارەب، ئەوا گەلی عارەب ئامادە نەبوون، بڕوای پێ بێنن و بەدوای بكەون.

كەواتە: لێرەدا دەردەكەوێ، كە هاتنی ئیسلام لەنێو گەلی عارەبدا، ناگونجێ بكرێتە بەڵگەی لێهاتوویی و گەورەیی عارەب بەسەر گەلانی دیكەدا، چونكە دیتمان: قورئان، كە باسی نەتەوەی عارەب، پێش هاتنی ئیسلام دەكات، لایەنی كەم، ئەگەر شكاندن و تانە لێدانی لێ نەفامرێتەوە، مەدح و پێهەڵگوتنیش ناگەیەنێ.

---

(١) (عجم) واتە: غەیری عارەب.

(٢) لە ئاڵقەی سێیەمی (ئیسلام و ڕێچكان)دا چاكتر ئەم باسە ڕوون كراوەتەوە، كە بریتییە لە (ئیسلام وریاكەرەوەیە، نەك تلیاك).

www.alibapir.com



ئنجا ئێستا، کە بە کورتیی زانیمان دەعوای ئیمتیاز و زیادی عارەب، بەسەر گەلانی دیکەدا، چەند بێبنچینەیە و، زانیمان، کە هەڵبژێررانی عارەب بۆ تێدا رەوانەکرانی دوایین پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، لەبەر چاوی کاڵی عارەب و، لەبەر گەورەیی و ئیمتیاز و زێدەییان نەبووە، با بزانین هۆ و حیکمەتی ئەو دیاردەیە چییە؟!

## حیکمەتی هەڵبژێررانی دوایین پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێو گەلی عارەب دا :

**یەکەم:** پێش هاتنی ئیسلام، دوو دەوڵەتی گەورە حوکمڕانیی جیهانیان دەکرد و، جیهانیان دابەش کردبوو، کە بریتی بوون لە: (فارس و ڕۆم)، لەدوای ئەوانیشەوە (هیند و یۆنان) بوون.

ئنجا هەرچی دەوڵەتی فارس بوو، پڕ بوو لە بیروڕا و فەلسەفەی جۆراوجۆر و پێکەوە دژ، لە دەوڵەتی فارسدا، ڕێچکەی زەردەشتایەتیی باو بوو، کە کاربەدەست و دەسەڵاتدارەکان نوێنەری بوون و، یەکێك لە پایە فەلسەفییەکانی ئەوە بوو، کە ژنهێنانی پیاوی لەنێو نزیکانی، وەك: دایك و کچ و خوشك، بەچاکتر دادەنا، وەك لە خزمی دوور و بێگانە!! تەنانەت (یزد جرد)ی دووەم، کە لە نێوەڕاستی سەدەی پێنجەمی زایینیدا حوکمی دەکرد، لەگەڵ کچەکەی خۆی جووت بوو و کردیە ژنی خۆی، ئەمە و بێجگە لە زۆر لەڕێ لادان و، ئاکاری دزێو و ڕەفتاری بەدی دیکەی جۆراوجۆر، کە مەودای باس کردنیان نیە.[(١)]

دیسان لەنێو فارس دا، ڕێچکەی (مانەویی) هەبوو، کە بنچینە فەلسەفییەکەی بریتی بوو لە: بوونی مرۆڤ - وجود الانسان - ی بە خراپ دادەنا، بۆیە دەیگوت: پێویستە مرۆڤ نەهێڵرێ و، ژن هێنانی قەدەغە کرد، تاکو زاوزێ نەمێنێ![(٢)]

---

(١) بڕوانە: (فقه السيرة)ی محمد سعيد رمضان البوطي، ل٣٧.

(٢) بڕوانە: (خاتم النبيين)ی محمد أبو زهرة، ب ١ ، ل ١١.

www.alibapir.com



یەکی دیکە لە بیرو فەلسەفەکانی فارس بریتی بوو لە: ڕێچکەی (موزدەکیی)، کە وەك شەهرەستانیی دەڵێت: فەلسەفەکەی بریتی بوو لە: حەڵاڵ کردنی ئافرەتان و سامان و دارایی و، هەموو شتێك بۆ هەموو کەسێك بەیەکسانیی و، هاوبەشیی بێ جیاوازیی، واتە (شیوعیة النسا و والأموال).

بەڵام دەوڵەتی ڕۆم، گیانێکی دیکتاتۆرانەی هەبوو و، زۆر شەپڕێو و سەغڵەت بوو، بەهۆی ئەو دووبەرەکییە ئاییینییەی، کە لەنێوان دیانەکانی شام و میسردا هەبوو، ئەو دەوڵەتە پشتی بە هێزی سەربازیی و داگیرکەرانەی خۆی بەستبوو، لەپێناو گەشەپێدانی ئایینی مەسیحیی و، دەستکارییکردنی بەگوێرەی هەواو ئارەزووی خۆی.

بێگومان ئەمیش، وەك دەوڵەتی فارس، شل و شێواو و بێسەروبەرە بوو، لە ئەنجامی پەرەسەندنی ژیانی پڕ عەیش و نۆش و خۆشگوزەرانانەدا و، بەهۆی ستەمی ئابوورییەوە، کە لە دانیشتووان دەکرا، لەڕێی سۆغرە و بێگار و باج و سەرانە سەندنەوە.

یۆنانیش لەنێو گێژاوی ئەفسانە و، بیروبۆچوونە فەلسەفیی و خەیاڵییەکانیدا نقووم بوو بوو، بێئەوەی پێیان بگاتە بەرهەم و ئەنجامێکی بەکەڵك.[١]

هیندیش، وەك مامۆستا (أبو الحسن النّدْوي) دەڵێت: هەموو مێژوونووسانی هیند لەوەدا قسەیان یەکە، کە ئەو سەردەمەی هیند، بە دواکەوتووترین قۆناغ دەژمێررێ، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، چ ئاییینی، چ کۆمەڵایەتی، چ ڕەوشت و ئاکار، هیندیش لەگەڵ دراوسێ و دەستەخوشکەکانیدا، بەشدار بوو لە ڕووخانی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییدا.[٢]

ئەمە بەکورتیی حاڵ و باڵی هێزە دەسەڵاتدارەکانی جیهان بوو، لە سەروحەدی هاتنی ئیسلام دا، ئنجا با بزانین، دوورگەی عارەبی (الجزيرة العربية) لە چ حاڵێکدا بوو؟

---

(١) بڕوانە: (فقه السيرة) ل ٣٨.

(٢) بڕوانە: (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين؟)ی أبو الحسن الندوي، ل٢٨.

www.alibapir.com



ئەوكات دوورگەی عارەبی، هێدیی و ئارام بوو و، دوور بوو لەو هەموو ئاڵۆزیی و بێسەرەوبەرەییەی جیهان، چونكە دانیشتووانی، نە شارستانەتیی و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی دەوڵەتی فارسی یان هەبوو، كە بەرەو ڕووخان و ڕەوشت نزمیی[1] و فەلسەفەدانان و ڕێچكە داتاشینیان بەرێ، نە دەسەڵات و هێزی سەربازیی ڕۆمیشیان هەبوو، كە بتوانن دەست درێژیی بكەنە سەر وڵاتانی دەوروبەریان، نەوەك یۆنانییەكان، دەرفەتی فەلسەفەچییەتی و دم بەدمە و وتووێژی قووڵیان هەبوو، تاكو مێشكیان ببێتە نێچیری خەیاڵ و ئەفسانەكان.

سروشت و نەفسی عارەبەكان لەو سەردەمیدا، زۆر وەك كەرەسەیەكی بەكارنەهاتووی خاو دەچوو، كە لە هیچ قاڵب و بۆتەیەكدا قاڵ نەكرابێتەوە.[2]

كەواتە: گەلی عارەب لەو كاتدا، لە هەموو گەلانی دیكە گونجاوتر و لەبارتر بوون، بۆ ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا.

**دووەم:** وەك پێشتر گوتمان: گەلی عارەب گەلێكی سادە و نەخوێندەوار و سەرگەردان بوو، ئنجا هەڵبژاردنی دوایین پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێو گەلێكی ئاوادا، هەم دەبێتە بەڵگەیەكی دەم كوتكەر بۆ كەسانێك، كە بیانەوێ تانەو تەشەر لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگرن و بڵێن: ئەم قورئانە هی خوا نییە و بۆ خۆی دایناوە، یان لە ئەنجامی زانیاریی و خوێندەوارییدا فێری بووە، وەك قورئان دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ العنكبوت: ٤٨.

واتە: تۆ - ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) - لەپێش ویدا، هیچ كتێبێكت موتاڵا نەكردوە و، هیچت بەدەستی ڕاستت نەنووسیوە، ئەگەر وابایە

---

(١) بێگومان عارەبەكان ڕەوشتی نزمیان زۆر بوو، بەڵام ڕەوشت لەسەر ئاستی دەوڵەت و، چەند تاكێك، لێك جودان.

(٢) بڕوانە: (فقه السيرة) ل٣٩.

www.alibapir.com



لاڕێ بووان، دەكەوتنە گومانەوە. (واتە: بیانووی كەوتنە گومانیان بەدەستەوە دەبوو).

نێررانی ئیسلام لەنێو گەلێكی سادە و نەخوێندەواری وەك عارەبدا، دەبێتە موعجیزەیەكی مێژوویی بۆ ئیسلام، چونكە لەوانەیە ئەگەر لەنێو گەلێكی خاوەن شارستانیەتیی وەك: فارس، یان خاوەن سوپا و دەسەڵاتی وەك ڕۆم، یان خاوەن فەلسەفەی وەك: یۆنان دا نێررابایە، خەڵكی گوتبای: ئازایەتیی ئیسلام نەبوو، كە لەنێو ڕۆم، یان فارس، یان یۆنان دا دەوڵەتی دروستكرد، بەڵكو هەر ئازایەتیی ئەو دەوڵەتە خۆی بوو! بەڵام ئایا ئێستا، بێجگە لە ئیسلام ئازایەتییەكە بۆ كێ دەگەڕێتەوە؟!!

**سێیەم:** دورگەی عارەبی هەرچەندە لاپەڕ كەوتوە، بەڵام كەرتی ئاسیا و ئەفریقیا پێكەوە دەبەستێ و، لە ئەورووپاشەوە دوور نییە، ئنجا ئەگەر بێت و ئاستی هۆیەكانی هاتووچۆی ئەودەمی لەبەرچاو بگرین، هەست بە گرنگیی و بایەخیی جوگرافیایی ئەو شوێنە دەكەین و، حیكمەت و كاربەجێیی خوای زانا لەدیاریی كردنی ئەو شوێنەمان بۆ دەردەكەوێ.

نابێ هەموو شتێكیش، هەر لە گۆشەنیگای چاخ و سەردەمی خۆمانەوە سەیر بكەین و، لە هەمبانەی خۆمان دا گوێزان بژمێرین!

**چوارەم:** كەعبەی پیرۆز (البیت الحرام) كە دەستكرد و شوێنەواری ئیبراهیم پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، پلەوپایە و حورمەتێكی زۆری هەیە لەدڵی هەموو گەلانی خواپەرست دا، چونكە ئیبراهیم بە بابی پێغەمبەران (أبو الأنبیاء) ناسراوە و، ڕێزی لەلای هەموو خواناسانی جیهان هەیە، هەڵبەتە ئەو شوێنە پیرۆزەش لە كۆكردنەوە و ڕاكێشانی دڵی خەڵكیدا، بایەخی هەبووە.

**پێنجەم:** نەتەوەی عارەب هەرچەندە سادە و نەخوێندەوار و نەزان بوون و، ڕەوشت و خووی دزێوی نالەباریان زۆر بوون، بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێ كە:

www.alibapir.com



نەتەوەی عارەب لە نیمچە دورگەی عارەبیدا، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە نیشتمانێکی هەتا بڵێی، بێ خێر و کەم دەرامەت و قاقڕ و دێمەکاریان هەبوو، هیچ کام لە هێزە زەبەلاحە جیهانخۆرەکانی ئەو کاتە، چاوی تێنەدەبڕی و پەلاماری نەدەدا، بۆیە پارێزراو بوون و، لە بارودۆخێکی یەکجار ئازاد و سەربەستدا، بەژیانێکی سادەو کەم مەسرەفەوە دەژیان، هەر ئەوەش بوو کە وای لێکردبوون، لەسەر زەمینەی نەتەوایەتیی کۆنەبنەوە و، خەڵکەکە هەر بە تیرەتیرەیی و پرژوبڵاویی بمێننەوە و، کەس گەردن کەچی کەس نەبێ و، هەرکەسە کوێخای گوندی خۆی بێ.

ئنجا لەبەر ئەوە: ئەو دوورگە دوورە پڕ لە ئازادیی و سەربەستییە، باشترین و گونجاوترین جێگای تێدا شین بوون و فراژوو بوونی ئەو نەمامە ئیسلامییە بوو، کە بۆ خۆی ئامانجی ڕزگاربوون و ئازادکردنی بەندەکانە، چونکە بیروباوەڕێکی ئەوتۆ، لەبارودۆخێکی ئازاد و سەربەستدا نەبێ، زۆر بەزەحمەت گەشەدەکات و دەخەملێ!

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو عارەبە بیابانییانە بە حوکمی ژیانی دژوار و سەختی دەوارنشینی و ڕاوچییەتی و ماڵات ڕاگریی و، بەهەل و مەرجی سەخت و بەزەحمەتی ژیانیان، زۆر خەسڵەتی وەك: ئازایەتیی، خۆڕاگریی، پشوودرێژیی، قەناعەت، فیداکاریی و، بەرچاوتێریی ) یان تێدابوون، کە لەبەر نەبوونی بەرنامەیەکی ڕێك و پێکی ژیان، گەلێك جاران ئەم خەسڵەتە چاکانە لەڕێیەکی هەڵە و چەوت و، بەمەبەستی خراپەوە بەکاردەهێنران.

ئەم خەسڵەتانەش زۆر پێویستن بۆ کەسانێك، کە دەیانەوێ ئایین و بەرنامەی خوا، لەسەر زەوی بچەسپێنن و بەجیهانی ڕابگەیەنن.

**شەشەم:** ئەگەر بەوردیی لەزمانی عارەبی ورد بینەوە، دەبینین: زمانێکی تێرو تەواوە و، چەند تایبەتمەندییەکی تێدا هەن، کە لە هیچ زمانێکی دیکەی جیهاندا بەدی ناکرێن، لەسۆنگەی ئەمەوە: جێی خۆیەتی زمانی عارەبی بکرێ بەزمانی گشتیی ئیسلام و مسوڵمانان، کەواتە:

www.alibapir.com



لەبەر ئەم حیکمەت و هۆیانە و - هی دیکەش - بوو، کە خوای کاربەجێ لەنێوەدوورگەی عارەبیدا و لەنێو نەتەوەی عارەبدا، بەزمانی عارەبی دوایین بەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤایەتیی ڕەوانە کرد.

مادام وابێ، ئەو عارەبە ناسیۆنالیستانەی، کە شانازیی بەوەوە دەکەن و خۆیان بەسەر گەلاندا هەڵدەکێشن و، لافی ئیمتیاز و زێدەییان بەسەردا لێدەدەن، قسەیەکی بێبەڵگە دەکەن و، عادەتی هەڵەی شەیتان ڕەچاو دەکەن، کە خۆی بەتوخم و ڕەگەزەوە هەڵدەکێشا و، کەشخەی بەسەر ئادەم دا لێ دەدا، بەڵام سەرەنجام لەبەر ئەو خەسڵەتی خۆ هەڵکێشان و لووت بەرزیی و خۆ بەزلگرییە، نەك هەر بەرز نەبۆوە، بەڵکو نەفرینیشی لێکرا و، ترۆ کراو سووك و ڕیسوا بوو و، دووچاری تووڕەیی و تۆڵە و جەزرەبەی توندی خواش بوو!

کەواتە: با ئێمەش هەرنەبێ پەند لە رابردوان وەربگرین و، ئاگاداربین، بەدەردی وان نەچین!

دەبا تێکڕا بەرەو ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بگەڕێینەوە، وەك پێشینە ڕەسەنەکانمان: باوەش لە ئیسلام وەربێنین و، واز لە هەموو ڕێچکە و کوێرەرێیەکان بێنین و، چیدی بەتەمای بیردۆزەی بێ خێر خۆمان و خەڵکیش دەسخەڕۆ نەکەین!

خوای بەرز و مەزن و دادگەر و میهرەبان، بە لوتف و بەزەیی خۆی، هەموو لایەکمان بەرەو ڕاستەشەقامی خۆی ڕێڕوونیی بکا و، وامان لێبکات کارێك بکەین، کە لەوە بوەشێینەوە زەوی خوا، بەمیرات بگرین و بەمرادی دنیا و دوارۆژان بگەین.

(وما ذلك علی الله بعزیز).

www.alibapir.com



## ٣- توانج و پڵار لە ئیسلام گرتن، بە زیانی کێ تەواو دەبێ؟!

ئەو کەسانەی، کە تانەو تەشەر و توانج و پڵار دەگرنە ئیسلام و، نارەزایی بەرانبەر دەردەبڕن و، لەولاشەوە خۆیان بەدڵسۆزیی کورد دەزانن، با زۆر چاك بزانن، کە بەو ڕەفتارەیان، گەورەترین زیان لەو گەلە کوردە دەدەن، کە خۆیان بەخەمخۆر و مشورخۆری دەزانن! چونکە پڵار و توانج لەئیسلام گرتن، واتە: پڵار و توانج گرتنە مێژووی (١٤٠٠) ساڵەی گەلی کورد!

گەلی کورد، بێجگە لەو مێژووە (١٤٠٠) ساڵەییە، کە لەژێر باڵی ئیسلامدا بردوویەتە سەرێ، کوا چ مێژوو و داستانێکی دیکەی هەیە، کە مایەی شانازیی و سەربەرزیی بێ و، مایەی ڕێز لێگیرانی بێ، لەلایەن گەلانی جیهانەوە!!

بەڵێ! گەلی کورد، تەنها پشك و بەشێکی - بەرچاو -، کە هەیبێ لەمێژووی مرۆڤایەتیی و مێژووی ژیانیدا و، جێی شانازی و سەربەرزی و هۆی پێوەناسرانی بێت لەلایەن گەلانەوە، بەس ئەوەندە ژیانەیەتی، کە لەنێو باوەشی گەرمی خواناسیی و، بن سێبەری درەختی پڕ پیت و پێزی ئیسلام دا، بردوویەتە سەر، ئنجا مادام وابێ، دارنینی ئەو ژیانە ئیسلامییانەی گەلی کورد -کە لە ئەنجامی ڕازیی نەبوون بە ئیسلامدا دێتە کایەوە - لەمێژووی ژیانی، دەبێتە دابڕانی گەلی کورد لە کاروانی مرۆڤایەتیی و، وەك درەختێکی بێڕەگ و ڕیشە و بەرهەم و، وەك گەلێکی بێ خزمەت، دەخرێتە ڕوو!![1]

---

(١) نابێ لێرەدا کەس ئەوە لەم قسانە بفامرێتەوە، کە ئێمە هەمیشە پشتگیریی شتی کۆن و ڕابردوو دەکەین و، پێشگیریی لە بیروبۆچوون و شتی نوێ و تازەبابەت و هاوچەرخی بەسوود دەکەین - بێگومان ڕەنگە کەسانێکی واش هەبن، بەڵام بەپێی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەهەڵەدا چوو ون-، بەڵکو ئێمەش دەڵێین: پێویستە شتی کۆنی بێبایەخ و

www.alibapir.com



کەواتە: هۆ برادەرە ناسیۆنالیستە کورد پەروەرەکان!

چیدی هێرشی کوێرانەی بێسەروپێ، مەکەنە سەر ئیسلام و، چیدی بەرهەمی ئەدەبی نووسەرە پێشووە مسوڵمانەکانی وەك: خانی و مەلای جەزیریی و نالیی و حاجی قادر و مەحویی و مەلای گەورە و...هتد. مەدەنە بەر نەشتەری تەئویل و تەئویلکاریی، بە مەبەستی ئیسلام داڕنین لە بەرهەمە نایابەکانیان و، بەنامسوڵمان حسێب کردنیان، چونکە:

١- کافرکردنی ئەوان و، ئیسلام داڕنین لە بەرهەمەکانیان،[1] هیچ گۆڕانێك بەسەر ئەو قۆناغە مێژووییەدا نایەنێ، کە کاتی خۆی تێیدا ژیاون!

٢- کورد بەس مێژووی ئیسلامی هەیە، کە پێیەوە سەربەرز بێ و، کورد تەنها لەڕێی خزمەتکردن بە ئیسلامەوە - هەروەها زۆر لە گەلانی مسوڵمانی دیکەش

---

کات بەسەرچوو وەلابنرێ و، وەك کەلەپور و شوێنەوارێکی مێژوویی، لە مۆزەخانەدا دابنرێ، بەڵام سوپاس بۆ خوا، کە هێندەشمان هۆش و گۆش هەیە بزانین، نە هەموو شتێکی کۆن، بێسوود و کەم بایەخە و، نە هەموو شتێکی نوێ و تازەبابەتیش، چاك و سوودبەخشە، ئنجا ئێمە دەزانین، کە (١٤٥٢) ساڵ زیاتر بەسەر ژیانی ئیسلام دا ڕەت بووە، بەڵام بڕوامان وایە و، دەشتوانین بۆ هەموو کەسی ژیر و بەویژدانی بسەلمێنین، کە ئیسلام یەکێکە لە شتە کۆنە گرنگ و بایەخ دارەکان و، کۆن بوونی، بۆتە مایەی پتر بەپێزبوونی.

بەڵام ئەوانەی، کە بە ئیسلام ناڕازیین، نە دەتوانن ڕەخنەیەکی بەجێی لێ بگرن و دەریبخەن، کە ڕاستە شتێکی کۆنی بێبایەخە و، نە شتێکی نوێی چاکتریشیان بۆ کورد هێناوە، کە جێی ئیسلام بگرێتەوە.

بەڵێ! ئاگادارین و دەزانین، کە دەستەیەك لەو بەناو ڕۆشنبیرانەی، بەشیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانی فرچك دراون، بڕێك بیردۆزە و بیروبۆچوونی بێسەرەو بەرە و قرپۆك و بێ پێزیان هێناوە، بەئومێدی ئەوەی جێ بەئیسلام لەق بکەن، بەڵام وادیارە بێئاگان لەوەی، کە ئەو بیروبۆچوونانە وەك قوماشی خراپ، لەمێژە سپات بوونەوە و لەو جێیانەدا، کە تێیاندا لەدایك بوون، ئیفلاسیان کردوە، شتیش، کە ڕەنگی خۆی بەردا، بۆیەکردنەوە دادی نادات و، دیارە (ئەگەر لە سووریش تێچووی، لە لایا، بۆت تێ هەڵنایەتەوە).

(١) وەك پیشەی هەندێك نووسەری ناسیۆنالیست، کە بەناوی لێکۆڵینەوەی ئەدەبییەوە، تەشونکاریی و تەئویلکاریی بێجێ، لە بەرهەمی شاعیرەکانی کورددا دەکەن.

www.alibapir.com



- ئیسپاتی هەبوونی خۆی لە مێژوودا کردوە و، ئەگەر ئیسلامیشی لێ دابڕنین، ئەوا هێندەی دیکە کەساس و زەبوون دەبێ!!

٣- بەکافرکردنی وانیش، هیچ خێر و بەرەکەتێك ڕوو لە واقیعی ئێستای گەلەکەمان ناکات!!

بۆیە: ئەگەر قازانجی گەلەکەتان دەوێ و خۆشتان دەوێ - واشتان لێ چاوەڕوان دەکرێ - دەست لەو کارەتان هەڵبگرن، کە گەلی کوردی پێ بێناوونیشان دەکرێ!!

جا بێگومان هەرکەسێك بیەوێ دارێك ببڕێتەوە، کە لەسەری ڕاوەستاوە و ڕایگرتوە، لەپێش لقەدارەکە، خۆی دەکەوێتە خوارێ!!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٤- سەلاحەددین سەبارەت بە گەلەکەی، کەمتەرخەم نەبووە

هەندێك لەوانەی لەناو گەلی کورد، دایم و دەردەم بە خەم و پەژارەوە دەتلێنەوە و، دڵ و هەناویان لە سۆز و ئەوینی کورد و کوردستان، هەموو دەمێ وەك تەندووری دەسووتێ!! هەرکە باسی ئیسلامت بۆ کردن و پێت گوتن:

با بگەڕێینەوە بۆ بەرنامەی خوا، چونکە ئێمە بەندەی خواین و، بێجگە لە خواپەرستیی، چی دیکە لەئێمەی بەندە ناوەشێتەوە، بەس بەرنامەی خوایە، کە بتوانێ ئاواتەکانمان بهێنێتە دی.

پێت دەڵێ: کوا، ئیسلام چی بۆ گەلی کورد کردوە، مەگەر سەلاحەددین کورد نەبوو؟! کاتێك سەرکردەی دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامیی بوو، ئەدی بۆچی هیچی بۆ کورد نەکرد؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

خاوەنی ئەم پرسیارە، لەگێژاوی نەزانیی و بێئاگاییەکی گەورەدا نوقم بووە و پەلەکوتە دەکات، چونکە هەم سەبارەت بە واقیعی مێژوویی کۆن و نوێ، بێئاگایە و، هەم سەبارەت بە واقیعی ئایینی ئیسلام!

دەربارەی مێژوو شارەزا نییە، ئەگەرنا، دەبوو گلەیی لە (سەلاحەددین)ێك نەکات (٨٠٠) ساڵ زیاترە، مردووە![1]

---

(١) سەلاحەددین لەساڵی (١١٣٨)ی زایینیدا لەدایك بووە و، لەساڵی (١١٩٣)ی زایینیدا، کۆچی دوایی کردوە.

www.alibapir.com



چونکە ئاشکرایە، کە لەو سەردەمیدا - واتە لە سەدەی شەشەمی کۆچییدا - خەڵکی لە ڕوانگەی بیروباوەڕەوە سەیری شتی کردوە و، بێگومان مسوڵمان و نامسوڵمانیش لەمەدا یەکسان بوون، ئەگەرنا بێجگە لە بیروباوەڕ، چ شتێك دەیتوانی هەر کام لە (فریدریکی یەکەم) ئیمپراتۆری ئەڵمانیی و، (فیلیپ ئۆغستس) مەلیکی فەڕەنسا و، (شێردڵ ڕێکاردۆس) مەلیکی ئینگلتەڕا، وا لێ بکات: کە خاچ بەبەر خۆیاندا بکەن و، لەسەر دەستی پاپا لەدژی ئیسلام ڕێك بکەون!![1]

دیسان ئەگەر بیروباوەڕ نەبا، چ شتێك دەبوو بەهۆی کۆبوونەوەی مسوڵمانان لە کورد و عەرەب و تورك و...هتد، لەژێر ئاڵای سەرۆکێکی کوردی وەك: (سەلاحەددینی ئەییوبیی)دا؟!

دیسان هەروەك چۆن ئێستا (ناسیۆنالیزم) لەئارادایە و، جەنابی هەتا ئێستا - کە حەفتا ساڵ زیاترە دەهۆڵی بۆ دەکوترێ - تەنانەت نەیتوانیوە گەلێکی وەك عارەبیش لەنێو خۆیدا بکاتە یەك، چ جای هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، ئەگەر هاتبا و ئەو دەمـیش ئەو نەتەوەپەرسـتییە لەئارادابایە، نەسەلاحەددین و، نە هیچ یەکێکی دیکە لە سەرۆك و گەورەی مسوڵمانان نەیان دەتوانی وا بە ئاسانیی حوکمڕانیی ئەو ئۆممەتە ئیسلامییە بکەن، کە لە دەیان تیرە و نەتەوەی جۆراوجۆر پێکهاتبوو و، هەموو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی وەبەرخۆ دابوو.

کەواتە: ئەو کەسەی لە (سەلاحەددین)ێکی (٨٠٠) ساڵ زیاتر لەمەوبەر، چاوەڕێی شۆڕشێکی نەتەوەیی دەکات، یان چاوەڕێی سەرکردەیەکی مسوڵمانی هەشت سەدە لەمەوبەر دەکات، کە بۆی باسی مەسەلەیەك بکات، کە ساڵی لەدایکبوونی (١٧٨٩)ی زایینییە،[2] چاوەڕێی شتێکی سەیر و نەگونجاو دەکات!!

---

(١) بڕوانە: (تأريخ الشعوب الإسلامية)ی کارڵ بروکڵمان، ل ٣٥٧.

(٢) چونکە زۆربەی توێژەرە سیاسی و مێژووزانەکان لەسەر ئەو ڕایەن، کە بیری ناسیۆنالیزم، وەك ڕێچکەیەکی سەربەخۆ، لەدوای شۆڕشی فەڕەنساوە سەری هەڵدا، بڕوانە: (مليگرايى در إسلام) ل١٢.

www.alibapir.com



چونکە هاتنەدی هەر شتێك، پەکی لەسەر ڕەخسان و ئامادەبوونی هەل و مەرج و بارودۆخێکی پێویست و گونجاو کەوتوە و، بەبێ ڕەخسانی ئەو هەل و مەرج و بارودۆخە، چاوەڕوانکردنی شتەکە، بەڵگەی نەفامیی و سادەییە.

لەلایەکی دیکەشەوە: وادیارە خاوەنی ئەو پرسیارە، وادەزانێ ئەم بارودۆخە ناقۆڵا و پڕ زۆر و ستەمە نەتەوایەتییەی، ئەم تێیدا دەژی، هیچ جیاوازی نییە، لەو واقیع و بارودۆخەی گەلی کوردی (٨٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا تێیدا ژیاوە!

بەڵام لەو پێك گرتن و بەراوردکردنەیدا، هیچ گومان لە بەهەڵدا چوونیدا نییە، چونکە بارودۆخ و واقیعی سەردەمی خاوەن پرسیار،[1] دێوی دزێوی ڕەگەزپەرستیی و نەتەوەپەرستیی (ناسیۆنالیزم)، باڵی ڕەشی بەسەردا کێشاوە و ژیانی لە مرۆڤ کردۆتە ژاری مار.

بەڵام ژیان لەبن سێبەری دەوڵەتی ئیسلامی (٨٠٠) ساڵ لەمەوبەردا، جیاوازیی زۆرە، چونکەلەو سەردەمەدا، هیچ کام لە ڕەنگ و دەنگ و قەبارە و سەنگ و جوگرافیای تەنگ، وەك ئێستا نەکرابوونە،ی سنووری لێك دابڕین و قڵت و بڕکردنی تیرە و گەلەکان، بەڵکو سنووری تێدا کۆبوونەوە و زەمینەی لەسەر خڕبوونەوە و، تەرازووی هەڵسەنگێنران و لێك جوێ بوونەوە، تەنها ئیسلام بوو!!

کەواتە: مسوڵمانەکان بە هەموو تیرە و نەتەوەکانیانەوە، تا ئەندازەیەکی زۆر وەك یەك و یەکسان بوون و، کەس هەستی بەوە نەدەکرد، کەمایەتییەکە و جیاوازیی لەگەڵ دەکرێ و، مافی بەزایە دەدرێ و کەسایەتیی پێشێل دەکرێ.

ئنجا بێگومان لەژێر سێبەری دەوڵەتێکی[2] ئاوادا، نە هیچ کەسێکی مسوڵمان لە گەلی کورد و غەیری کوردیش، خوتخوتەی نەتەوایەتیی بەدڵدا هاتوە،

---

(١) کە واقیعی ئێستایە.

(٢) شتێکی ڕوونە، کە لەپاش چاخی زێڕینی چوار جێنشینەکان، بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی ئیسلام کەم و زۆر بێدادیی و ستەم و زۆر و ڕەچەڵەك پەرستییان ژیاندوە و، لەسەر حیسابی گەلی هەژار شەپ و گوپیان لێدەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات، کە لەو ڕۆژگارەدا، نەك تەنها لە جیهانی ئیسلامییدا، بگرە لە هەموو دنیادا: بەپێودەنگ و تەرازووی ئایینی مامەڵەدەکرا نەك نەتەوەیی و ....هتد.

www.alibapir.com



نەدەسەڵاتدارێکی وەك (سەڵاحەددین)یش هەستی بە بەشخوراویی و بەجێماویی نەتەوەکەی کردوە، تاکو ئەو هەستە پاڵی پێوە بنێ، شتێك لەو بارەوە بکات.

ئێستا کە زانیمان خاوەن پرسیار، چەند لە واقیعی مێژوویی بێئاگایە، ئنجا کەم شارەزایی وی و، هەرکەسێکی دیکەی هاووێنەی، سەبارەت بە ئیسلام دەخەینە ڕوو و دەڵێین:

هەموو ئەو کەسانەی گلەیی لە (سەڵاحەددین) دەکەن، چونکە هەڵنەستاوە بەشۆڕشێکی کوردانەی ناسیۆنالیزمانە، بە ئیسلام نەشارەزا و نائاشنان.

چونکە یەکێك لە بەڵگەنەویستە زۆربەرچاوەکانی ئیسلام ئەوەیە، کە ڕێ بەبابای مسوڵمان نادات، هیچ کام لە ڕەنگ و زمان ونیشتمان و پارە و سامان و ڕەچەڵەك و...هتد، بکاتە سەنگی مەحەك و تەرازووی لێك هەڵاواردنی بەندەکان - وەك لەم وتووێژەدا بەدوورودرێژیی باسکرا -.

کەواتە: هەڵنەستانی (سەڵاحەددین) بە شۆڕشێکی نەتەوەییانە، لە چوارچێوەی گەلی کورددا، لەبەر ئەوە بووە، کە ئایین و بیرو باوەڕەکەی ڕێی نەداوە، ئەگەر گریمان ڕێگاشی دابایە، بۆی نەدەکرا - وەك دواتر باسی دەکەین - و، ئەگەر گریمان بۆشی کرابایە، لەو ڕۆژگارەدا پێویستیی بەکارێکی وا نەبووە،[١] واتە: زانیویەتی کە ئیسلام لەڕوانگەو ئاسۆیەکی پان و بەرینەوە، سەیری مرۆڤەکان دەکا و، لە مرۆڤی مسوڵمان ڕازی نابێت، لە قەپێلکی گچکەو کەمبەری تیرە و گەلەکەیدا، خۆی ڕێك بێنێ و، لە قوژبنێکی جیهانی بەرفراواندا، خۆی کورت هەڵێنێ و گۆشەگیر بێ.

---

(١) لێرەدا ڕەنگە هەندێك کەسی سادە، یان خۆ گێل کەر هەبن بڵێن: کەواتە ئیسلام بڕوای بەمافە نەتەوایەتییەکانی گەلان نیە!! بەڵام بەو کەسانە دەگوترێ: (مافی نەتەوایەتیی) لەگەڵ (نەتەوەپەرستیی)دا لێك جودان، ئیسلامیش دان بەوەی یەکەمیاندا دێنێ، بەڵام دووەمیان جۆرێکە لە بت پەرستیی و لەئیسلامدا جێی نابێتەوە.

ئنجا بێگومان ئەگەر حاڵ و وەزعی گەلی کوردیش لە سەردەمی ئەییوبییەکاندا، وەك ئێستا بووایە و، چەوساوە و ماف زەوتکراو بووایە، ئەوە (سەڵاحەددین)یش وەك هەر مسوڵمان و ئیسلامییەکی شۆڕشگێڕی ئەمڕۆ، هەڵوێستێکی دیکەی دەبوو، چونکە (لکل مقام مقال).

www.alibapir.com



ئنجا سەیر لەوەدایە، کە ئەو خەسڵەتەی ناسیۆنالیستەکان، (سەلاحەددین)ی پێ تاوانبار دەکەن و پێیان وایە: بەهۆی نەبوونی ئەو خەسڵەتە لەو شۆڕەسوارەدا پلەوپایەی پێیدابەزیوە، بەرزترین دروشمی کەسایەتییەتی و، ئەگەر خوانەخواستە ئەو خەسڵەتەی تێدا بووایە، قەت نەدەگونجا ببێ بەو قارەمانە لێهاتوە، کە دۆست و دوژمن ڕێزی دەگرن و ستایشی دەکەن، بۆ ڕاستیی ئەم قسەیەشم، بەس دوو بەڵگان دەخەمە بەرچاوان:

**یەکەم:** ئەگەر (سەلاحەددین) بابایەکی ناسیۆنالیست و نەتەوەپەرست بووایە، بۆی نەدەلوا سەرکردایەتیی بەهێزترین سوپای ئیسلامیی ئەو سەردەمە بکات، کە زۆربەی گەلە ئیسلامییەکانی تێدا بەشدار بوون، چونکە ئەگەر ئەو، ئاڵا و دروشمی کوردایەتی بەرزبکردبایەوە، عارەبەکانیش، هی عارەبایەتیی و تورك هی تورکایەتیی و فارس هی فارسایەتیی و،...هتد.یان بەرز دەکردەوە!

کەواتە: ئەوانەی ڕەخنە لەو هەڵکەوتووە مسوڵمانە دەگرن، حەزدەکەن کاتی خۆی، وازی لە سەرکردایەتیی سوپای ئیسلامیی و حوکمڕانیی میسر و یەمەن و شام و جەزیرە[1] هێنابایە و، دەوڵەتۆکەیەکی کوردی دامەزراندبایە و، خۆی لە چوارچێوەی تەسکی نەتەوایەتییدا ڕێك هێنابایە![2]

بەڵام بەوەی چاك بوو ئەو حەزەی وان نەهاتە دی، ئەگەرنا، نەك هەر گەلی کورد، ئیسلام و جیهانیش، لەو شۆڕەسوار و ڕابەرە دادگەر و سەرکردە دڵنەرمە، بێبەش دەبوون.

---

(١) جەزیرە ناو بووە بۆ بەشێکی زۆری کوردستانی ئێستا.

(٢) هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانە کە ڕەخنە لە (سەلاحەددین) دەگرن و دەڵێن: دەبوو وازی لە سەرکردایەتیی سوپای ئیسلام و سەرۆکایەتی گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامیی ئەو سەردەمە، هێنابایە و، لە جوغزی تەسکی کوردستاندا خۆی کورت هەڵهێنابایە، وەك هەڵوێستی ئەوانەم دێتە بەرچاو، کە داوا لە بابایەکی سەرۆك کۆمار یان پارێزگار (محافظ) دەکەن، واز لە سەرۆك کۆماریی و پارێزگارییەتی بهێنێ، چونکە کاتی خۆی خەڵکی دێ یەك بووە، با بێتەوە و ببێتە کوێخای دێی خۆی!!

www.alibapir.com



**دووەم:** وەنەبێ ناسیۆنالیزم هێندە دیاردەیەكی سوودبەخش و سەربەخێر بووبێ، تاكو (سەلاحەددین) لەسەر گوێپێنەدانی، لۆمە و سەركۆنە بكرێ، بەڵكو بەپێچەوانەوە: چاك بوو كە ئەو كوردە مەردە، گیرۆدەی ئەو دەردە پیسە نەبووە ئەگەرنا لەجیاتی ئەوەی ببێتە جێی سەربەرزیی كوردان و، مایەی شانازییان، بە بەراوەژووەوە ئەو مسوڵمانە بەرزە، دەبوو بە پەڵەیەكی ڕەش و دزێو بەسەر لاپەڕەكانی مێژووی گەلی كوردەوە،[١] چونكە لەوەتی بیری ناسیۆنالیزم جیهانی تەنیوەتەوە و، گەرای پیسی لە دڵ و مێشكی تیرە و گەلانی جیهاندا داناوە، سەرلەبەری جیهان بۆتە مەیدانی كوشت و كوشتار و جەنگ و هەرا و ڕاووڕووت و دەستدرێژی و، یاسای دەریا: (ماسی گەورە، ماسی گچكە قووت دەدات) بۆتە دەستووری ژیان و گوزەرانی گەلان.

خۆ ئەگەر بیری ناسیۆنالیزم، تاقە زیانی بۆ بەرەی ئادەمیزاد ئەوە بووبێ، كە بوو بە ئاگری بن كای هەڵایساندنی دوو جەنگی جیهانیی یەكەم و دووەم، هەر ئەوەندە بەسە بۆ ئیسپات بوونی زیانبەخشیەتیی ناسیۆنالیزم.

كەواتە: بەسە تانە و تەشەری بێسەروپێ، سەبارەت بە كەڵەمسوڵمانێكی وەك (سەلاحەددین)، كە بە ئیسلام، بوو بەو پیاوە و، بەوی و بەهاووێنانیشی كورد، ناوی بەرز بۆوە و، ناوی لەمێژووی ئیسلام و مێژووی جیهاندا، بەوپەڕی ڕێزەوە تۆمار كرا، با لەجیاتی بێئەمەگیی و سپڵەیی نواندن دەربارەی كەسێك، كە تەنانەت دوژمنانیش دان بە ڕێز و گەورەییدا دێنن،[٢] بڵێن:

---

(١) شایانی باسە كە بەدرێژایی مێژوو هەر كەسێك پەنای بردبێتە بەر بیری نەتەوەپەرستیی و ڕەگەزپەرستیی، بەدناو بووە و، بۆتە جێی نەفرینی مێژوو، وەك هەركام لە جەنگیز و هۆلاكۆ و هیتلەر و مۆسۆلینی و جمال عبدالناصر و میشێل عەفلەق و صدام حسێن و، هەركەسێكی دیكەی وەك ئەوان، چ كۆن بێ چ نوێ!!

(٢) كارڵ برۆكلمان، ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ، دەربارەی سەلاحەددین گوتوویەتی: "لەراستیدا (سەلاحەددین) بەهۆی ئەو جەنگانەوە، كە لەگەڵ خاچ پەرستەكاندا كردنی، بوو بە ناسراوترین سەرۆك - لەنێو سەرۆكەكانی ڕۆژهەڵاتدا- لەلای ئەورووپاییەكان.

لە ڕۆژهەڵاتیشدا ئەوە ناوی بە نەمری، ماوەتەوە، لە پەنا ناوی (هاروون الرشید) و (الظاهر بیبرس)دا، وەك ڕەمز و نیشانەیەك بۆ چاخێك لە بەختەوەرترین چاخەكانی مێژوو و پڕ ئاسایش ترینی.

www.alibapir.com



"یاخوا (سەڵاحەددین)! بە بەهەشتی بەرین شاد بی، بۆ ئەو خزمەتەی کردت بە ئایینی ئیسلام و گەلی کورد، چونکە تۆ سەری ئیسلامت بەکورد و، سەری کوردت بە ئیسلام، بەرز کردەوە".

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

گومانی تێدا نیە، کە کەمێکی کەم لە سەرۆك و فەرمانڕەوایانی ئیسلام، شان لەشانی دەدەن، لەبواری خۆ یەکلاکردنەوە و پاکیی و بێخەوشییدا، لە هەر جۆرە بەرژەوەندییەکی کەسیی و، لەبواری لێبڕان و دڵسۆزییدا بۆ خزمەتی دەوڵەت و دانیشتووانی.

دوژمن و ناحەزانی، هیچ چارەیان نەبووە، بێجگە لە دان هێنان بە مەردایەتیی و دڵنەرمیی و بەخشندەییدا، سەبارەت بە دوژمنە وەبن کەوتووەکانی.

نەك هەر ئەوەندە، وێڕای ئەمەش، سەڵاحەددین پشتیوانی زانیاریی بوو. خزمەتی (سەڵاحەددین) لە هونەری بینا دروستکردندا، لە قودس و قاهیرەدا درەوشاوەیە. مزگەوتی (الأقصی)ی نوێ کردەوەو، قوتابخانەیەکی چوار دالانیی، بۆ یەکەمین جار لە نێزیك گۆڕی ئیمام شافیعییەوە دروستکرد.."

بڕوانە (تأريخ الشعوب الإسلامية) نوسراوی (کارل بڕۆکلمان)، چاپی نۆیەم، ١٩٨١، ل٣٥٨-٣٦٠.

ئنجا خوێنەری بەڕێز سەرنج بدە! ئەمە دان پێداهێنانی کابرایەکی خاچ پەرستە، کە باب و باپیرانی زەبری گورچووبڕ و مەردانەی (سەڵاحەددین)یان زۆر پێکەتوە، کەچی جوامێریی و گەورەیی (سەڵاحەددین) ناچاری دەکات، ئاوا مەدحی بکات و پێی هەڵا بڵێ، گوتراویشە: (الفضل ما شهدت به الأعداء)، بەڵام زڕە مسوڵمان و فەریکە کوردی وامان هەیە، بەناهەق هێرش دەکاتە سەر ئەو کەڵەپیاوە و، قسەی بێجێی پێدەڵێ!!

www.alibapir.com


## ٥- با سەودا و بازرگانیی بە ئایینەوە کردن، ئایینمان لەبەرچاو نەخات !

مێژووی هیچ بیروباوەڕێك - ئایینیی و غەیری ئایینی- خاڵیی نەبووە، لە چەند کەسێکی بازرگان و هەڵپەرست و دنیاویست، لەژێر پەردەی ئەو بیروباوەڕەدا، چونکە لە هەموو چاخ و ڕۆژگارێکدا، کەسانێکی نەفس نزم و بەرژەوەند پەرست هەبوون و هەن، کە بە هەر شێوە و شێوازێك بووە، نەفسی نزم و چڵێسی خۆیان، لە ئارەزووەکانی تێر بکەن، بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێك لە ئایین و ویژدان و ڕەوشت.

ئنجا هەڵبەتە ئایینی پاك و بێگەردی ئیسلامیش، لەم یاسایە ڕیزپەڕ نییە و کەم و زۆر، بەشی لەو جۆرە کەسانەدا هەبووە و هەیە و دەبێت.

کەواتە: ئەگەر بێت و وا چاوەڕوانیی ئیسلام بکەین، کە هیچ کەس لەوانەی خۆیان بە شوێنکەوتووی دەزانن، نەتوانن لەبن پەردەی ئەودا خیانەت و ناپاکیی بکەن، ئەوە چاوەڕوانیی شتێکی نەگونجاوو ناواقیعیی دەکەین، چونکە مرۆڤ هەرچی یەك بێ، هەر مرۆڤە و، هەڵە و تاوان و ناپاکیی و هەموو شتێکی چاك و خراپی لێ چاوەڕوان دەکرێ و، نابێتە فریشتە.

www.alibapir.com


**جا خوێنەری بەڕێز!**

مادام وابێ، ئەگەر مەلایەك، یان شێخێك، یان خوێندەوارێك، یان نەخوێندەوارێکت دی و، بەناوی ئیسلامەوە و لەژێر پەردەی ئیسلامدا، ناپاکیی لێپشکوتەوە، ئەوە بە شتێکی زۆر ئاسایی تەماشای بکە و، باهێندەی نووکە دەرزییەك، بڕوات بەرامبەر بە ئیسلام کەم نەکات!

ئایا هیچ کەست دیوە بەهۆی ڕەفتاری نالەبار و خێچ و خواری کۆلکە پزیشکێکی ناشێی هەلپەرستەوە، زانیاریی پزیشکییگەریی (الطبابة)ی لەبەرچاو کەوتبێ؟!

بێگومان نا، ئەگەر کەسێکی واش هەبێ بە هەڵەدا چووە.

بەڵێ! با حوکمێك، کە بەناو مسوڵمانێکی خوار و بێخێر و بێهۆش و گۆش و دڵنەخۆش و دین فرۆش، دەگرێتەوە، بەسەر ئەو ئیسلامە پاك و بێگەردە سەربەرزەشی دانەدەین، کە بابای کەچرۆ بە ناهەق خۆی پێ هەڵواسیوە.

ئنجا با چاك بزانین، کە لە هیچ چاخێکدا، ئوممەتی ئیسلامیی، خاڵیی نابێ لە کۆمەڵێك مسوڵمانی زانا و ڕاست و هەق گۆ و مەرد و بەجەرگ، کە لەکاتی گوتن و ڕاگەیاندنی هەقیدا، شەرمێ لە کەس ناکەن و، بەرنامەی خوا چۆنە، ئاوای بەخەڵکی ڕادەگەیەنن، بێئەوەی تەماع و ترس، کاریان تێبکا و ڕێڕەویان پێ بگۆڕێ، یان خوار بکات.

کەواتە: هیچ کەس بۆی نییە، قسە و کردەوە و ئاکاری مرۆڤی بەناو مسوڵمانی بێبەند و باری نالەباری بەسەر ئیسلامەوە بار، بکاتە بیانوو و بەهانەی گلەیی و ڕاکردنی لە ئیسلام.

قسەشم لەگەڵ ئەو بازرگانانەدا ئەمەیە:

هۆ ئایین فرۆشە ترسنۆکە بەزیوەکان!

www.alibapir.com



بۆچی خۆتان کردۆتە بڵیندگۆ (مُكَبِّرة)ی ستەمکاران؟!

ئەگەر هاندەری خۆدەرخستن (حب الظهور) پاڵتان پێوە دەنێ ئەو کارە بکەن، ئەوە زۆر چاك بزانن، بە هەڵەدا چوون و سەرەڕای سووکیی و بێسەنگیی، گێل و نەفامیش دەرچوون!

چونکە هەرکەسێك بازرگانیی بە بەرنامەی خواوە بکات، خوا لە هەقی خۆی خۆش نابێ و، ڕیسوا و زەبوون و ڕووڕەش و شەرمەزاری دنیا و دواڕۆژی دەکات.

ئەگەر هاندەری ئایین فرۆشییشتان، وەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکی دنیاییە، وەك زار چەورکردن و ئافەرینێك، ئەوە زۆر باش بزانن، کە زیانبارترین مرۆڤ ئەو کەسەیە، کە ئایینی خۆی بە دنیای خەڵکی دەفرۆشێ، ئنجا ئەو کرێیەی وەری دەگرێ، هەرچییەك بێت!

ئەگەر ترسانیش واتان لێدەکات، خۆتان ڕیسوای لای خوا و خەڵکی بکەن، ئەوە بزانن، کە ئایەتی: ﴿أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْ﴾ تان، بەسەردا چەسپیوە!!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٦- مەسەلەی کورد چییە و،
## چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ؟!

گەلی کورد یەکێکە لەو گەلە سەرەکییانەی، کە بە هەموویان ئۆممەتی ئیسلامیی پێکدێنن، ماوەیەکی زۆرە لە بن باری ستەم و چەوساندنەوە و دەستدرێژیی کرانەسەردا دەناڵێنێ، لەڕاستییدا ستەمدیدەیی و چەوساوەیی و بێقەوارەیی نەتەوەی کورد، بە ئاڵۆزترین و گرنگترین مەسەلەی جیهان بەگشتیی و، ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەتایبەتیی، دادەنرێ!

ئنجا ئایا حەقیقەت و نێوەڕۆکی ئەو مەسەلە گرنگە، چییە و چۆن و بەچیش چارەسەر دەکرێ؟!

خوا پشتیوان بێ لەم باسەدا، هەوڵ دەدەین وەڵامێکی ئیسلامییانەی ڕاست و دروستی هەرکام لەم سێ پرسیارە بدەینەوە:

### یەکەم: مەسەلەی کورد چییە؟!

تاکو مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامیی بەتێکڕایی، پابەندی ئیسلام بوون و دروشم و ئاڵای ئیسلامییان هەڵگرتبوو، کێشەیەك بەناوی (کێشەی کورد) لەنیشتمانی ئیسلامییدا نەبوو، بەڵکو کورد و عارەب و تورك و فارس و باقی نەتەوەکانی دیکە، بە برایەتی و تەبایی پێکەوە دەژیان و، بە هەموویان خزمەتی ئیسلامیان دەکرد، هەروەك چۆن عارەبێك و تورکێك مافی بیروڕا دەربڕین و کاروبار هەڵسوڕاندنیان هەبوو، کوردیش بەهەمان شێوە و بێ جیاوازیی.

www.alibapir.com



باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم قسەیەمان، ئەوەیە کە جیهانی ئیسلامیی لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا، بە تورك و عارەب و نەتەوەکانی دیکەشەوە، بە سەرکردایەتی کوردی مەرد سوڵتان (سەڵاحەددین)ی ئەییوبیی ڕازیی بوون، کە سەرۆکایەتیی بەهێزترین و گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامی ئەو کاتە و، سەرکردایەتیی سوپای ئیسلام بکات و، سەری ئیسلام بەکورد و ئی کورد بەئیسلام بەرز بکاتەوە و، پاشەکشە بە سوپا و قۆشەنی خاچ پەرستان بکات و، ڕووی جیهانی ئیسلامیی سپی بکاتەوە و، قودسی پیرۆز لە چەنگاڵی پیسی ئەورووپاییە خاچ پەرستەکان ڕزگار بکات!

دیارە ئەو سەردەمە گەلی (کورد)، وەك هەر ئەندامێکی دیکەی ئەو ئۆممەتە ئیسلامییە مافی تەواویی پارێزراو بووە، ئەگەرنا ئەوەتا ئێستاش کورد هەر هەن و گەلێك لە جاران پتریشن، بەڵام نەك هەر ڕێگای بوونە سەرقافڵە و براگەورەیەتییان نییە، بگرە سادەترین مافی سروشتیی و ئینسانییشی پێ ڕەوا نابینن، کە بریتییە لە: ژیان و گوزەران لە خاك و ئاوی خواپێداوی خۆیدا!

لەمەوە گەیشتینە ڕاستییەکی گرنگ، کە وەڵامی پرسیاری (مەسەلەی کورد چییە؟)شە!

ڕاستییەکەش ئەوەیە، کە دوای سست بوونی پەیوەندیی برایەتیی ئیسلامیی و، بڵاوبوونەوەی گەرای پیسی (ناسیۆنالیزم) و ڕەگەزپەرستیی (العنصرية) لەنێو جیهانی ئیسلامییدا، گەلە ئیسلامییەکان بەگشتیی و، تورك و عارەب و فارس بە تایبەتیی، برایەتیی ئیسلامییان پێکەوە پچڕاند و، بە پیلان و نەخشەی هێزە زلە ستەمکار و بێویژدان و خوانەناسەکان، کەوتنە نێو تەڵە و داوی سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە (فَرِّق تَسُدْ)ی ئیمپریالیزمەوە و، عارەب ئاڵای عارەبایەتیی و تورك هی تورکایەتیی و فارس هی فارسایەتییان هەڵگرت و، بەلاساکردنەوەی کوێرانەی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر، کەوتنە داپڵۆسین و چەپۆك پێدادانی گەلی بێکەس و دڵ سافی کوردی دراوسێیان، دیارە لە حاڵەتێکی واشدا، گەلی کوردیش بەپێی یاسای سروشتیی (لەسەرخۆ کردنەوە) کەوتە جم و جۆڵ و پەلەقاژە، بۆ وەدەست هێنانی

www.alibapir.com



ئازادیی و سەربەخۆیی، بگرە بەس بۆ خۆ دەربازکردن لە لەنێوچوون و توانەوە!!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

پێویستە ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بین، کە باسکرانی کوردایەتیی لەلایەن بابای کوردی پلیشاوەوە، جیاوازیی یەکجار زۆرە لە باسکرانی عارەبایەتیی و تورکایەتیی و فارسایەتیی و، لەلایەن ئەو گەلانەوە، کە خاوەنی دەوڵەت و کیان و قەوارەی خۆیانن!

چونکە کورد، کە دەڵێ: کوردم و باسی کورد و کوردستان دەکات، مەبەستی ئەوەیە، کە بڵێ: وەك چۆن خەڵك هەیە، با منیش هەبم و نەپلیشێمەوە و لەبەین نەچم!!

بەڵام بابای تورك، کە لافی تورکایەتی لێدەدا، مەبەستی ئەوەیە، کە بەس بۆ خۆی هەبێ و کوردە دراوسێیەکانیشی بە تورکی شاخاویی لەقەڵەم بدات! هەروەها عارەب و فارسیش و هەر گەل و نەتەوەیەکی خاوەن دەوڵەت و قەوارە و دەسەڵاتی دیکەش!!

ئنجا بێگومان قسەی دوو کەس، کە یەکیان دەڵێ: با منیش هەبم! و ئەوی دیکەیان دەڵێ: با بەس من هەبم و خەڵکی دیکە بەردەست و خزمەتکار و کۆیلەی من بێ، هێندەی ئاسمان زەوی لێك دوورن.

ئەم ڕاستی یەشم بۆیە خستەڕوو، تاکو لە ناسینی واقیعی گەلەکەمان و تێگەیشتنی بارودۆخی نەفسیی و سیاسییدا بەهەڵەدا نەچین و، لەڕوانگە و گۆشەنیگای خەڵکی دیکەوە، نەڕوانینە ئەو گەلە چەوساوە و بەشخوراوە و، خۆمان لە ئاوێنەی تێڕوانین و بیرکردنەوەی خەڵکی دیکەدا نەبینین، چونکە بەداخەوە: گەلێك برای مسوڵمانمان هەن، ئاوا ڕەفتار دەکەن!!

بەڵێ! بەگوێرەی یاسای فیزیایی: بۆ هەموو کارێك کاردانەوەیەك هەیە، لە ئەندازەدا بارتەقایەتی و لە ئاڕاستەدا پێچەوانەیەتی (لکل فعل رد فعل یساویه في المقدار، ویعاکسه في الإتجاه)، گەلی کوردی بێبەش و ستەمدیدە و لەتوپەت کراو و نیشتمان زەوت کراویش، ئاڵای کوردایەتیی هەڵگرت و، بەمەشەوە نەوەستا و پەنای

www.alibapir.com



برده بەر چەندان ڕێچکە و بیردۆزەی جۆراوجۆری ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاوایی، بەڵکو دەفریای بێن و، بە ئامانجی بگەیەنن و، لە ستەم و چەوساندنەوە و بێقەوارەیی ڕزگاری بکەن!

کەواتە: پوختەی مەبەست ئەوەیە، کە کێشە و گیروگرفتی کورد بریتییە لە: ستەم لێکرانی و، نیشتمان زەوت کرانی و، مافی ڕەوای پێشێل کرانی، لەلایەن دەرودراوسێ و برا مسوڵمانەکانیەوە!![1]

**خوێنەری بەڕێز!**

ئێستا کە زانیمان کێشە و گیروگرفتی گەلی کورد چییە و؟ چۆن پەیدا بووە؟ با بەرلەوەی بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری دووەم، لە: {لا باسێکی گرنگ} دا، سەر گوزشتەی چۆنیەتی زەوتکران و دابەشکرانی کوردستان بەکورتیی بگێڕینەوە:

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) هەڵبەتە لەم قسانەدا ڕووی ڕەخنە و گلەییم لە دەسەڵاتدار و کاربەدەستانی ئەو گەلە دراوسێیانەیە، نەك خەڵکە بێچارەکە.

www.alibapir.com



## لاپاسێکی گرنگ، دەربارەی
## چۆنیەتی زەوتکران و دابەش کردنی کوردستان

هەر لە سەرەتای سەدەکانی نێوەڕاستەوە، کوردستان لەنێوان دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانییدا دابەش کرا، لە سەدەی شازدەیەمەوە سوڵتان سەلیمی عوسمانیی، بەشی ڕۆژئاوای کوردستان و، شا ئیسماعیلی سەفەویی بەشی ڕۆژهەڵاتیان بۆ خۆ دابڕی!

پاشان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە، لە ئەنجامی کزیی و بێهێزیی دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەشێك لە خاکی کوردستان، کەوتە ژێر دەستی ڕووسیا، ئنجا لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨)ەوە، کوردستان بەم شێوەیەی ئێستای بەسەر ئێران و عێراق و تورکیا و سوریادا دابەش کرا، وەك خاوەنی ئەسڵیی کوردستان: فارس و عارەب و تورك بن و، (کورد) هیچ هەقێکی پێیەوە نەبێ!!

ئەمەی ڕابرد، کورتەی هەواڵی چۆنیەتی دابەشکرانی کوردستان بوو، ئەم جار با نۆرەی درێژەی ئەم هەواڵە تاڵ و جەرگ بڕ و، نائیسلامیی و بێویژدانانەیە بێت:

...گەورەترین هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم، بریتی بوو لە: تەماعکاریی و چاوچنۆکیی دەوڵەتە زلەکان، بۆ بەسەر خۆدا دابەشکردنی جیهان!

تێکڕای ئەو دەوڵەتە زلانەش، وەك کتکی برسیی، چاویان دە خاکی دەوڵەتی عوسمانی بڕیبوو و، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی میراتەکەی بوون!

تەنانەت ئەڵمانیای هاوپەیمان(حلیف)ی تورکیاش، لەدەوڵەتە زلە هاوپەیمانەکان، کەمتر بەهیوای میراتی هاوپەیمانەکەی نەبوو!

www.alibapir.com



لەبەر ئەوە هێزە زلەکان، بەجیاجیا و بەکۆمەڵ مقۆمقۆیان بوو و، سەرگەرمی دانانی نەخشە و پیلانێك بوون، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەیان، کە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگ بوو.

ئنجا بێگومان کوردستانیش، وەك بەشێك لەو میراتە و پارچەیەك لە خاکی دەوڵەتی عوسمانیی، شوێنێکی بەرچاوی هەبوو لەو نەخشە و پیلانە گڵاوەدا.

ئنجا پاش مشت و مڕ و بگرە و بەردەیەکی زۆر، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان (الحلفاء) بەشێوەیەکی نهێنیی، لەسەر دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەوکاتە ناویان لێنابوو: پیاوە نەخۆشەکە (الرجل المریض)، ڕێککەوتن، دیارە ئەو ڕێککەوتنەش، نەك هەر بەبێ ئاگاداریی گەلانی ئەو ناوچانە بوو، بەڵکو لەسەر حیسابی دوارۆژیشیان بوو!

ئەو ڕێککەوتن و پەیمانەی دەوڵەتە زلەکانیش، کە لە مێژوودا بە پەیمانی (سایکس - پیکۆ) ناسراوە، بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی:

سەرەتا لە ڕۆژی (١٩)ی مارتی ساڵی (١٩١٦)دا، لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسادا، گفت و گۆ دەستی پێکرد، نوێنەری بەریتانیا (مارك سایکس) و نوێنەری فەرەنسا (جۆرج پیکۆ) بوو، پاشان هەموو ئەنجامەکانی گفت و گۆی بەریتانیا و فەرەنسا خرانە بەرچاوی ڕووسیا.

ڕووسیاش دوای بێنەو بەرە و مشت و مڕێکی زۆر، قایل بوو، کە پەیمانی گۆرین مۆر بکات.

دوایی لە ڕۆژی (٢٦)ی نیسانی ساڵی (١٩١٦)دا، فەرەنسا و ڕووسیا ڕێککەوتنێکی تایبەتییان لەبارەی دابەشکردنی ناوچە ئاسیاییەکانی دەوڵەتی عوسمانیی مۆرکرد.

دوای ماوەیەکی کەم، بەریتانیاش ڕەزامەندیی خۆی بەرانبەر بەو ڕێککەوتنەی هاوپەیمانەکانی پێشاندا.

.. لە ڕۆژانی (٩) و (١٦)ی مایسی هەمان ساڵدا، ڕێککەوتنێکی دیکەی لەو جۆرە لەنێوان بەریتانیا و فەرەنساشدا مۆرکرا و، بەم جۆرە پەیمانی گڵاوی

www.alibapir.com



(سایکس - پیکۆ) لەدایك بوو، بەڵام بە زۆڵیی!!

سەرەنجام بەرهەمی شوومی جەنگی یەکەمی جیهانیی، نێوان دەوڵەتە زلەکان، ئەوە بوو، کە میراتی پان و بەرینی دەوڵەتی عوسمانیی و بەناو خیلافەتی ئیسلامیی!! لەنێوان ڕووسیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیادا بەشرایەوە و، کوردستانیش، کە بەشێکی ئەو میراتە بەلاشە بوو، ئاوا کرا بەخێرو خێرات و لەسەر سفرە و خوانی دەوڵەتە زلە پێشکەوتووخوازەکان! دابەش کرا:

١- بەشی ڕۆژهەڵاتی لە چوارچێوەی ئێراندا مایەوە.

٢- بەشەکەی دیکەشی کرایە دوو لەت.

ا- کوردستانی سەروو، پاش سەرکەوتنی کەمالییەکان، لەنێو دەوڵەتی نوێی تورکیادا مایەوە.

ب- کوردستانی خوارووش پاش بێنەو بەرەیەکی زۆر، خرایە سەر عێراق و، عێراقیش کەوتە ژێر ڕکێفی ئینگلیزەوە.

هەڵبەتە پاش ئەو کەین و بەینە، لە ساڵی (١٩٢٠)یشدا، پەیمانی (سیڤەر) بە ئامادەبوونی دەستەیەك لە نوێنەرانی کورد، بەسترا، لە بەشی سێیەمی لە ماددەی (٦٢ و ٦٤)دا بنیات نانی کوردستانێکی سەربەخۆی پێشنیار کرد و، دیارە گەلی کورد زۆریان دڵ پێ خۆش کرد!

بەڵام پاش کودەتا (إنقلاب)ی کەمال ئەتاتۆرکی دژ بە ئیسلام و نەتەوەپەرست، لەساڵی (١٩٢٣)دا، پەیمانی (لۆزان) بەسترا و، هەموو ئەو بڕیارانەی، کە لە پەیمانی سیڤەردا درابوون، هەڵوەشێنرانەوە!

سەرەنجام وەك پێشتر گوتمان: (کوردستان) ئەو سەرزەمینە فراوان و پێکەوە جۆشدراو و ئاڵقەبەندکراوەی، کە لە دەریای ڕەشەوە، هەتا کەنداو(خلیج) درێژ دەبێتەوە و، یەك گەلی یەك ڕەگەزیی (بێشوانی) تێدا دەژی، ئاوا دابەش کرا:

١- (٢٣٠٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بە تورکیا.

٢- (١٩٠٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بەئێران.

٣- (١٠٥١١١) کیلۆمەتری دووجای درا بە عێراق!!

www.alibapir.com



واتە: (٢٩٪)ی خاکی تورکیا موڵکی کوردە و، (١٢٪)ی خاکی ئێران موڵکی کوردە و، (٢٩٪)ی خاکی عێراقیش موڵکی کوردە!

٤- شایانی باسیشە کە هەرکام لە ڕووسیا و سوریاش، ئەندازەیەکیان لە خاکی کورد بۆ خۆی دابڕیوە، بەڵام ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ (٢٢٧)﴾ الشعراء: ٢٢٧.

**تێبینی: بۆ نووسینی ئەم لاباسە، پشتم بەم سەرچاوانە بەستوە:**

١- (کورد و کوردستان) واسیلی نیکیتین، وەرگێڕ: محمد قاضی، ل **٦٢٣-٥٢٥**.

٢- (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیی دا). د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، ل **١٥٧-١٦٩**.

٣- (خەبات لەڕێی کوردستان دا) نووسینی: ن. أ. خەلفین، وەرگێڕ: جەلال تەقی، ل **٥-١٥**.

## دووەم: مەسەلەی کورد چۆن چارەسەر دەکرێ؟!

چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەوە دەبێ، کە کوردیش وەك هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەی جیهان، گەلێکی ئازاد و سەربەخۆ بێ و، لە نیشتمانی خۆیدا ئازاد بێ و، هیچ کەس بەهیچ ناو و نیشانێکەوە، ئاغایەتیی و کوێخایەتیی بەسەردا نەکات و، مافە سروشتییە ڕەوایەکانی خۆی لێ زەوت نەکات!

کەواتە: هەتا گەلی کوردی مسوڵمان بچەوسێنرێتەوە و، دراوسێیەکانی بەکەمینە (أقلیة) و مسکێن و ژێردەستە، سەیری بکەن و، هەتا نیشتمانی کورد پارچەپارچە بێ و، لە بازاڕی ڕەشی ئیمپریالیزمی جیهانخۆردا، سەودا و مامەڵەی پێوە بکرێ و، بەئەملاو ئەولا بفرۆشرێ و، هەتا مافی قەوارە هەبوون و دەوڵەت هەبوون، وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا بە کورد ڕەوا نەدیترێ و، کورد وەك منداڵی زڕ، هەرجارە لەلایەن دراوسێیەکەوە، چەپۆکی بێڕەحمانەی پێدابدرێ و

www.alibapir.com



داپەڵۆسریٚ! مانای وایە لەڕوانگەی ئیسلامەوە، کێشە و گیروگرفتی کورد هەر بەردەوامە و، بۆ گەلی کورد مافێکی سروشتیی و ڕەوایە، کە هەرچی توانای هەیە بیخاتە کار، بۆ بوونی خۆ سەلماندن و، خۆ قوتارکردن لەژێر چەپۆکی و چەوساوەیی و، وەدەست هێنانی ئازادیی و سەربەخۆیی ڕەوا و شەرعیی!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

باتۆش و هەموو کەسێکی دیکەش بزانیٚ، کە ئێمەی (ئیسلامیی) و شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بیٚ پێچ و پەنا و بەڕاشکاویی دەڵێین:

چارەسەری مەسەلەی کورد لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە، کە کوردیش مادام وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا، خاوەنی زمان و نیشتمانی تایبەتی و سەربەخۆی خۆیەتی، بەهیچ ڕەنگێك ڕەوا و شەرعیی نیە، بکرێتە پاشکۆی گەلێکی دیکە، یان هاوولاتییەکی پلەدوو!!

چونکە چەندە عارەب عارەبە و، تورك تورکە و، ئینگلیز ئینگلیزە، هێندەش کورد کوردە![1]

واتە نەتەوەی کوردیش لە نەتەوە(شعب) بوون دا، هیچی لە نەتەوەکانی دیکە کەمتر نییە، ئەدی بۆچی دەبیٚ شتێك، کە بە نەتەوەکانی دیکە ڕەوا بینراوە، بەکوردیش ڕەوا نەبینریٚ؟!

---

(١) چەند جارێك لەگەڵ برا ئیسلامییە عارەبەکاندا، بۆتە کێشە و مشت و مڕی توندمان، لەسەر پێداگرتن و جەخت کردنی ئەوان لەسەر ئەوە، کە هەر قسەیەکی کورد لەسەر کوردایەتیی و باسی ماف و قەوارەی نەتەوەیی، ئەوە بە دژایەتیی عارەب تەواو دەبیٚ و، ئیسلامیش پیٚ ی ڕازیی نیە!! ئێمەش پێمان گوتوون: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)) رواه مسلم. تنجا ئەگەر کیان و دەوڵەت هەبوونتان بۆ خۆتان پیٚ باشە، بۆ ئێمەشتان پیٚ باش بیٚ! بۆچی ئێوە (٢٠) دەوڵەتتان زیاتر هەبن، بەڵام برا کوردەکانتان یەکێکیان نەبیٚ؟! ئەگەر پێشتان باش نییە و دەڵێن: ئێمەی عارەبیش ئەم واقیعە سیاسییەمان بەزۆر بەسەردا سەپێنراوە و، بەپێی پەیمانی (سایکس پیکۆ) وامان لێکراوە! دەڵێین: دەباشە مادام وایە، ئەو سنوورە جوگرافیی و سیاسییانەی ئیمپریالیزم بە شتێکی پیرۆز (مقدس) مەزانن. وەرن با پێکەوە خەبات بکەین بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەخشە سیاسیی و پیلانە زاڵمانەیەی ئیمپریالیزم، کە جیهانی ئیسلامیی بەش بەش کردوە!

www.alibapir.com



بەڵام با هەموو کەسێك بزانێ! کە ئێمە بەهیچ جۆرێك مەبەستمان لە خستنەڕووی ئەم ڕاستییە ئەوە نییە، کە ئۆممەتی ئیسلامیی بە بیانووی سەربەخۆیی نەتەوەکانەوە، لەت وپەت بکەین!! (هەرچەندە لەت و پەتیش کراوە)!!

ئنجا دابینکردنی مافی گەلی کورد و هەر گەلێکی دیکەش، بەشێوەیەکی ئیسلامیی، بەهیچ شێوەیەك سەرناکێشێ بۆ لەت و پەت کردنی نیشتمانی ئیسلامیی و، پەرتەوازەبوونی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ئەو ماف دابینکردن و ئازادیی و سەربەخۆیی وەدەست هێنانە، لەڕوانگەی ئیسلامەوە، بەدوو شێوە مومکین دەبێ،[1] کە هیچ کامیان زیان بە یەکیەتی جیهانی ئیسلامیی و ئۆممەتی ئیسلامیی ناگەیەنن:

١- ئەگەر بگونجێ دەوڵەتێکی بەرفراوانی ئیسلامیی، لەسەر ئاستی ئۆممەتی ئیسلامی و نیشتمانی ئیسلامی پێك بێ، گەلی کورد بەشێکی ئەو ئۆممەتە و، نیشتمانەکەشی ناوچەیەك و ویلایەتێك بێ لەو نیشتمانە فراوانە.

٢- ئەگەر پێکهاتنی دەوڵەتی فراوانی ئیسلامیی مومکین نەبوو، ئەوا هەروەك چۆن عارەبستان و تورکستان و ئەفغانستان و هیندستان، هەن، با (کوردستان)یش هەبێ و، ئاڵای ئیسلامیی لەسەر بشەکێتەوە.[2]

ئنجا با بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری سێیەم و کۆتایی:

---

(١) دیارە ئێمە بڕوامان وایە، کە چارەسەری شەرعیی و ڕاستەقینەی کێشەی کورد، دەبێ بەیەکێك لەم دوو شێوەیە بێ، بەڵام وێڕای ئەمەش بڕوامان بە پلەپلەیی (تدرُّج)یش هەیە و، مەرج نییە ئینسان بتوانێ یەکسەر بە یەك قۆناغ بە ئامانج بگات، کەواتە هەر هەنگاوێك، کە لە ئامانجمان نزیك دەکاتەوە، بەشتێکی پەسند و چاکی دەزانین، گرنگ ئەوەیە ئێمە هەقە شەرعییەکە و چارەسەرە ڕاستەقینەییەکەمان هەر لەبەر چاو بێ و لەبیرمان نەچێتەوە.

(٢) بێگومان کوردستان لە سەردەمی خیلافەتی ئیسلامییدا لە ماوەی چوار جێنشینەکان و ئومەوییەکان و عەبباسییەکان و عوسمانییەکاندا، لەت و پەت نەکرابوو و، کوردیش بەش بەش نەبوو بوو، بەڵکو نیشتمانی کورد، دوای لێشاوی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا و، هێرش هێنانی بۆ سەر جیهانی ئیسلامیی و، بەتایبەتی دوای دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر دەوڵەتە زلەکاندا، پارچەپارچە کرا و بەشرایەوە. وەك پێشتر باس کرا، بڕوانە کتێبی: (کیف هدمت الخلافة)ی عبدالقدیم زلوم. ل٩٨.

www.alibapir.com



## سێیەم: مەسەلەی کورد بەچی چارەسەر دەکرێ؟!

لە ڕوانگەی ئێمەی ئیسلامیی و پابەندی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم)، تاقە ڕێگای بە ئامانج گەیشتن و تاقە دەرمان و چارەسەری هەموو دەرد و گیروگرفتێك، تەنها بەرنامەی خوا و ڕێ و شوێنی (محمد المصطفی)یە (صلی الله علیە وسلم).

بەڵێ! ئێمە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم)، نەك تەنها بە ئامانجی ڕزگاریی و سەربەخۆیی دەگەین، بەڵکو هەموو ئاوات و ئامانجێکی بەرز و پیرۆزی ماددیی و مەعنەویی و، دنیا و دواڕۆژان وەدەست دێنین، چونکە ڕزگاربوون و بەمراد گەیشتنی گەلی چەوساوەی کورد و، هەر گەلێکی دیکەی وەك ویش، پەکی لەسەر سێ مەرجی سەرەکیی کەوتوە، کە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە، هەرسێکیان دێنە دی:

١- تێکۆشان (الجهاد).

٢- لەسەر پێی خۆ وەستان (الإعتماد علی الذات).

٣- یەکڕیزیی و کۆڵ نەدان (وحدة الصف والثبات).

**بەڵێ، ئیسلام وا لە شوێنکەوتوانی دەکات:**

**یەکەم:** کە ژیان و مردن و مان و نەمانیان، لەپێناوی خوادا بێت و، لەپێناوی چەسپاندنی حوکمی خوادا، هەموو شتێك بەخت دەکەن.

**دووەم:** هەروەها وایان لێدەکات، کە بەهۆی پشت بەخوا بەستن (التوکل علی الله)ەوە، یەکجار پشت ئەستوور بن و، زۆر متمانە بەخۆیان بکەن و، خۆیان بە حەوجێی سواڵ و سەدەقەی ئەملا و ئەولا نەزانن!

**سێیەم:** دیسان وایان لێدەکات، کە دڵیان پێکەوە گرێ بدرێ و وەك چینی دیوارێکی پێکەوە جۆش دراوو مەحکەم، یەکدی ڕاگیر بکەن و پشتی یەکدی بگرن و، هەتا دواهەناسەی ژیانیان، درێژە بە خەباتیان بدەن و، خەبات و فیداکارییەکەشیان بە فەرمانبەریی (طاعة) بۆ خوا لەقەڵەم بدەن.

www.alibapir.com


## ٧- ڕەواندنەوەی تەم و مژی بۆچوونێکی هەڵە

هەندێ کەس، کە باسی چارەسەری ئیسلامت بۆ کردن، سەبارەت بەکێشەی نەتەوایەتیی، دەڵێن:

کاکەگیان! مەسەلەی چەوساوەیی ئێمەی کورد، مەسەلەیەکی ئایینیی و ئیسلامەتیی نییە، چونکە ئێمە لەڕووی ئیسلامەتییەوە ناچەوسێینەوە، بەڵکو لەڕووی نەتەوایەتییەوە دەچەوسێینەوە، بە واتایەکی دیکە:

ئێمە وەك کوردێك دەچەوسێنرێینەوە، نەك وەك مسوڵمانێك، کەواتە: دەبێ شۆڕش و خەباتەکەمان، لەسەر بنچینەی کوردایەتیی بێ، نەك (ئیسلامەتیی)!!

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

**١**- لەڕاستییدا ئەم قسانە، زادە و هەڵقوڵاوی عەقڵی کەسێکن، کە لە ئیسلام حاڵی نەبووە و، پێی وایە، کە مسوڵمانەتیی بەس بریتییە لە بەڕێوەبردنی چەند دروشمێکی مەعنەویی و، چەند هەڵس و کەوتێکی شەخسیی!! ئەگەرنا دەبوو زانیبای، کە چەوساندنەوەی، تەنانەت تاقە ئینسانێك، نەك نەتەوەیەك! کارێکی بێشەرعیی و نائیسلامییە و، دەبێ مسوڵمانان دژی بوەستن.

**٢**- لەڕوانگەی ئیسلامەوە، هیچ جیاوازیی نییە لەنێوان ئەوەدا، کە نەهێڵن بابایەکی کورد نوێژێ بکات، یان نەهێڵن لەخاکی خۆیدا بە ئازادیی بژی و، بەرگ و پۆشاکی خۆی دەبەر بکات و، بەزمانی خۆی بدوێ، چونکە هەروەك چۆن نوێژکردن فەرمانی خوایە، ئازادیی و سەربەخۆیی هەر ئینسان و گەلێکیش، فەرمانی خوای لەسەرە!

www.alibapir.com



خواش لە قورئانێدا، قوتاربوون لە دەرووی سەختی قیامەتیی، بە چەند شتێکەوە بەستۆتەوە، کە یەکەمیان ئازادکردنی ئینسانێکە، چ جای گەلێك! لەژێر نیری کۆیلایەتیی: ﴿ فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ (١٤) ﴾ البلد:١١-١٤.

٣- ئەگەر سەرنجی مێژووی ئەو گەلانە بدەین، کە دروشمی نەتەوەپەرستییان بەرز کردۆتەوە، دەبینین، یان بە ئامانج نەگەیشتوون - بۆ وێنە عارەب و کێشەی فەڵەستین-، یان ئەگەر بەرواڵەت بە ئامانجیش گەیشتبن، بوو ونە میکرۆبێکی پیس لە ناوچەکەدا، وەك تورکە کەمالییەکان[1] و عارەبە بەعسییەکان.

٤- وادیارە ئەم برادەرانە بەهەڵە واحاڵی بوونە، کە مسوڵمانەتیی و کوردایەتیی، دوو شتی پێکەوە دژن و، قەت ناگونجێ پێکەوە کۆببنەوە! بێخەبەر لەوەی، کە - وەك لە ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە - بابای کوردی مسوڵمانی چەوساوە و ماف زەوت کراو، ئیسلام نەك هەر ڕێگای دەدات، بەڵکو فەرمانی پێدەکات و لەسەری فەرز دەکات، کە خەبات بکات، دژی ئەوانەی زوڵم و ستەمی لێدەکەن، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((من قُتل دون مظلمته فهو شهيد)) رواه ابوداود. واتە: (هەرکەسێك لەکاتی بەرگریی کردن لەخۆیدا - بەهۆی زۆر لێکرانەوە - بکوژرێ ئەوە شەهیدە)، دیارە کوردایەتییەکیش لەسەر بناغەی ئیسلام بنیات بنرێ، بەهێزترە و دامەزراو و عاقیبەت خێر دەبێ!

---

(١) بۆ ئەوەی بزانی بیری ناسیۆنالیزمی تورکیی، کە لە کەمال ئەتاتۆرك و دەستە و دایەرەکەیدا خۆی دەنواند، چی بەسەر گەلی کوردمان هێناوە، بڕوانە: (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد) نووسینی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ل٦٧-٨٨.

دیارە ڕەفتاری بەعسییەکانیش، هێندە زەقە، پێویستیی بە باس کردن نییە، هەرچەندە ئێمە لە پێناسەی حیزبی بەعس دا، تۆزێکمان باس کردوە.

www.alibapir.com



**خوێنەری سەنگین!**

ئەم بەشی چوارەمە، وەك لەڕێ خۆشكردنیشدا گوتوومە: لەم چاپە نوێیەدا زیاد كراوە[١]، چونكە وەك سەرنجم دا، باس و بابەتەكانی بەشەكانی دیكە لە بارودۆخێكی دیكەدا و بەشێوازێكی دیكە نوسرابوون، هەرچەندە هێشتنەوەیانم بەپێویست زانی، بەڵام پێم وایە پڕ بەپێستی واقیع و بارودۆخی ئێستامان نین، ئنجا بۆ پڕكردنەوەی ئەو كەلێن و بۆشاییەی، كە بەدیم دەكرد، لەژێر ناوونیشانی: (مسوڵمانەتیی و كوردایەتیی..)دا، یازدە (١١) كورتە باسم نووسین، كە بێگومان لە هەندێك كاردانەوە بۆ ڕووداو و هەڵوێست و كارەساتەكانی ئەم بارودۆخەمان، خاڵیی نین و، پێم وایە: قسە نووسین، ئەگەر لەسەر بنچینەی پەیوەست بوون بەواقیعەوە و، تەفاعول لەگەڵ كردنی، بنیات نەنرێ، زیاتر دەبێتە شتێكی خەیاڵیی و ئایدیایی، هەمیشە زیندوویی و تازەیی و پڕ بەپێستی واقیع بوونی قورئانیش، وێڕای فەرموودەی خوا بوونی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیە، كە بەداخەوە ئەوانەی قورئان ناناسن، لێی بێخەبەرن.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) مەبەست چاپی دووەمە، لەساڵی ١٩٩٨ز دا.

www.alibapir.com



## ١- پێناسە و شیکردنەوەی زاراوەی (عەلمانیەت)

هەر لە کۆنەوە چەکی هەرە کاریگەر و بە بڕشتی دوژمنانی خوا و، ناحەزانی پەیام و بەرنامەکەی، بۆ بەرەنگاریی و دوژمنایەتییان، بریتی بووەلە: گۆڕین و شێواندنی ڕاستییەکان (تحریف وتشویه الحقائق) و چەواشەکردنی خەڵکی، بەسەرنج دانیش لەمێژووی بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) کە خوای پەروەردگار لە قورئانێدا، بۆی باس کردووین، ئەو ڕاستییە دەبینرێ.

بۆ وێنە: دەبینین دوای ئەوەی (موسی - علیه السلام) بە پەیامی خواوە و بە بەڵگە و موعجیزەگەلی ئاشکراوە، لەگەڵ (فیرعەون)دا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و، فیرعەون دوای ئەوەی بەچاوی خۆی دەبینێ، چۆن جادووگەرەکانی لە بەرامبەر موعجیزەکانی موسادا بەچۆك دادێن و، تەسلیمی پەیام و بانگەوازە خواییەکەی مووسا دەبن:

﴿ وَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ ﴾ الاعراف: ١٢٠-١٢١.

فیرعەون بۆ هەڵگێڕانەوەی ڕاستییەکان و، چەواشەکردن و سەرلێتێکدانی جەماوەرە کۆیلە و ژێردەستەکەی، وا پیشان دەدات، کە دەتوانێ مووسا بکوژێ! بەڵام دەیکاتە منەت لەسەر خەڵکەکە، کە هەتا ئەو کاتە لەبەر ئەوان نەیکوشتوە و، پاشان وەك پاساودانی کوشتنی مووسا، دوو تۆمەتی زۆر ناماقووڵی پاڵدەداتە لا، کە گۆڕین و تێکدانی ئایینەکەیان و، ئاژاوە و خراپە پەیداکردنە لە وڵاتدا!![1]

---

(١) ئێستاش لە ڕۆژگاری ئێمەدا، لە سەرتاسەری دنیادا بێدین و بت پەرستەکان بە ناهەق کەوتوونەتە تەقە لەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامییانەی، تێدەکۆشن بۆ گێڕانەوەی حوکمی خوا و، ڕزگارکردنی گەل و وڵاتەکانیان لە حوکمی تاغووتەکان و بیردۆزە و ڕێچکە شەیتانییەکانیان،

www.alibapir.com



خوای دادگەرو زانا لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾﴾ الغافر: ٢٦.

ئنجا یەکێك لەو وشە و زاراوانەی، کە بەهۆی گۆڕین و (تحریف) کردنیەوە، پشکێکی گەورەی هەبووە لەسەر لێتێکدان و چەواشەکردن و بەهەڵەدا بردنی خەڵکێکی زۆردا، تەنانەت لەنێو چینی خوێندەوار و خۆ بەڕۆشنبیر زانیشدا، وشەی (سیکۆلاریزم secularism)ە، کە تەرجەمەی پڕ بە پێست و ڕاستەقینەی بەعارەبی دەبێتە: (اللادینیة)، واتە: (بێدینایەتیی)، بەڵام کاتی خۆی بەهەڵە و بە مەبەستی فێڵ و سەرلێشێواندن بە (العِلْمانیة) واتە: (زانست چێتیی) وەرگێڕراوە، کە هەندێك کەس وا دەزانن پەیوەندیی بە زانیاریی (علم)ەوە هەیە و، لە ڕاستییشدا وانییە و کاکڵ و جەوهەری (سیکۆلاریزم): پچڕاندنی ژیان و گوزەرانە لە ئایین و بەها بەرزەکانی و، داڕشتنی بەرنامەی ژیانە، لەسەر بنچینەی بڕوانەبوون بەخوا و ڕۆژی دوایی و ئایین و بەها(قیمة) بەرزەکانی، ئەوەتا ئینسکلۆپیدیای بەریتانیی (دائرة المعارف البریطانیة) لە پێناسەی وشەی (secularism)دا دەڵێ:

"(سیکۆلاریزم) بریتییە لە: جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتیی، دەیەوێ خەڵکی لە گرنگییدان بە دوارۆژ، وەرسووڕێنێ، بەرەو گرنگیی و بایەخدان بەژیان و گوزەرانی دنیا، چونکە خەڵکی لە سەدەکانی نێوەڕاست (العصور الوسطی)دا،

---

کەچی ئەو بێدین و دژ بەخوا و خەڵکانە، کە خۆیان هەر بڕوایان بەخوا و ئایینەکەیشی نییە و، ماك و میکرۆبی فەساد و ئاشووب و هەران لە وڵاتدا و، مایەی نەگبەتیی و قات و قڕیی و بێخێریین!!

ئیسلامییە خواپەرست و ڕەوشت بەرز و خەڵك دۆستەکان، بەبێ دین و ئاژاوەچیی، تۆمەتبار دەکەن! بەڵێ، کافرەکانی ڕۆژگاری خۆشمان، هەرچەندە لافی گەشەکردن و نوێخوازیی و بەرەوپێش چوون لێبدەن، بەڵام هەر لەسەر مەزەب و عەقڵە کۆنەکەی فیرعەونن و، هەمان چەکی ژەنگاویی ئەویشیان بەدەستەوەیە! ئاخر پێم ناڵێن: فیرعەونەکان (دین)یان لەکوێ بوو، هەتا خۆیانی لەسەر توورە بکەن و، واپێشانی خەڵکی سادە و فەقیرحاڵ بدەن، کە ئەوە بەرگریی لە دین و ژینی ئەوان دەکەن، نەك لە کورسی و زەعامەت و بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیان!!

www.alibapir.com



مەیلێکی زۆریان هەبوو بۆ دوورەپەرێزی لەژیانی دنیا و تێوەڕامان دەربارەی خوا و ڕۆژی دوایی، ئنجا بەمەبەستی بەرهەڵستیی کردنی ئەو جۆرە (مەیل)ە، سیکۆلاریزم دەستیکرد بە خۆڕانواندن لە میانە(خلال)ی دەماری ئینسانەتیی دا، بەوپێیە خەڵکی لە سەردەمی ڕاپەڕینی زانستیی مرۆڤایەتیی و، بەوەی کە دەگونجێ هەر لەم ژیانە نزیکە دنیاییەدا، ئاوات و ئارەزووەکانیان بهێننە دی، ئاوا ڕێڕەوی (secularism) بەردەوام بوو، لەسەر گەشەکردنی خۆی لەماوەی سەرجەم مێژووی نوێدا، بەو ئیعتیبارە، کە جووڵانەوەیەکی دژی ئایینیی و دژی مەسیحییەتە". [١]

بەڵێ! ئەوروپاییەکان، کە بەرهەم هێنەری سیکۆلاریزم و، باقی ڕێچکە و بیردۆزە مرۆڤزادەکانی دیکەشن، ئاوا پێناسەی (secularism)مان بۆ دەکەن، کە بیردۆزەیەکە لە کاردانەوە (ردفعل)ی دامودەزگاکانی کڵێسادا پەیدا بووە و جەوهەر و نێوەڕۆکەکەیشی بریتییە لە دوورخستنەوەی تاك و کۆمەڵ لە خواو ڕۆژی دوایی و ئایین و، بنیات نانی ژیان و گوزەران، لەسەر بنچینەی ماددەپەرستیی و بەس دنیاویستیی و گوێپێنەدان و گرنگیی نەدان بە ئایین و ئەخلاق!

ئێستاش دوای ئەوەی لە زمانی خەڵك و خاوەنی سیکۆلاریزمەوە، گوێمان لە پێناسەکەی بوو و، زانیمان چییە و چۆنە؟، بەپێویستیی دەزانم چەند ڕاستییەکی گەورە و گرنگ بخەینە ڕوو:

**یەکەم:** مادام ئەورووپاییەکان خۆیان بەڕاشکاویی و بێ پێچ و پەنا دەڵێن: (سیکۆلاریزم) واتە: (بێدینایەتیی)، نەدەبوو پەیڕەوان و شوێنکەوتوانی بیردۆزەی گۆڕین، بە مەبەستی سەرلێشێواندن و چەواشەکردن، لەلای خۆیانەوە، واتا و مەبەستی دیکەی بۆ هەڵتاشن و جورئەت نەکەن، کە وەك خۆی بەڕاشکاویی بیناسێنن!

-----

(١) بڕوانە کتێبی (مذاهب فكرية معاصرة)ی محمد قطب، ل٤٤٥، کە ئەویش لە (Encgc. Britanica، v.ix، p19)ی وەرگرتوە.

www.alibapir.com



**دووەم:** مادام سیکۆلاریزم، زادە و هەڵقوڵاوی کۆمەڵگا ئەوروپاییەکانە و بۆ ئەوان، کە بۆ ماوەی چەندان سەدەی دوورودرێژ - بەر لەوەی کودەتا بکەن بەسەر دامودەزگاو پیاوانی کڵێسادا - گیرۆدەی تەڵە و داوی قەشەو پاپایەکان و ئەفسانەکانیان و خۆسەپاندن و سۆغرە و بێگار و باج و پیتاکی جۆراوجۆر ئەستاندنیان بوو بوون و، لە سۆنگەی ئەوەشەوە بە مەعنای وشە، لە تاریکستانی نەزانیی و نەفامیی ئەنگوستەچاودا دەژیان، شتێکی سروشتیی و چاوەڕوانکراو بوو.

بەڵێ، سیکۆلاریزم و باقی ڕێچکە و بیردۆزەکانی دیکەی ڕۆژئاوا، بۆ ڕۆژئاواییبیە گرفتار و سەرگەردانەکان، شتێکی سروشتیی و چاوەڕوانکراو بووە، چونکە هیچ چارە و پەنای دیکەیان شك نەبردوە، ئینسانیش، کە بە ڕووبار داچوو، دەست بۆ پووشێش دەبات!

بەڵام ئێمە بۆچی یەکسەر و بێ سێ و دوو، تووتییانە قسە و هەڵوێستی ئەوان، لە کات و شوێنێکی جیا لەوەی ئەواندا، دووبارە بکەینەوە؟! بەر لەوەی بیر بکەینەوە و لەخۆمان بپرسین، کە ئایا ئایینی ئێمە و بارودۆخی ئێمەش، هەر وەك ئەوەی ئەوانە؟ تاکو ڕەوا و ڕاست بێت، لە هەڵوێست و ڕەفتارماندا لاساییان بکەینەوە و، وەك ئەوان بکەین، یان جیایە و، پێویستە هەڵوێستێکی جیاش بنوێنین؟!

بەڕاستی من، کە هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانە ئاوا دەبینم، هەر ئەوەم دێتە بەرچاو، کە یەکێك (دووپشك) بەپێیەوەی دابێ و، لەتاو ئازاری پێی، دەست بکات بە هەڵپەڕین و هەڵبەز و دابەز، یان لە حەژمەتی (دان ئێشە) سەری بسووڕێنێ و خۆی بەدارو دیواردا بکێشێ، یەکێکی دیکەش هەر لەخۆوە و بەبێ هۆ، بێئەوەی لە هۆکاری هەڵبەز و دابەز و سەرسوڕاندنەکەی وردبێتەوە و حاڵی بێ، مەسەلە چییە، لاسایی بابای دووپشك پێوەدراو و، ژانەدان گرتوو بکاتەوە و، وەك ئەوان دەست بکات بە هەڵپەڕین و خۆ بەدارودیواردا کێشان!!

ئاخر بابای ئەوروپایی بێچارە، کە بەدەست ئایینێکی شێوێنراو و گۆڕراودوە گرفتار بووە و، هەر لە ئەسڵیشدا ئەو ئایینە - کە ئایینی مەسیحییە - بۆ

www.alibapir.com



ڕۆژگار و بارودۆخی وی ڕەوانە نەکراوە و، لە ئایینی ڕاست و دروست و پڕ بەپێستی مرۆڤایەتیی و دەستکاریی نەکراویش - کە ئیسلامە - بێئاگایە، جگە لە هانابردن بۆ ئەو بیردۆزە و ڕێچکانەی، کە عەقڵی پێیان شکاوە و بەرهەمی هێناون، چ ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەم دایەو، ڕوو لە کوێ بکات؟!!

بەڵام تۆی خۆ بە مسوڵمان زان، کە قورئان و سوننەت و ئەزموونی سێزدە (١٣) سەدە، حوکمی ئیسلامت لەبەردەست دایە و ڕۆژێك لەڕۆژان کێشەیەکی وەك: دادگای سانسۆری بیروباوەڕ (محاكم التفتيش) و پسووڵەی لێبوردن (صكوك الغفران) و (برۆنۆ)[1] بە چیخەوە سووتێنران و، تۆبە بە (گالیلۆ)[2] کران و، ڕێ لە عەقڵ بەکارهێنان و زانست وەدەست هێنان و... هتد، نەبووە و، هەرگیز زانا و پێشەوا ڕەسەنەکانی ئایینەکەت، وەك قەشە و پاپاکان، لەگەڵ دەرەبەگ و سەرمایەدارەکاندا، نەبوونە پێرێك و ببنە ملۆزمی جەماوەری چەوساوە و نەدارو وەك جووتە گورگی هار بەربنە گیانی کۆمەڵگا..

بەڵێ! تۆیەکی ئاوا، بۆچی خۆت هەتلە دەکەی و، چاو لەم و لەو دەکەی و، ڕەفتاری نامەنتیقییانە، لەگەڵ ئایین و کۆمەڵگا و بارودۆخی تایبەتی خۆتدا دەکەی؟!

**سێیەم:** من بۆیە وشەی (عەلمانیەت) بەکاردێنم، چونکە ڕای ئەم توێژەرەوانەم پێ بەهێزترە، کە دەڵێن: کاتی خۆی وەرگێڕە عارەبەکان وشەی: (secularism) یان بە (العالمانية) وەرگێڕاوە، واتە: (الدنيوية)، کە لە کوردییدا دەبێتە (دنیاپەرستیی) یان (دنیاویستیی).

---

(١) مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، کە دامودەزگای کڵێسا لەسەر ئەوەی، کە (برۆنۆ) باسی سوڕانەوەی زەوی کردبوو، بە دەوری ڕۆژدا، بە فەرمانی پاپا حوکمی سووتاندنی درا و، لە (چیخ)ێکیانەوە پێچا و سووتاندیان!

(٢) (گالیلۆ)ش لەسەر ئەوەی باسی خڕێتیی زەویی کردبوو، بۆ ئەوەی حوکمی لەسێدارەدانی نەدەن، ناچاربوو بچێتە خزمەت پاپا و دەستی ماچ بکا و، لەو قسانەش کە کردوونی پەشێمان بێتەوە و تۆبە بکات!!

www.alibapir.com



دەڵێن: بەڵام دوایی بۆ ئەوەی وشەکە لەسەر زمان سووك بێت، گۆڕراوە بۆ (العَلْمانية)، بەڵام عەلمانیی و بێدینەکان، بۆ چەواشەکردنی خەڵکی و، سووك کردنی چارەی عەلمانییەت، بە (عیلمانیەت) نوتقیان پێکردووە!

ئنجا لەڕاستیدا، کە لەم مەسەلەیە ورد دەبمەوە، هەر وشەی (ئیستعمار)م دێتەوە بیر، کە چۆن ئیمپریالیزمی جیهانیی و کلکەکانیان لەنێو مسوڵمانانندا، بۆ فریودانی خەڵکی و سووك کردنی ڕەزای قوڕسی ئیمپریالیستە جیهانخۆرەکان وشەی (إستعمار)یان کردە ناوو شۆرەتی داگیرکەران و، بەتاڵان بەرانی خێر و بێری جیهانی ئیسلامیی، بەڵام سەرەنجام فێڵەکەیان سەری نەگرت و لەجیاتی ئەوەی مەعنای جوان و دڵگیری وشەی گۆڕین، کە بریتییە لە (ئاوەدانیی و خێرو خۆشیی)، چارەی گرانی ئیمپریالیستەکان سووك بکات و، ڕووی ڕەشیان سپی بکاتەوە، بەپێچەوانەوە چارەی قورسی ئیمپریالیستەکان و ڕووی تاڵخ و ڕەشیان، چارە و ڕووی ئەو وشە گەش و جوانەیان، تێك داو، ئێستا لەنێو ئۆممەتی ئیسلامدا، خەڵکی مسوڵمان هەستیارییەکی زۆریان بەرامبەر بە وشەی (إستعمار) هەیە و، حەز بە بیستنی ناکەن!

من دڵنیام، کە چارەنووسی عەلمانییەتیش، چ بە (علمانیة) نوتقی پێ بکرێ، چ بە (علمانیة) و، چ بە بێدینیی، یان دنیاپەرستیی، سەرەنجام هەر وەك چارەنووسی ئیستیعمار دەبێ و دیارە هەقی خۆشیەتی، چونکە ئەگەر ئیستیعمار داگیرکردنی ماددیی و بەتاڵان بردنی خێر و بێری وڵات بوو، سیکۆلاریزمیش داگیرکردنی مەعنەویی و - بەخەیاڵیی خۆیان - لەبەین بردنی ئایین و عەقیدە و ئەخلاقی ئۆممەتە و، گومانیشی تێدا نییە، کە هی یەکەمیان لەچاو هی دووەمیان، زۆر سووکتر و کەم مەترسیی ترە!!

www.alibapir.com



## کورتـەی قسـان:

سیکۆلاریزم لەنێو کۆمەڵگایەکی تایبەت و، بارودۆخێکی فیکریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی تایبەتدا، کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایە، پەیدا بووە و، دیارە ئەو کۆمەڵگایەش، خۆیان چەمك و واتا و مەبەستیان بۆ دیاریی کردوە و، ناگونجێ ئێمە لەلای خۆمانەوە مەعنا و مەبەستی دیکەی - کە خۆمان حەزمان لێیەو بەچاکی دەزانین - تێبخزێنین، چونکە ڕەفتاری وا هەم خیانەتە بەو بیردۆزە و ڕچەیە و، هەم بەو خەڵك و کۆمەڵگایەش، کە ئێمە بەهۆی گۆڕین (تحریف)ی وشەی گۆڕینەوە، بە سەهوویان دەبەین و چەواشەیان دەکەین.

کەواتە بەلای کەمەوە، ئەگەر هەر ناشڵێین: (بێدینایەتیی)، یان (دنیاپەرستیی) بۆ پێناسەی (secularism)، با بڵێین: (دنیاگەرایی)، یان (دنیاویستی)، بۆ ئەوەی هەر چۆن بێ، تەعبیرەکەمان ئەندازەیەك لە ماهیەت و جەوهەری ئەو وشەیە نزیکتر بێت[١].

جا بۆیە ئێمە لەم نووسینە و هەر نووسینێکی دیکەشماندا ئەگەر وشەی (اللادینیة - بێدینایەتیی)یش بەکار نەهێنین، ئەوە وشەی عەلمانیەت، یان دنیاگەرایی، بەکار دێنین، جاری واش دەبێ، هەر عەینی وشەی ئەسڵیی، بە ئیملای کوردیی بەکاردێنین، کە (سیکۆلاریزم)ە، هەندێك جاریش بۆ بابایەکی، یان کۆمەڵێکی سیکۆلاریست، وشەی (لائیك)، کە هەر هەمان سیکۆلاریستە و لەزمانی فەڕەنسییدا بەکاری دێنن و، فارسیش لەوانیان خواستۆتەوە، بەکار دێنین.

---

(١) بڕوانە (ورقة ثقافية في الرد على العلمانيين)ی د.محمد يحيى، بۆ زیاتر ئاگاداریش لە پووچەڵیی ڕێچکەی عەلمانییەت، دەتوانی سەرنجی ئەم کتێبانە بدەی: (تهافت العلمانية) د.عمادالدين خليل، و (الإسلام والعلمانية وجهاً لوجه) د.يوسف القرضاوي، و (العلمانية) د.سفر الحوالي، و (مذاهب فكرية معاصرة) الأستاذ محمد قطب.

هەروەها ئێمەش لەهەرکام لە کتێبی {چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم} چاپی شەشەم و، کتێبی {تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان} چاپی سێیەم دا، بەدرێژیی، لەبارەی سیکۆلاریزمەوە، دواوین.

www.alibapir.com



## ٢- ئەزموونی قەوارەی سیاسیی کورد لە کوردستانی سەر بەعێراقدا و چەند ڕاستییەکی تاڵ

پەیدابوونی کیان و قەوارەی سیاسیی، خولیا و ئاواتی لەمێژینەی گەلی کوردە، لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا، ئەو گەلە ئازا و مەردە لەو ڕێیەدا، خەباتێکی دوورودرێژی پڕ خەم و خوێن و کەند و لەندی کردوە، بە تایبەت لە بەشە کوردستانی سەر بەعێراق دا، کە لە هەمووان ئاشکرایە دوای دەیان ساڵ خەباتی سیاسیی و چەکداریی و، لە ئەنجامی ڕاپەڕینی جەماوەریی شکۆمەندی ساڵی (١٩٩١)دا و، پاشان کۆچڕەوی چەند ملیۆنییدا، بارودۆخ بەشێوەیەك گۆڕا، کە زەمینە بڕەخسێ بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن (إنتخابات) و، پاشان پێکهێنانی پەرلەمان و، دواتریش دامەزراندنی حکومەتی هەرێم، لە بەشە کوردستانی سەر بەعێراق دا، بەڵام بەداخەوە دوایی چی ڕوویدا؟

زنجیرەیەك شەڕ و کوشتاری نێوخۆی (دەوەن بەئاش ئاسا)، کە جگە لە تێچوونی پەرلەمان و حکومەت و لەت بوون و دابەش بوونی بەشە کوردستانی عێراق! سەدان کوشتە و بریندار و سەقەت و ئاوارەبوونی هەزاران ماڵەکوردی بێچارەو دەرەتانی لێکەوتەوە!

بەڵێ! هەرچەندە ئێستا لە کوردستاندا بارودۆخێکی دیکەیەوە، ئومێدی باشی لێدەکرێ، بەڵام حەیف و مەخابن! لایەنە سیاسییە سیکۆلاریستەکانی کوردستان، لەجیاتی جێبەجێکردنی ئەو هەموو گفت و بەڵێنە سەوز و زەرد و سوورە، جوان و شیرینانەی، کە بەخەڵکیان دا، بۆ گیانی یەکدی و گەل و وڵاتی

www.alibapir.com



کەساس و بێکەسیشیان، بوونە گێژەڵووکەی[1] تێکەوە پێچەر و، لێزماوی[2] ڕامالەر و، کارێکیان بەگەل و وڵاتی بێ ناوونیشان کرد، با بەدەواری شڕی نەکردبێ، بێئەوەی لەخۆیان بپرسن: ئایا ئەوەی بە شانازییکردن و بەدەست و بازووی خۆهەڵاگوتنەوە: لوولی دەدەن و، ڕای دەماڵن، کێیە و کوێیە؟!

ئنجا لەئاکامی ئەو هەراو کێشە و یەکدی هێنان و بردنەشدا، ناوزڕان و ناشیرین بوون لە دەرەوەی وڵات و، دوژمن پێخۆشبوون و زەمینە خۆشبوونی دەست تێوەردانی وڵاتانی ناوچەکە و، دوورتریش، سەرباری خەمان!

ئێمە دەڵێین: دەردی کۆمەڵگای ئێمە لەوە قورستر و قووڵترە، کە هەروا بەئاسانیی چارەسەر بکرێ و، تەنها بە پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسیی، کە مافی شەرعیی و سرووشتیی کورد و هەر گەلێکی دیکەشە- لە خەم بڕەخسین و بەختەوەر بین، بەڵکو وێڕای ئەمەش، ئێمە پێویستیمان بە شۆڕشێکی عەقیدەیی و فەرهەنگیی و ئەخلاقیی و، خۆگۆڕینێکی بنجیی و ڕیشەیی هەیە، تاکو بتوانین بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، بەڕێوە بچین و پێکەوە بژین و، سوود و بەهرە لە کیان و قەوارە سیاسییەکەشمان وەربگرین، ئەدی ئەوە نییە خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ الرعد: ١١.

بەڵێ! با بە هەوڵ و هیممەتی هەموو لایەك، کرد و کۆش بۆ ئەوە بکەین کە کیان و قەوارەی سیاسییمان لەسەر بناغەی ڕەسەنایەتیی ئیسلامیی (الأصالة الإسلامية)یمان بنیات بنێین، بۆ ئەوەی کیانێکی یەك دەنگ و یەك ڕەنگ و دامەزراو و نەلەخشاو بێت، نەك بە پارە و داهاتی خەڵکی کوردستان، بە دەست و زمان بکەوینە وێزەی یەکدی و کۆمەڵگاکەمان چەندان سەدە بگێڕینەوە دوایەوەو شەڕ و کێشە و گوریس پچڕکێنەکانی میرنشینەکانی: (بابان و ئەردەڵان و، سۆران و بۆتان) دووبارە بکەینەوە، کە ئەوانیش لەبەر بیرتەسکیی و خۆویستییان و، پاشان بە فیت و دەست لەپشت دانی صەفەوییەکان و عوسمانییەکان، زۆریان یەکدی

---

(١) و (٢) ناوی هێرش و پەلامارەکانی هێزەکانی یەکێتیی و پارتیی یە، دژ بەیەکدی، لە شەڕو کوشتارەکانی ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا.

www.alibapir.com



هێنا وبرد و، گەلێك سەروەریی دەیان شەڕی دەوەن بەئاشیان لەمێژووی كورد و كوردستاندا تۆمار كرد!!

## ٣- پەیوەندیی كارتێككردنی دووسەرە (دیالیكتیكی)ی ئیسلام و كورد

شتێكی ئاشكرایە، كە هەر لەو كاتەوەی ئیسلام و كورد ئاوێتەی یەكدی بوون و، بەیەك ئاشنا بوون، هەركامێكیان كاریگەریی هەبووە بۆ سەر ئەوی دیكە، كەواتە: ئەوانەی، كە ئەم جۆرە پرسیارانە دەكەن: " لەپێشدا ئیسلام، یان كورد؟!" یان "ئیسلام بە قوربانی كورد بكەین، یان كورد بە قوربانی ئیسلام؟!".

وادیارە شارەزای ئیسلام و مێژووی گەلەكەشیان نین! چونكە هەركەسێك بە ئەلف و بێی ئیسلام ئاشنا بێت، دڵنیا دەبێ لەوەی، كە ئیسلام بۆ هەموو گەلانی دنیا، سەراپا خێر و بەرەكەت بووە و، مایەی بەختەوەریی و عیززەتمەندیی و سەرفرازیی دنیا و قیامەتە.

گەلی كوردیش دوای ئەوەی نیر و كابووسی ئیمپراتۆری فارس و ڕۆمی لەسەر شان و سینگ لاچوو و، بەویستی ئازادی خۆی ئیسلامی لەباوەش گرت، دەیان سەروەریی و جوامێریی لە بوارەكانی زانست و پەروەردە و، بەرەكانی جیهاد و بەرەنگارییدا، بۆ ئیسلام تۆمار كرد و، گەلێك خزمەتی گەورەگەورەی پێشكەش بە ئۆممەتی ئیسلام كرد و، سەدان كەڵەپیاوی زانا و بلیمەت و سەركردە و قارەمانی لێهاتوو و بەهەیبەتی، لە قوتابخانەی ئیسلام دا پێگەیاند و پەروەردە كرد، كە ناوو ناوبانگی كوردیان، بە دنیادا بڵاوكردەوە و ناوی گەلی

www.alibapir.com



کوردیان لە سەرەتای لیستی گەلانی خزمەتگوزار و فیداکاری نێو ئۆممەتی ئیسلامییدا، تۆمار کرد.

کەواتە: پرسیاری سەفسەطەییانەی وەك: "لەپێش دا ئیسلام، یان کورد؟" هەڵەیە، چونکە هەر وەك چۆن ئایین بۆ ئینسان نێرراوە، ئینسانیش بۆ دینداریی خوڵقێنراوە، بەڵێ، (دین) بۆ (ژین)ەو، (ژین)یش دەبێ بەپێی (دین) بەڕێوە بچێ.

هەربۆیە (دین)ێك، کە لە (ژین) دادەبڕێ - وەك ئایینی گۆڕراوی نەصرانیی - دەبێتە شتێکی بۆش و، (ژین)یش، ئەگەر بەگوێرەی تەوجیهاتی (دین) بەڕێوە نەچێ، گەندەڵ و پۆخەڵ دەبێ - وەك ژیانی سەرگەردانانەی ڕۆژئاواییەکان -، مەسەلەی کورد و ئیسلامیش بە هەمان شێوە، کورد بەهۆی ئیسلامەوە، کیان و کەرامەتی پارێزراو دەبێ و، ئیسلامیش بەهۆی کورد و غەیری کوردیشەوە، لەگەلانی مسوڵمان، بەڕێوە براوە و دەبرێ و پارێزراوە و دەپارێزرێ.

دیسان پرسیاری: "ئیسلام بەقوربانی کورد بکەین، یان کورد بە قوربانی ئیسلام؟!" پرسیارێکی هەڵەو بێجێیە، چونکە مادام ئایین بۆ بەختەوەرکردنی ئینسان هاتبێ و، ئینسانیش بۆ بەندایەتییکردن بۆ خوا خوڵقابێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاریات: ٥٦.

ناچار نین یەکێك لە ئیسلام و کورد، بە قوربانی ئەوی دیکەیان بکەین و لەژێر پێیدا بیپلێشێنینەوە، بەڵکو بە کورد ئاڵا و بەیداغی ئیسلام و، بە ئیسلامیش سەری کورد بەرز و بڵند دەبێ و، هەردووکیان خزمەتی یەکدی دەکەن و مەداری یەکدی ساز دەکەن و،[1] بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێك کەسی فامکاڵ و فەقیرحاڵەوە،

---

(١) ڕەنگە هەندێك کەس مەسەلەی خەبات و فیداکاریی و، خۆبەخت کردن لەپێناوی خوادا و شەهید بوون لەو پێناوەدا، ئیشکالیان بۆ دروست بکات و بڵێن: ئەدی ئەوە نییە ئینسان بەقوربانی دین بوو!! بۆیە دەڵێین: لەڕاستیدا شەهیدبوون و خۆبەختکردنی ئینسان - کورد و غەیری کورد - لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئایین و ڕەزامەندیی خوادا، لەڕوانگەی ئیسلامەوە، گەورەترین و

ئیسلام و کورد هیچ کامیان ئامراز نین و ئەوی دیکەش ئامانج(هدف)، بەڵکو هەردووکیان لە یەك کاتدا، بۆ یەکدی بە دوو ئیعتیباری جیاجیا هەم ئامرازن و هەم ئامانجیش.

ئنجا ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژانیش، کورد بەهۆی سادەیی خۆیەوە، بەناوی ئیسلامەوە فێڵی لێکرابێ و بەشی خورابێ، ئەوە ئیسلام لەو هەڵە و تاوانە بەرییە و، پێویستە کوردیش گلەیی و گازاندەی خۆی، ئاڕاستەی سادەیی و فەقیرحاڵیی خۆی و، فێڵبازی ناحەزانی بکات، نەك ڕووی ڕەخنە و گلەیی بکاتە ئیسلامێك، کە هەم بەکوردی مسوڵمانی گوتوە، کە سادە و فەقیرحاڵ نەبێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ﴾ النساء: ٧١.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! وریایی خۆتان وەربگرن.

هەم بە ناحەزەکانیشی گوتوە: فێڵباز و تەڵەکچی نەبن ((مَنْ غشّنا، فليس منّا)) رواه البخاري.

واتە: ئەوەی فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

بەرزترین جۆری سەرفرازیی و بەمراد گەیشتنی ئینسانە، کە وەدەست هێنانی پلەوپایەی شەهیدیی و شادبوونە بەدیداری خوا و بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوە:

﴿ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤ ﴾ العنكبوت:٦٤.

www.alibapir.com



## ٤- کوردایەتیی و سەربەخۆیی لەنێوان ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان دا

گەلێك جار لە دوو ڕووەوە بەناهەق، تۆمەت، بگرە بوختانی ناڕەوا پاڵ دەدرێتە لای ئیسلامییەکانی کوردستان :

**یەکەم:** ئیسلامییەکان بڕوایان بەکوردایەتیی نییە و، بە خەم گەل و وڵاتیانەوە نین!

**دووەم:** ئیسلامییەکان وابەستەی بۆچوون و سیاسەتی خەڵکی دیکەن - دیارە زیاتر مەبەستیان عارەب و فارس و تورکە، کە سێ گەلی مسوڵمانی دراوسێی کوردن و، بەپێی نەخشە و پیلانی شوومی ئیمپریالیزمی جیهانیی، کە لە پەیمانی کافرانەی (سایکس - پیکۆ)دا دەرکەوت، نیشتیمانی کورد (کوردستان) یان بەسەردا دابەشکرا -.

ئنجا هەرچەندە ئەو قسەیە تۆمەت و بوختانە، بەڵام لێرەشدا هەر بەکورتی و زیاتریش بەمەبەستی بەراورد(مقارنة)ی نێوان ئیسلامییەکان و لائیکەکان دەڵێین:

ئایا ئەو ئیسلامییانەی، کە لە حاڵێکدا لە هەموو سامان و داهاتی کوردستان - مەگەر قووتی لا یەموت - بێبەشن و، لەبارودۆخێکی ئابووریی زۆر سەخت و دژواردا دەگوزەرێنن - بەتایبەت ئەوانەیان، کە خەباتی چەکداریی دەکەن - و لە سۆنگەی ئەو ژیان و گوزەرانە تەنگ و سەغڵەتکەرەوە، فشارێکی زۆریان کەوتۆتە سەر، بەڵام بێگوێدانە نەداریی و قەرزداریی بەردەوام و، شێلگیرانە سەرگەرمی زیندووکردنەوەی کۆمەڵگاکەیان و، ئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەیانن، بەهۆی بێدارکردنەوە و شارەزاکردنی گەلەکەیان، لە عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق و

www.alibapir.com



ئاکاری ئیسلامیی لەلایەکەوە و، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی پێشکەشکردنی کۆمەڵێك خزمەتگوزاریی جۆراوجۆری وەك: (دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانە و چاککردنی پرد و ڕێگاوبان و هاوکارییکردنی هەتیو و نەدار و لێقەوماوان)، دەگونجێ و بێویژدانی نییە، تۆمەتی کەمتەرخەمیی و گوێنەدان بە گەل و وڵاتیان بدرێتە پاڵ؟![1]

دیسان ئایا ئەو ئیسلامییانەی، کە لەکاتێکدا حیزب و تاقمە لائیکە بەشەڕهاتووەکانی کوردستان، زنجیرە شەڕ و کوشتارێکی نێوخۆی بێئاکامیان بەرپاکرد و، هەتا ئانیشکان دەستیان بەخوێنی کورد سوور کرد، بەڵام ئەوان - واتە ئیسلامییەکان - وێڕای هەبوونی فشاری جۆراوجۆر، قبووڵیان نەکرد بچنە نێو ئەو هاوکێشە شووم و بێخێرەی شەڕی کورد کوژییەوە، ئایا کامیان لە ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان، کوردایەتیی و سەربەخۆیی خۆی پاراستوە و، کامیشیان لەدەستیداوە؟!

بەڵێ! بێگومان (کوردایەتیی) و (سەربەخۆیی)، بەرلەوەی دروشم و شیعار بن، هەڵوێست و ڕەفتارن، ئاشکراشە، کە دروشم و شیعار، بە قەڵەم و مەرەکەب و لەسەر کاغەز و پەڕۆ و دیوار دەنووسرێن، بەڵام هەڵوێست و ڕەفتار، کردارن و دەبێ لە مەیداندا ڕابنوێنرێن و تۆمار بکرێن!

هەڵبەتە ئەو سەربڵندییەی ئیسلامییەکان و ڕوو سوورییەشیان لە بەردەم خوا و خەڵکدا، زادە و بەرهەمی شان و شەوکەت و لێهاتوویی خۆیان نییەو، بەس بەرەکەت و پێزی پابەندییانە بە بەرنامەی خواوە و، لانەدانیانە لە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایان (صلى الله عليه وسلم).

---

(١) هەرچەندە ئیسلامییەکانی کوردستان بەگشتی، لەڕووی خەباتی ڕزگاریخوازییەوە ساوا بوون و درەنگ دەست بەکار بوون، بەڵام ئەوانەیان، کە تەمەنیان هەراش ترە، وەك شەخص بەشدارییان کردوە لەنێو یەکێك لە کۆمەڵ و حیزبە لائیکەکاندا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ئەو کاتە ئاڵا و قیادەیەکی ئیسلامیی لەئارادا نەبووە، ئنجا لەو کاتەشەوە، کە وەچەی نوێ (الجيل الجديد)ی ئیسلامیی پێراگەیشتوە، هەرچەندە هەندێکیان کەمتەرخەم بوون و بەشدارییان نەکردوە، بەڵام هیچ کەسیش ناتوانێ، خەبات و فیداکاریی مەردانەی پێشمەرگەکانی ئیسلامیی و شەهیدە سەربەرزەکانی لەبیر بکات.

www.alibapir.com



## ٥- لایەنە عەلمانییەکانی کوردستان و ئیدیعای بەرگریی لە ئیسلام و موقەددەساتی کورد!

بێگومان ئێمە وەك مسوڵمان و ئیسلامیی، هیچ کات لە کۆمەڵێکی عەلمانیی چاوەڕێ ناکەین، بەرگریی لەئیسلامێك بکات، کە لە ڕەگ و ڕیشەوە لەگەڵی ناکۆکە و، وەك بەرنامەی ژیان و گوزەران بڕوای پێ نییە و، هەر بۆیەش ڕێبازی (اللادینیة - العلمانیة) بێدینی و عەلمانیەتی بۆ خۆی هەڵبژاردوە و، جاروباریش بەمەبەستی دڵڕاگرتنی جەماوەر، هەندێك شیعار و ڕێ و ڕەسمی ڕواڵەتیی ئیسلام، لەخۆیان و دام و دەزگاکانیاندا پێشان دەدەن، وەك: ڕێزگرتن لە مەلا و شێخ و، مانگی ڕەمەزان و، خوێندنی چەند ئایەتێکی قورئان، لە بۆنە (مناسبة)کاندا و...هتد.

بەڵام بۆمان هەیە بپرسین: ئایا بە چ پێودانگێك بەرهەڵداکردن و بوار پێدان و بگرە لەباوەش گرتن و دەست لەپشت دانی لائیکەکانی کوردستان بۆ هەندێك دەستە و تاقمی چەند نەفەری بێدین و (ئیباحیی) و ڕەوشت نزم، کە بەڕاشکاویی و بێپەردە داوای تێکەڵاویی جنسیی و، گوێنەدان بە یاسا و دەستوورەکانی شەریعەت و، داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا و نەمانی خێزان و... هتد، دەکەن و لە بڵاوکراوەکانیاندا - کە لەژێر سایەی هەردووك لەتکە حکوومەتەکەی هەرێمدا دەردەچن،[1] بە ئاشکرا و بێ ڕەچاوکردنی هیچ سنوور و پاراستنی هیچ شعوورێك،

---

(١) ئەو بڵاوکراوانەی، کە لەلایەن ئەو تاقمە بێدین و سەر لێشێواو و گەندەڵانەوە دەردەچن، زۆرن و لەهەموو جێگایەك هەن و، لە بڵاوکراوەکانی هەردووك حزبی دەسەڵاتداری حوکمڕانیشدا، بە کتێب و گۆڤار و هەفتەنامە و ڕۆژنامەوە، قسە و توانج و پڵلاری زۆر و زەوەند هەن، کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ

www.alibapir.com



جنێو و قسەی سووك بەخوا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئیسلام و قورئان و شەرع و مەلا و.. هتد. دەدەن!

بەڵێ، ئایا بوار پێدان و بەرهەڵداکردنی ئەو دەستە و تاقمە هەرچی و پەرچی و، فیکر ڕزیو و ڕەوشت تەپیوانە، بە چ پێ و دانگێك لەگەڵ لاف لێدانی کوردایەتیی و بەتەنگ کوردەوە بوون و، بەرگرییکردن لە موقەددەساتی کورد، یەك دەگرنەوە؟!

یان سیکۆلاریستانی حوکم بەدەستی کوردستان، پێیان وایە: ئیسلامییەکان هێندە سادە و بێئاگان، کە خۆیان بەرنە ڕیزی ئەو هەرچی و پەرچی گەندەڵ و پەندەڵانە و، بە خەیاڵی خۆیان، ئیسلامییە ڕەوشت بەرز و پاکەکان و ئەو بێدینە پیس و ڕەوشت نزمانە پێکەوە سەرگەرم بکەن و، خۆشیان بکەنە پیاوچاك و حەکەم لە بەینیان دا و، جارجارەش بە بیانووی لێك کردنەوە و ناوبژییەوە، سەرو زللەیان تێ بسرەوێنن و، لەو نێوەشدا خۆیان بە چاکەکار و دیندار دەربێنن!

ئاخر فێڵ و پیلانی وا، چۆن سەر دەگرێ! مەگەر ئێمەی ئیسلامیی هێندە بیر کورت و ڕواڵەت بین و بێهەواڵین، هەر درێشە دەبینین و ئەو دەستەش نابینین، کە درێشەکەی گرتوە و دەیوەشێنێ!

بەهەرحاڵ، ئێمە حەز دەکەین سیکۆلاریستەکان، یان دەست لە دژایەتیی کردنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئیسلام و، ئیهانەکردن بە (شعائر) و بەزاراوەی ئەوان (مقدسات)ی ئیسلام هەڵگرن، چونکە خوای دادگەر و تۆڵەستێن فەرموویەتی:

﴿ ...وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الحج:٣٢.

یان ئەوەیە، با چی دیکە لافی دڵسۆزیی بۆ کورد و، ڕێزگرتن لە ئایین و دروشمەکانی گەلی کورد، لێنەدەن، چونکە گەلی مسوڵمانی کورد، ناتوانێ

---

ئاڕاستەی ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێن، وەك ئەوەی، کورد هیچ گیروگرفتی نەمابێ، بێجگە لە نەهێشتنی دین و ڕەوشتەکەی!!

www.alibapir.com



بڕوا بەخۆی بهێنێ و قەناعەت بەخۆی بکات، کە کەسانێك ڕێز و حورمەتی خوا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و قورئان و ئایینەکەی ناگرن، بە دڵسۆز و جێگای ئومێد و متمانەی خۆییان بزانێ، دیارە کۆمەڵگای کوردەوارییشمان - سوپاس بۆ خوا - هێندە هۆشیار و بێدار بۆتەوە، کە بەو جۆرە فێڵە سادە و سەرکێلانە، لەخشتە نەچێ و چاوبەستیی لێ نەکرێ!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٦- پەرچ و لەمپەر خستە رێی کاروانی بێداریی و هۆشیاریی ئیسلامیی، چی دەگەیەنێ؟!

شتێکی ڕوونە، کە خۆشەویست ترین و پیرۆزترین شتی هەر گەل و کۆمەڵێك، ئایین و بیروباوەڕەکەیەتی، کەواتە کەسێك بیەوێ بە دڵسۆز و مشوورخۆری گەل و کۆمەڵەکەی حیساب بکرێ، دەبێ ڕێز و تەقدیری تەواوی بۆ ئایین و بیروباوەڕی میللەتەکەی هەبێ و، نەك هەر دژایەتیی نەکات و، بەوەی کە گەنج و لاوی تازە پێگەیشتووی کۆمەڵگایەکەی، لەو ئایینە کۆدەبنەوە و، دەوری دەدەن و خزمەتی دەکەن، قەڵس و سەغڵەت نەبێ و پێی ناخۆش نەبێ! بەڵکو دەبێ هەوڵ و تەقەللای جیددییش بدات، بۆ زیاتر و چاکتر چەسپاندن و پەرەستاندن و گەشەکردنی، ئەو ئایین و بیروباوەڕە، لەنێو گەلەکەیدا، ئنجا بە تایبەتیش، ئەگەر ئەو ئایینە ئیسلام بێت، کە دوایین نوسخەی هیدایەتی شیفابەخشی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ يونس: ٥٧.

باشە گەل و میللەتی بێ دین و بێ عەقیدە، چ خێرێکی لێ چاوەڕوان دەکرێ و، کام سەنگەرەی خەبات و بەرەنگاریی پێدەگیرێ! ئایا هەموومان نەمان بینیوە چۆن ئینسانی بێعەقیدە و بێ بەها، خۆی و گەل و نیشتیمانیشی هەرزان فرۆش دەکات و، بە تۆزە ڕابواردنێکی خۆی و بەرژەوەندییەکی شەخسیی خۆییان دەدات!

www.alibapir.com



کەوابێ: ئایا ڕێگا تەنگ کردنەوە و گرتن، لە گەنج و لاوەکانی کورد، کە فێری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) و یاساکانی شەرع و ئەدەب و ڕەوشتی ئیسلامیی بن، لە ڕێگای مزگەوت داخستن و تۆمەت و قسەوقسەلۆك بەدواخستن و، فشار خستنە سەری جۆراوجۆرەوە، لەلایەن حیزبە لائیکە حوکمڕانەکانی کوردستانەوە، چی دەگەیەنێ؟!

پێم وایە: وەڵامی ئەم پرسیارە، هێندە ئاشکرایە، پێویست بە نووسین ناکات، بەڵام جێی خۆیەتی لێرەدا ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە، ئاڕاستەی ئەو جۆرە عەلمانییانە بکەین، کە بە قەڵەباڵغ بوونی مزگەوتەکان، بە کوڕ و کچی کورد و، دەرس خوێندن و شارەزابوون و پەروەردە بوونیان، لە قوتابخانەی قورئاندا قەڵس دەبن و، هاوسەنگیی (توازن)ی دەروونیی و عەقڵیی خۆیان، لەدەست دەدەن و، قسەوباس و پڕوپاگەندەی سەیر و سەمەرە دەکەن:

هۆ برادەرینە! هەمووتان دەزانن و ئاگادارن، کە ئێوەی سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیری کورد! بە پەنابردنتان بۆ ڕێچکە و بیردۆزەکان - کە عەلمانییەت هەموویان کۆ دەکاتەوە - و دەست بەرداربوونتان لە ئیسلام، وەك عەقیدە و بەرنامەی ژیان و گوزەران، بە پێلێنانی خۆتان، لەڕووی دینداریی و مسوڵمانەتییەوە - مەگەر لەلای خەڵکی سادە و بێئاگا، ئەگەر نا - (مصداقیة)ی خۆتان لەدەست داوە و بەشتان بەهیچەوە نەماوە،[١] چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾

آل عمران: ٨٥.

---

(١) دیارە ئەمە حوکمێکی گشتییە و بۆ چەسپاندنی لەسەر تاکەکان(أفراد) پێویستیی بە سەرنج دان و لێکۆڵینەوە دەکات، تاکو بزانرێ: ئایا وەك شارەزایانی شەرع (الفقهاء) دەڵێن: (ثبوت الشروط وانتفا و الموانع) بووە، واتە: (مەرجەکانی کافربوون هاتوونە دی و، بەربەستەکانی لاچوو ون) یان نا، ئنجا هەرکەسێك مەرجەکانی کافربوونی تێدا هاتبنە دی و، هیچ بەربەرچ (مانع)یش نەبن، وەك: تۆبزیی لێکردن (الإکراه) و، نەزانیی (الجهل)، ئەوە حوکمی کافر بوونی بەسەردا دەدرێ، ئەگەر نا. نا.

www.alibapir.com



واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێی قبووڵ ناکرێ و، ئەو کەسە لەدوارۆژیش دا لە زیانبارانە. دەجا ئێوەش بەئاشکرا و بێ پێچ و پەنا پڕ بەزارتان دەڵێن: (ئێمە عەلمانیین) و ئەسڵەن، ئەگەر یەکێك لێتان بپرسێ: کە ئایا ئێوە (ئیسلامی)ین و بڕواتان بە ئیسلام هەیە، کە بەرنامە و پەیڕەوی ژیان و گوزەرانتان بێت؟!

ئەوە بێگومان (ئیسلامیی بوون) بەتۆمەت و بوختانێك دەزانن، کە پێتان کراوە و هەر زوو وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن: نەخێر کاکە ئێمە ئیسلامیی نین!

ئنجا برادەرینە! ئامۆژگارییەکەم ئەوەیە: کە مادام بەهۆی ڕەفزکردنی ئیسلامەوە - کە خوا فەرموویەتی: بەرنامەیەکی تێر و تەواوەو پەڵەی تێدا نیە:

﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾

المائدة: ٣.

خۆتان لە بازنەی ئیسلامەتیی بردۆتە دەرێ، بۆ ئەوەی لە بازنەی کوردایەتیی و نیشتیمان دۆستیی و نەتەوەپەروەرییش نەچنە دەرێ و، لێتان بسەلمێنرێ و بڕواتان پێ بکرێ، کە دڵسۆز و خەمخۆری کورد و کوردستانن، لە بەرانبەر خۆشەویست ترین و پیرۆزترین و چاکترین و بەرزترین شتدا، کە گەلی کورد هەیەتی، کە ئایین و بیروباوەڕەکەیەتی، هەڵوێست و ڕەفتاری خۆتان بگۆڕن و چی دیکە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، تەقە لە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام مەکەن و، کۆسپ و پەرچ لەڕێی دینداریی و مسوڵمانەتییدا دروست مەکەن.

قەتیش خەیاڵ پڵاوی وا مەکەن، کە ئەو گەل و جەماوەرەی دژایەتیی ئایین و عەقیدەکەی دەکەن و، پەرچ و لەمپەر لەڕێی دینداریی و مسوڵمانەتییەکەیدا دروستدەکەن، هێندە سادە و ناحاڵیی بێت، هەر گوێ بۆ قسەو وتارتان بگرێ و، سەرنجی هەڵوێست و پەرێز و ڕەفتارتان نەدات!

www.alibapir.com



بەڵێ! خەڵكی مسوڵمانی كورد، بڕوای بە دڵسۆزیی و كوردایەتیی كەس و كۆمەڵێك نابێ، كە بە گەشەكردن و بەرەوپێش چوونی ئایینەكەی سەغڵەتە و، ڕێگای دینداریی كردنی پێنادات، مەگەر لەو سنوور و جوغزەدا، كە زیانی پەزەكانی نەبێ![1] چونكە دینی (ئیسلام) هاتوە (حاكم) بێت نەك (محكوم). وەك خوای باڵادەست فەرموویەتی:

﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّ ﴾

المائدة: ٤٨.

واتە: بەوەی خوا ناردوویەتە خوار حوكمیان لە بەیندا بكە و، مەكەوە شوێن ئارەزووەكانیان و، لەو هەقەی بۆت هاتوە لامەدە!

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) دەگێڕنەوە ساڵێكیان مەلایەك بۆ مەلایەتیی دەچێ بۆ ناوچەیەك، كە خەڵكێكی ڕەوەند و مەڕداری لێ دەبێ و، تا ئەوكاتەش مەلایان نەبووە، ئنجا لەكاتێكدا كە مەلا بانگ دەدات، یەكێكیان بانگی ئەوی دیكەیان دەكات، كە لەنزیك مەلایەكەوەیە و دەڵێ: ئەوە ئەو دەنگە دەنگە چییە لالۆ؟! ئەویش دەڵێ: ئەوە مەلایە بانگ دەدات، كابرا دەڵێ: ئنجا ئایا ئەو بانگە زەرەری بۆ پەزەكان(مەڕەكان) نیە؟! دەڵێ: نەخێر، دەڵێ: كەواتە لێی گەڕێ با بیڵێ.

www.alibapir.com



## ٧- بیانووگرتن بە گەنج و لاوە ئیسلامییەکان و دروست کردنی کێشە و مشت و مڕی لابەلا

زۆرجاران دەبینین و دەبیستین، کە لەسەر باسکردنی هەندێك مەسەلە و بابەتی عەقیدەیی و فیقهیی، لەلایەن گەنج و لاوەکانەوە، لەلایەن هەندێك مەلا و شێخی ناحاڵیی، یان دەست لەپشتێ دراو و هاندراوەوە، هەرا و کێشە و دەمەقاڵێ و مشت و مڕی زۆر بەرپا دەکرێ و، شین و واوەیلا بۆ ئیسلام ساز دەکرێ، وەك ئەوەی ئیسلامەتیی هیچ دەرد و کێشەیەکی نەبێ و، هیچ بەڵا و گرفتارییەکی بەسەر نەهاتبێ، جگە لە باسکردنی ئەو جۆرە مەسەلانە، لەلایەن وەچەی نوێ (الجیل الجدید)ی بێداریی ئیسلامییەوە!

ئنجا ئەگەر گریمان ئەو باس و بابەتانە، بە بۆچوونی هەندێك لە مەلا و شەرعزانەکان هەڵەش بن، یان لە ڕاستییدا شایانی باسیش نەبن، لەو کات و شوێن و حاڵەدا و، شتی لەوان پێویست تر هەبێ، یان بە ناشێی و بێ حیکمەتیی بخرێنە ڕوو، وەك بەندە، زۆر تێبینیی و ڕەخنەم لەو بوارەدا بە گوتن و نووسین، ئاڕاستەی ئەو جۆرە برایانە کردوە و ئامۆژگارییم کردوون،[1] بەڵام بە هەرحاڵ ئەو جۆرە مەسەلانە دروست نییە و ماقووڵ نییە، بکرێنە مایەی بیانوو گرتن بەو قوتابی و گەنج و لاوانە و، دەستەچیلەی هێرش بردنە سەریان و ناوزڕاندنیان و، پاشانیش بەرۆك پێگرتن و ڕێگا لێگرتنیان، کە هەر ئەمەی دواییش هاندەری

---

(١) بۆ وێنە سەرنجی کتێبی: (چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان) بدە، هەروەها نامیلکەی: (بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون).

www.alibapir.com



ئەسڵیی و (بيت القصيد)ی دروست کردنی ئەو قاڵ و باس و مشت و مڕ و هەرایە سەیر و ناماقووڵەیە!

بەڵێ! ئەو هەرا و هۆریا و قاڵ و باس دروستکردنە، لەلایەن عەلمانییەکان و دەست و پێوەندەکانیانەوە لەدژی وەچەی تازەی بێداریی ئیسلامیی کوردستان، دروست و ماقووڵ نییە، چونکە:

**یەکەم:** هەر کەسێك تەنانەت سەرەدەرێك لە قورئان و سوننەت و کەلەپووری هەمەلایەنە و دەوڵەمەندی ئیسلامیی بکات، تێدەگات و دڵنیا دەبێ، کە زانا و پێشەوایانمان، جیاوازیی (خلاف) و مشت ومڕی زۆریان لە بەین دا بووە، لەسەر وردە بابەتەکان، بەتایبەت لە بواری فیقهییدا و، هیچ کامیشیان بەهۆی جیاوازیی بیروبۆچوون (اختلاف الرأي)ەوە لەو بوار و بابەتانەدا، کە جیاوازیی تێیاندا سروشتیی و ئاساییە، یەکدیان تۆمەتبار نەکردوە و، (شافیعیی) ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتەنی: ((رأيي صواب يحتمل الخطأ، ورأي غيري خطأ يحتمل الصواب)).

**دووەم:** هیچ کەس ناتوانێ نکوولیی لەوە بکات، کە کۆمەڵگای کوردەواریی ئێمەش، وەك باقی کۆمەڵگایەکانی جیهانی ئیسلامیی، لەمێژە گیرۆدەی جۆرەها بیروبۆچوون و هەڵس و کەوت و ڕەفتاری هەڵە و ناشەرعیی بووە، لە هەموو بوارەکانی: (بیروباوەڕ و عیبادەت و کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیی و سیاسیی و... هتد)، کە بێگومان لەسەر هەموو لایەکمان پێویستە، کە کۆمەڵگایەکەی لێیان بژار بکات و پاکی بکاتەوە، ئنجا دیارە هەندێك کەسیش بەپێی دەستووری (خووی شیریی هەتا پیریی) و، بەپێی یاسای هەڵەی مەلای مەزبوورە: (پیاو ئەو پیاوەیە لە قسەی خۆی دانەبەزێ)، ڕەفتار دەکات و ئەو بیروبۆچوون و هەڵس و کەوتانەی، کە خووی پێوە گرتوون و، لە باب و باپیرانیەوە بۆی بەجێ ماون و، فرچکی پێوە گرتوون، هەرچەندە بە بەڵگەی بێپێچ و پەنای شەرعیش، بۆی بسەلمێنی، کە ئەو شتانە (شرك) و (بدعة) و (ئەفسانە)ن، یان خوو و خدە و داب و نەریتی کافر و دیانەکانن، دەست بەرداریان نابێ و،

www.alibapir.com



وەك عادەتی بت پەرست و سەرلێشێواوەكانی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بە زمانی حاڵ - ئەگەر بە گوتاریش نەبێ - دەڵێ:

﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الزخرف:٢٣.

ئاشكراشە، كە لە حاڵەتێكی ئاوادا، تێگ گیران و مشت و مڕ دروست دەبێ و، هیچ كەسیش بۆی نییە، تەفسیری هەڵە و تۆمەتدار لەسەر ئەم حاڵەتە بكات و، ئەگەر واش بكات، دیارە بێویژدانییە و مەبەستی خراپ و پیسی هەیە.

**سێیەم:** بۆ دادوەرییكردن و هەڵبڕینی كێشە و مشت و مڕی لەم بابەتەش، كە باسكرا، بێجگە لە زانا و شەرعزانان، هیچ كەسی دیكە مافی دەست تێوەردان و خۆ تێهەڵقورتاندنی نییە و، دەبێ زانایانی لێكۆڵەرەوە و ڕۆچوو و دڵسۆز، ئەو ئەركە وەئەستۆ بگرن و، بۆ دیاریی كردنی ڕاست و چەوت، یان بەهێز و بێهێز (الراجح والمرجوح) لەنێو بیروڕا و بۆچوونەكان دا، نوختە لەسەر پیت دابنێن، نەك بابایەكی سیاسیی كۆڵەوار و نەشارەزا بە ئایین، هەر لەبەر ئەوەی تەنها بەرپرسێكە، بێت خۆی بكاتە (مامۆتك) و لەدیزەی فتواداندا بە ناهەق خۆی بكاتە ئەسكوێ!

ئاخر ئێمە مادام لە هەموو بوارێكدا ڕێز و تەقدیرمان هەیە بۆ خەڵكی پسپۆڕ (أهل اختصاص)، بۆچی دەبێ لە مەسەلەی هەڵس و كەوت لەگەڵ بەرنامەی خوا و زانیارییە شەرعییەكان (العلوم الشرعیه)شدا، كە لە هەموو شتێكی دیكە، پتر پێویستییان بە شارەزایی و قووڵ بوونەوە و پسپۆڕیی هەیە، هەروا نەكەین!!

**چوارەم:** دیارە ئەوەی گوتراش، پاساو (مبرر) نییە بۆ گەلێك هەڵس و كەوت و، قسە و ڕەفتاری ناشێیانە و نەزانانەی، زۆر لە گەنج و لاوە دڵگەرم و بێئەزموون و كەم شارەزایەكان، كە هەر بە خوێندنەوەی نامیلكەیەك، یان لەبەركردنی چەند ئایەت و فەرموودەیەك، وادەزانن چوونەتە ڕیزی زانا و پێشەوایانی پایەبەرزەوە و، دەست دەكەن بە قسەی زل زل و، ڕەخنە لەم و لەو گرتن و، فتوادان و بێڕێزیی نواندن، سەبارەت بە زانا و پێشەوایانی ڕەسەنمان،

www.alibapir.com



کە ڕەنگە زۆر لەو گەنج و لاوانە جارێ هەر نەگەیشتبنە ئاستێك، بتوانن کتێب و بەرهەمەکانیشیان بخوێننەوە و تێیان بگەن.

بەڵام مەسەلەی بیانوو پێگرتن و تێهەڵپێچان شتێکی دیکەیەو، نابێ تێکەڵ بکرێن، چونکە تێکەڵ کردنی هەق و ناهەق، عادەتی جوولەکەکانە، کە بەمەبەستی شێواندنی هەق، یان ڕەواج پێدانی ناهەق (باطل) و ساغکردنەوەی بەناوی هەقەوە، تێکەڵیان دەکردن، وەك خوای زانا و پەنهان بین فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١﴾

آل عمران: ٧١.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٨- ئیسلامییەکان و تۆمەتی کوشتن و خوێن ڕشتن

ماوەیەکە هەندێك لە عەلمانییەکانی کوردستان، بەلاسایی کردنەوەی دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا و، ڕژێمە داپڵۆسێنەرەکانی جیهانی ئیسلامیی، لە عارەب و تورك و غەیری ئەوانیش، هەر لەخۆوە دەستیان کردوە بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و، قسەوقسەلۆکی بێجێ و بێ بنچینە، لەدژی ئیسلامییەکان و تۆمەتبارکردنیان بە ڕەشەکوژیی و تیرۆر و، لە هەمووشی سەیرو سەمەرەتر (دژی ئافرەت بوون)!!

لە حاڵێکدا، کە ئیسلامییەکان حوکمڕان و دەسەڵاتدار نین، هەتا بتوانن و بەئەرکی سەرشانی خۆشیانی بزانن، کە یاسا شەرعییەکان (الأحکام الشرعیة) لە وڵاتدا بچەسپێنن، کە بەشێك لەو یاسا شەرعییانە، ئەو (حدود) و سزایانەن کە ئیسلام بە مەبەستی پارێزگاریی لە عەقیدە و ژیان و عەقڵ و وەچە و ئابڕوو و سامان (الدین والحیاة والعقل والنسل والعرض والمال)ی کۆمەڵگا دایناون و، جێبەجێکردنیشیانی هەر حەواڵەی کۆمەڵگای مسوڵمان و، دەسەڵاتە شەرعیی (السلطة الشرعیة)یەکەی کردوە، کە ئەمانەن:

١- سزای پاشگەزبوونەوە لە ئایین (عقوبة الردّة)[1].

---

(١) ئەمە لە چاپەکانی پێشوودا: چاپی ١٩٩٠/١ و چاپی ١٩٩٨/٢ و چاپی ٢٠٠٥/٣، ئەوە بیروڕام بووە، بەڵام ئێستا: ٢٠١٨/٤/٢٨ ز، ١٢/ شعبان/ ١٤٣٩ك ڕام وایە، کە هیچ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر نیە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام (الإرتداد عن الإسلام) سزایەکەی کوشتنە، وەك لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا بەدرێژیی باسمان کردوەو دواییش لە شێوەی نامیلکەیەکیشدا چاپ کراوە، هەروەها لە کتێبی دوازدەیەمی (موسوعة: الإسلام کما یتجلی في کتاب الله)ش قسەمان لەبارەوە کردوە.

www.alibapir.com


٢- سزای كوشتنی بە ناهەق (كە چەند جۆرێكە و سزایەكەشیان جۆراوجۆرە).

٣- سزای مەیخۆریی و خواردن و خواردنەوەی هەرشتێكی عەقڵ لابەر.

٤- سزای داوێن پیسیی (زینا و نێربازیی).

٥- سزای بوختان پێكردن (القذف) ((واتە: تۆمەتباركردنی یەكێك بە داوێن پیسیی، بەبێ بەڵگە و ئیسپاتی شەرعیی تەواو)).

٦- سزای دزیی و جەردەیی و ڕێگریی.

جا لێرەدا بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژی ئەو تۆمەت و گومانانە، خستنەڕووی چەند ڕاستییەك بەپێویست دەزانم:

**یەك:** شتێكی ئاشكرا و ڕوونە، كە جێبەجێكردن (تنفیذ)ی سزا شەرعییەكان، لە ئەستۆی دەسەڵاتی شەرعیی (السلطة الشرعیة)دایە و هەر كەسە لەخۆیەوە بۆی نییە بەو كارە هەڵسێ، چونكە لە ئاكامی ئەمەدا، ئاژاوە و پەشێویی و ئاڵۆزیی پەیدا دەبێت و، هەق و ناهەقیش تێكەڵ دەبن.

دیارە شەرعیش ڕێگا بەشتی وا نادات، ئەمە لەلایەكەوە لەلایەكی دیكەشەوە كۆمەڵگا و كیانی سیاسیی ئیسلامییش، كە ویلایەت و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر تاكەكانی خۆیدا هەیە، یەكسەر لە جێبەجێكردنی (حدود) و سزا شەرعییەكانەوە دەست پێناكات، بەڵكو لە تێگەیاندن و پەروەردەكردنی تاكەكانی كۆمەڵگا و، چارەسەركردنی كێشە و گرفتەكانیان و دابینكردنی مافەكانیانەوە، دەست بەكار دەبێت.

ئنجا پاشان هەر كەسێك لایداو بەبێ عوزر و بیانوو خەتی خوار كرد، ڕاست دەكرێتەوە و سزای پڕ بە پێست و دادگەرانە دەدرێ، كە بێگومان ئەو ڕاستكردنەوە و سزادانەش، هەر لەپێناوی بەختەوەریی و سەلامەتیی كۆمەڵگا و پاراستنی دایە.

سیرە و ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم) و، جێبەجێ نەكردنی زۆر لە سزایەكانیش، لەنێوان حاڵەتە نائاساییەكانی وەك: (نەزانیی

www.alibapir.com


(الجهل)، تۆبزیی لێکران (اكراه)، ناچاریی و تێگیران (اضطرار)، بالغ نەبوون، شێتی..)، کە بەدرێژیی لە کتێبە شەرعییەکاندا، قسەیان لەسەر کراوە و توێژراونەوە، باشترین بەڵگەی ئیسپاتی ڕاستیی ئەو قسەیەمانە.

**دوو:** فەرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)یش، کە بە ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانان دانراوە، بەنێر و مێ و ورد و درشتەوە، هەر کەسە بەپێی توانا و بۆلوانی، زۆر جیایە لە جێبەجێکردنی (حدود) و سزا شەرعییەکان، هەرچەندە زۆر لە نەشارەزایان بە ئیسلام - بەتایبەت عەلمانییەکان - لێیان تێکەڵ دەبن و، هەر لە ئەنجامی ئەمەشدا، دووچاری حوکم و بۆچوونی هەڵە و سەیر دەبن.

بۆ وێنە: کە دەبیستن مەلایەك، یان هەر مسوڵمانێکی دیکە لەسەر مینبەر، یان لەکاتی دەرسدا، ئامۆژگاریی مسوڵمانان دەکات و هانیان دەدات، کە لە بەرانبەر کوفر و زوڵم و فەساددا ڕابوەستن و قبووڵ نەکەن و...هتد.

ئەوەی زانا و شارەزابێ دەزانێ، کە ئەوە بانگەوازە و فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپەیە، بەڵام ئەوەی نەزان و بێئاگا یان زۆرزان و لە بەهانە بێت پێی وایە و دەڵێ: ئەوە فتوادانە و فەرمان کردنە بە گرتن و کوشتن و بڕین!!

**سێ:** دیارە ئیسلامییەکان و هەمو ئینسانێکی دیکەش، لەکاتی زوڵم و دەستدرێژیی کرانە سەردا، جا بەئاشکرا و سەنگەر لێگرتن بێت، یان بە پەنهانیی و ڕەشەکوژیی و پیلان، دەست کردنەوە و بەرپەرچدانەوە بەرگریی لەخۆکردن بەمافێکی سروشتیی و هەقێکی شەرعیی خۆیان دەزانن، بە هەر شێوازێك بۆیان بلوێ، جا ئایا بۆیان دەکرێ و دەتوانن، ئەو بەرگرییە لەخۆیان بکەن، یان نا؟ ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، خوای پەروەردگارمان لەو بارەیەوە فەرموویەتی و فەرمانیشی پێکردووین:

﴿ ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤ ﴾ البقرة: ١٩٤.

www.alibapir.com



بەڵێ، ئەوەی ڕەشەکوژمان بکات، هەقی خۆمانە تۆڵەی لێ بستێنین و، ئەوەی سەنگەرمان لێبگرێ، مەگەر هەر توانامان نەبێ، ئەگەر نا دروست نییە، ملی بۆ کەچ بکەین و، دەبێ لە سنووری خۆیدا ڕای بگرین و، بەڵکو پێویستە ئەوسەریشی لێ بگرین و وای لێبکەین، توانای ستەم و دەستدرێژیی و چەوساندنەوەی بڕوادارانی نەمێنێ و، یان مسوڵمان بێ، یان دان بە سەروەریێتی ئیسلامدا بهێنێ، وەك خوای دادگەر و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣ ﴾ البقرة: ١٩٣.

واتە: لەدژیان بجەنگن، هەتا (کافرەکان توانای) ئەشکەنجە و ئازار (دانی مسوڵمانانیان) نامێنێ و، گەردن کەچیی بەس بۆ خوا دەبێ، ئنجا ئەگەر دەستیان هەڵگرت (لەدژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان)، ئەوە دەستدرێژیی، بەس دەکرێتە سەر ستەمکاران.

**بەکورتیی:** مسوڵمانان دەبێ هەوڵ بدەن دوژمنەکانیان وا لێبکەن، یان بەویستی ئازاد و قەناعەتی خۆیان بڕوا بێنن و مسوڵمان ببن، یان ئەگەر مسوڵمانیش نەبن و لەسەر بیروباوەڕی خۆیان بمێننەوە، توانای دژایەتیی ئیسلام و ئازاردانی مسوڵمانانیان نەمێنێ و، مەبەستیش لە: ﴿ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾ هەر ئەمەیە، نەك وەك هەندێك کەس بە هەڵە حاڵی بوون و پێیان وایە: مەبەست لەم ئایەتە بەتۆبزیی مسوڵمان کردن و باوەڕهێنانی کافرانە، کە بێگومان ئەمە شەرعیی و واقیعیی نییە، چونکە بڕوا و قەناعەت بەزۆرەملیی و ناچاریی دروست نابێ و، پێچەوانەی ئایەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ البقرة: ٢٥٦. و ئایەتی: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ الکهف: ٢٩. یش و، چەندان ئایەتی دیکەی قورئان و، فەرموودەی پێغەمبەریشە (صلی الله علیه وسلم).

www.alibapir.com



**چوار:** دیارە لایەنە ئیسلامییەکان، بەرپرسیار نین لە هەڵسوکەوت (تصرُّف)ی عاتیفیی و تاکڕەوانەی مسوڵمانێك، کە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی کارێکی وەك هەڕەشە و کوشتن، یان تەقاندنەوەی شوێنێك، بەڵام هەڵبەتە دواییش نابێ لەسەری هەڵبدەنێ و بەرگریی لێبکەن.

**پێنج:** جنێودان و قسەی سووك و ناشیرین گوتن بە خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و، قورئان و شەرع و مەلا و مزگەوت و مسوڵمانان و، ئیهانە پێکردنیان، وەك هەندێك بێدین و زەندیق و ڕەوشت نزمی ترسنۆك دەیکەن، شتێکە بەهیچ کەس کە هەر تۆزێك مسوڵمان بێت، قبووڵ ناکرێ و، هەقی بەرپەرچ دانەوەی ئەو قسە و ڕەفتارانە، هی هەموو مسوڵمانێکە و، هەر کەسە لە ڕاست خۆیەوە بەهەر شێوەیەکی شەرعیی، کە بۆی دەڕەخسێ، بۆی هەیە و بگرە لەسەری پێویستە، ئەو جنێوفرۆشە دەم شڕانە دەمکوت و بێدەنگ بکات، دیارە هەر کەسێکیش لەسەر ئەو جنێوفرۆشە دەم شڕ و بێباوەڕ و چەقاوەسوانە، وەجواب بێت و بەرگرییان لێبکات، تاوانبارە و خۆی تۆمەتبار و عەیبدار کردوە!

بەڵێ! مسوڵمانان بە دەقی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەتا خوا و پێغەمبەرەکەیان لە خۆیان و باب و دایك و ڕۆڵەیان خۆشتر نەوێ، بە بڕوادار حیساب ناکرێن، خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ١٦٥.

واتە: خەڵکی وا هەیە، کە لەجیاتی خوا چەند هاوبەشێك پەیدا دەکەن و، وەك خۆشەویستنی خوا، خۆشیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە، خۆشەویستییان بۆ خوا زیاترە - لە خۆشەویستیی ئەوان بۆ پەرستراوەکانیان -.

پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يكون اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا))متفق علیه. واتە: هیچ یەکێك لەئێوە بڕوا ناهێنێ، هەتا خوا و پێغەمبەرەکەی لە غەیری ئەوان، لەلای خۆشەویستتر نەبن.

www.alibapir.com



دیسان فەرموویەتی: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)) رواه البخاري.

ئنجا مادام خوا و پێغەمبەریشمان، لەخۆمان و باب و دایك و سەرجەم كەس و كارمان، لەلای بەڕێزتر و خۆشەویست تر بن، دیارە نابێ بەهیچ ڕەنگێك، لەهیچ كەسێك قبووڵ بكەین جنێویان پێ بڵێ و سووكایەتییان پێبكات! لە هەر كات و شوێنە، بەشێوەی شەرعیی خۆی.

هەڵبەتە ڕەخنەلێگرتنی ئیسلام و مسوڵمانانیش، زۆر جیاوازە لە جنێودان و قسەی سووك، بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیی زانایانی ئیسلام باخەڵ فەراخانەو لێبوردانە لەگەڵ بابەتی ڕەخنەگرتن و وتووێژیی بابەتیانەی نەیار و ناحەزانی ئیسلام دا، مامەڵەیان كردوە.

**شەش:** لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، كە ئەو جنێوفرۆش و دەم شڕانە، ئەهلی ئیسلام بەگشتی بەوە تاوانبار دەكەن، كە ئافرەتیان خۆش ناوێ و ڕێزی لێ ناگرن و دەیچەوسێننەوە و، زۆری دیكە لەم قسە بێ سەر وپێ و بێ بنچینانە.

ئنجا بەڕاستیی من، كە ئەو قسە و قسەلۆكانەی ئەو دەستە و تاقمانە دەبیستم، یەكسەر ئەو پەندە كوردییەم دێتەوە یاد كە دەڵێ: ((هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت!)).

ئاخر بەڕاستی سەیرە! دەستەیەكی زەندیق و بێڕەوشت، كە داوای بەرهەڵدایی جینسیی (الإباحة الجنسية) و تێكەڵاویی جینسیی (الشيوعية الجنسية) دەكەن و، پڕ بە زاریان دەڵێن و دەیڵێنەوە، كە نابێ خێزان و ژن و مێردایەتیی هەبێ و، دەبێ ئافرەت ئازاد بێ - هەروەها پیاویش - كە كەی و چۆن و لەكوێ و لەگەڵ كێ، غەریزەی جینسیی خۆی تێر دەكات، یان بە زاراوەی ئەوان (مومارەسەی جینس دەكات)!!

بەڵێ، بەڕاستیی سەیرە! دەستە و بەستەیەكی ئاوا خۆیان بەپارێزەری مافی ئافرەت و بەرگریی لێكەری بزانن و، ئەهلی ئیسلامیش هەر لەبەر ئەوەی بەپێی

www.alibapir.com



فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵس و کەوت دەکەن و، دەڵێن: دەبێ ئافرەت بە حەیا و حەشمەت و پۆشتە و پەرداخ بێت و، وەك باخی پەرژین کراو، جگە لە خاوەنی حەلاڵی خۆی، کە مێردیەتی، کەسی دیکە دەستی نەگەیەنێتێ و، نەبێتە پەشتەماڵ و، هەرجارەی بەدەست داوێن پیسێکی ڕەوشت نزمەوە بێ!!

هەر لەبەر ئەوەی دەڵێن: ئافرەت دەبێ بەشێوەیەك هەڵس و کەوت بکات لە کۆمەڵگادا، کە وەك (ئینسان)ێکی بەرپرس و خاوەن ئەرك و کار بێتە بەرچاو، نەك وەك (مێیینە)یەکی سەرنج ڕاکێشەر و داماو و فەوتاو و بێبەندوبار!

هەروەها لەبەر ئەوەی دەڵێن: هەرکام لە پیاو و ئافرەت، چ لە ڕووی جەستەیی و چ دەروونییەوە، لە یەك جیان و هەرکامێکیان بەشێوەیەك دروست کراوە و هەڵخراوە، کە بشێ بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرك و کارەی، کە سروشتی خۆی داخوازیی دەکات و کۆمەڵگاش پێویستییەتی و، هەرچەندە لە ئیمان و تاعەت و ئینسانەتیی و زۆربەی ماف و ئەرکەکانیاندا، وەك یەك و یەکسانن، بەڵام هەرکامێکیشیان هەندێك ئەرك و کار و مافی تایبەت بەخۆیشی هەیە!

بەڵێ! ئەو دەستەو تاقمە، هەر لەبەر ئەمانە، کە فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێداویستیی ژیان و هەڵقوڵاوی سروشتی ئینسانن، ئەهلی ئیسلام بەگشتی و ئیسلامییەکان بە تایبەت، بە داپڵۆسێنەر و زەوتکەری ئافرەت و ڕەجعیی و نامووس پەرست و چی و چی دەزانن!

ئایا ئەو سەرگەردان و ڕەوشت نزمانە، هیوای ئەوەیان هەیە بەم جۆرە بیرکردنەوە و، ڕەفتار و هەڵوێستەیانەوە، لە کۆمەڵگای کوردەوارییدا، هەر جێگاشیان بێتەوە چ جای کۆمەڵگای کوردەواریی بە بیری ڕزیو و ڕەوشتی گەنیویان، پیس و پۆخەڵ بکەن!

ئەگەر خولیا و ئاواتی ئاوایان لە دڵ و مێشك دایە، ئەوە من دڵنیایان دەکەم، کە ئەو خولیا و ئاواتانەیان لە کوردستان و غەیری کوردستانیش، بۆ تەحقیق

www.alibapir.com



نابێ و، هەتا زووە، با بارگە و بنەیان بەرەو هەواری سروشتیی خۆیان، کە ڕۆژئاوای بێبڕوا و ڕەوشت داڕووخاوە بپێچنەوە و، چی دیکەش مسوڵمانانی ڕەوشت چاك و سروشت پاك، بە بۆگەنیی بیردۆزە ژەنگاوییی و خوو و خدە گەندەڵەکانیان ناڕەحەت نەکەن![١]

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) ئەم قسانەم توندیی و تووڕەییەکی بەرچاویان پێوە دیارە، بەڵام وەك خۆیان هێشتمنەوە، چونکە تەعبیر لە قۆناغ و هەڵ و مەرجێکی دیارییکراو دەکەن، ساڵەکانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوویە، بەتایبەت ساڵانی : ١٩٩٥ - ١٩٩٩ز.

www.alibapir.com



## ٩- ئیسلامەتیی ڕاستەقینە بەبێ خەڵکێکی ڕزگار و خاکێکی ئازاد بەڕێوە نابرێ

**خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم!**

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا وتووێژێکی واقیعییە، کە لە ساڵی (١٩٨١)ی زایینیدا ڕوویداوە، دیارە ئەوکاتیش بزووتنەوەی ئیسلامیی ئاوا سەری هەڵنەدابوو و دەرنەکەوتبوو، کەواتە ئەوەی لە دەقی وتووێژەکەدا هاتوە - کە لەم چاپی دووەمەشدا وەك خۆی بێ دەستکاریی هێشتوومەتەوە - بیروبۆچوون و قەناعەتی بابایەکی کوردی مسوڵمان و ئیسلامییە، لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتیی و، هیچ پەیوەندیی بە مەسەلەی سیاسەت و حیزبایەتییەوە نییە.

ئەم ڕاستییەشم بۆیە خستە ڕوو، چونکە زۆر کەس لە خەڵکی عەلمانیی، بەچاوی گوماناویی و، لەپشت پەردەی ڕەشەوە، سەرنجی ئیسلامییەکانی کوردستان دەدەن و، گومان و دوودڵییان هەیە سەبارەت بە نیشتیمان پەروەری و گەل دۆستییان! تەنانەت هی وایان هەیە، پێی وایە: دینداریی و نیشتیمان پەروەریی، یان مسوڵمانەتیی و کوردایەتیی، پێکەوە دژ و ناکۆکن و، ناکرێ ئینسان لە یەك کاتدا: هەم مسوڵمانەتیش بکات و، هەم کوردایەتیش و، حەتمەن دەبێ یەکیان بەقوربانی ئەوی دیکەیان بکات و دەست بەرداری بێت!

ئنجا بۆیە بۆ تەئکید کردنەوەی ئەو ڕاستییە، کە ئێمەی ئیسلامیی، هیچ دژایەتی و پێکەوە نەگونجانێك، لەنێوان مسوڵمانەتیی و کوردایەتیی - ئەگەر

www.alibapir.com


بریتی بێ لە خزمەت بە گەل و بەرگریی لە وڵاتمان، لەژێر ئاڵای ئیسلام دا- نابینین، بەڵکو بە دوو شتی پێکەوە پەیوەست و پێکەوە گرێدراویان دەزانین.

بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژی هەر گومان و تۆمەتێك و، بەرچاو ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەو جۆرە کەسانەش لەوبارەوە، ئەم چەند خاڵە زۆر بە گوشراویی دەنووسین:

**یەکەم:** جگە لەم چەند ساڵەی دوایی، خەباتی ڕزگاریخوازیی گەلی کورد، لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا، بەدرێژایی ئەو خەباتە درێژخایەنە نەپساوە، ئاڵاهەڵگر و سەرقافڵەی ئەو کاروانە بەبێ هەڵاوێردن (استثناء)، تێکڕا کەڵەپیاوانی دیندار و خواپەرستیی وەك: (شێخ عبیداللە و شێخ عبدالقادری شەمزینان و شێخ مەحمودی حەفید و شێخ سەعید و قازی موحەممەد) بوون و، تەنانەت ئەوانەی دیکەش، کە وەك پیاوی زانا و دیندار ناوبانگیان نەبووە، وەك: (یەزدان شێر و سمایل خانی شکاك و مەلا مستەفا).. هەر خۆیان بە مسوڵمان زانیوە و خەڵکیش وەك سەرکردەیەکی دیندار و مسوڵمان تەماشای کردوون و، هەر ئەمەش گەورەترین هۆکار و نهێنیی (سرّ)ی باوەڕ و متمانە و گوێڕایەڵیی و، ڕێزی خەڵك و جەماوەری کورد بووە بۆیان.

ئنجا ئەم واقیعە مێژووییە، ئەوەی لێدەفامرێتەوە، کە ئەو زانا و گەورە پیاو و سەرکردانە، نەك هەر هەستیان بە ناکۆکیی نێوان مسوڵمانەتیی و، خەبات لەپێناوی لابردنی نیری چەوساندنەوە و زۆرداریی، لەسەر شانی گەلەکەیان نەکردوە، بەڵکو وەك ئەرك و پێویستییەکی شەرعییانەی سەرشانیان، چاکی مەردایەتییان لێ هەڵماڵیوە و، چەکی خەبات و فیداکارییان هەڵگرتوە، خوا لێیان خۆش بێ و پاداشتیان بداتەوە.

**دووەم:** وادیارە ئەو جۆرە کەسانەی ئاوا بیر دەکەنەوە، لەپشت پەردەی ڕەش و لە دەلاقەی ئایینی گۆڕراو (محرَّف)ی مەسیحییەتەوە، سەیری ئیسلام دەکەن، وادەزانن، کە دەگونجێ ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان، بەبێ خەڵك و خاك، دینداریی بکات و ئیسلام لەژیانیدا پیادە بکات! بێخەبەر لەوەی، کە ئەگەر بگونجێ ئایینی شێوێنراوی فەلەیی، بئاخنرێتە کونجی کڵێسایەکەوە و، خەڵکی

www.alibapir.com



بەس بە بۆنە و موناسەبات و وەك تەقالیدێكی كۆمەڵگا و داب و نەریتێكی كۆنی باب و باپیران و، پێشینانیان جاروبار (فەلەبوونی) خۆیان وەبیر بێتەوە وەدەری بخەن، وەك ئێستا مەسیحییەكانی دنیا دەیكەن، ئیسلام، كە عەقیدە و سیاسەت و عیبادەت و حوكم و حیكمەت و ڕووح و جەستە و بازاڕ و مزگەوت و دنیا و قیامەتە، مەحاڵە بەبێ تێگەیشتن و پێگەیشتن و خەملاندنی گەل و كۆمەڵگایەك و، دابینكردن و ئازادكردنی نیشتمان و جێگایەك، بلوێ پیادەبكرێ و ئەرك و فەرمانە تاكیی و كۆمەڵیی و ڕووحیی و سیاسیی و دینیی و مەدەنییەكانی جێبەجێ بكرێن.

بەڵێ! ئیسلام ئایین و بەرنامەی خوایە، بۆ هیدایەت دان و ڕێكخستنی ژیان و گوزەرانی تاك و كۆمەڵ و، دەبێ بە ویست و دەستی خەڵكێكی سەربەخۆ و لەخاكێكی ئازاددا پیادە بكرێ و، بەهیچ جۆرێك خوا ڕازی نابێ، بەرنامەكەی لە سووچی مزگەوت بئاخنرێ و، بوار و مەیدانەكانی دیكەی ژیانی وەك: (پەروەردە و ڕۆشنبیریی و سیاسەت و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی) لێبگیرێ، چونكە خوای زانا و دادگەر فەرموویەتی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح: ٢٨.

واتە - خوا - ئەو زاتەیە، كە پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بەهیدایەت و بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە، بۆ ئەوەی بەسەر هەموو بەرنامەیەكدا سەری بخات و، خواش بەسە بۆ شایەتیی - ڕاستیی و تەواویی بەرنامەكەی -.

**سێیەم:** كەواتە: ئەگەر خەڵكی دیكە، بەس وەك هەست و نەستێكی نەتەوەیی و بەرژەوەندییەكی سیاسیی و دنیایی، بڕوای وایە، كە دەبێ كوردیش وەك گەلانی دنیا كیان و قەوارەی سیاسی خۆی هەبێ و، بەویستی خۆی لەسەر خاك و ئاوی خۆی بژی و، هیچ كەس ستەمی لێ نەكات و نەیچەوسێنێتەوە و، مافە خواپێداوەكانی لێ زەوت نەكات، ئێمەی ئیسلامیی، بەر لە هەست و نەستی نیشتیمان پەروەرییمان، كە بە غەریزەیەكی سروشتیی و خەسڵەتێكی

www.alibapir.com



مسوڵمانەتییمانی دەزانین، وەك دینداریی و عیبادەت و جێبەجێکردنی ئەرکێکی پیرۆزی خوایی سەرشانمان، بەپێویستی دەزانین خەبات بکەین بۆ ڕزگارکردنی خەڵکمان و ئازادکردنی خاکمان، چونکە بەبێ خاکێکی ئازاد و گەلێکی ڕزگار و سەربەخۆ، دینداریی و مسوڵمانەتیی ڕاستەقینە و بەمەعنای فراوانی وشە، ناکرێ و دەستوور و یاساکانی بەرنامەی خوامان بۆ جێبەجێ ناکرێن، ئنجا بەپێی یاسای شەرعیی: (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)، دیارە هەرچی دینداریی کردنمان و مسوڵمانەتیی کردنمان، پەکی لەسەری بکەوێ، ئەویش پێویست دەبێ!

دیارە ئەگەر وەك خەڵکی لائیك گومان دەبەن، ئیسلامیش وەك ئایینی گۆڕاوی مەسیحی، بەس هەندێك دروشم و هەڵس و کەوت و مەڕاسیمی شەخصیی بوایە، بێگومان دەگونجا کە بەس لە ماڵێ و مزگەوتێ و، بگرە لە چوارچێوەی حەپسخانەیەکیش دا، پیادە بکرێ، بەڵام ئیسلامێك، کە ڕازی نەبووە و نابێ نە لە بواری عیبادەت و، نە لە بواری حوکم و سیاسەتدا، هاوبەش بۆ خوا دابنرێ، وەك فەرموویەتی:

﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾

الكهف: ١١٠.

هەروەها فەرموویەتی ﴿ ... وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الكهف: ٢٦.

واتە: - خوا - هیچ کەس لە فەرمانڕەوایەتی و حوکمڕانیی خۆیدا ناکاتە هاوبەش. ئیسلامێك سەجدە بۆ صەنەم بردن و، یاسا و حوکم لە تاغووت وەرگرتن، بە یەك چاو سەیر بکات، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ يوسف: ٤٠.

www.alibapir.com



واتە: حوكمڕانیی بەس هی خوایە، فەرمانی كردوە، كە جگە لەوی - هیچ - مەپەرستن، ئا ئەوەیە دینداریی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

بەڵێ، ئیسلامێكی وا، چۆن دەگونجێ بەبێ هەبوونی كیان و قەوارەیەكی سیاسیی سەربەخۆ و ئازاد، بەڕێوە ببرێ!!

**چوارەم:** ئەوەی گوتمان دەربارەی هەڵوێستمان، لەمەڕمافی چارەنووس و كیان و قەوارەی سیاسیی، شتێكی مەبدەئیی بوو، بەڵام ئایا ئێمەی ئیسلامیی، لەگەڵ دەوڵەتی كوردی سەربەخۆ، یان كۆنفیدراڵیی، یان فیدراڵیی داین؟!

هەر بەكورتیی دەڵێین: لە ڕۆژگاری ئێستاماندا، هیچ كام لەمانە لەگەڵ پرەنسیپە گشتییەكان (المبادي و العامة)ی ئیسلامدا، دژ ناوەستن و، ئەزموونی سیاسیی دەوڵەتی ئیسلامییش پشتگیرییان دەكات و نموونەش زۆرن.

بەڵام گرنگ ئەوەیە هەر كام لەمانە، هەر ناو نەبن و نێوەڕۆكیشیان هەبێ، بەڵێ ئیسلام كە چەوساندنەوەی تاكە ئینسانێك حەڕام دەكات و، هەموو جۆرە ستەمێكی شەخسیی لە هەر ڕوویێكەوە بێ، بە بێشەرعیی و ناڕەوا دەزانێ، دیارە چەوساندنەوە و پلێشاندنەوەی گەل و میللەتێكی سی چل (٣٠-٤٠) ملیۆنیی وەك كورد - هەروەها هەر گەل و مسللەتێكی دیكەش، چ كەم بێ چ زۆر - بە (الطريق الأولى) ڕەد دەكاتەوە و دژیشی دەوەستێ.

كەواتە: هەر چۆنێكی چەوساندنەوە (إضطهاد)ی ئینسانەكان و میللەتان چاكتر بنبڕ بكرێ و ڕێی لێبگیرێ، ئیسلام پشتیوانیی لێدەكات و ئامانجی كۆتایی (جیهاد)یش لە ئیسلامدا، هەر نەهێشتنی چەوساندنەوە و جەور و ستەمی تاغووت[1] و ملهوڕانە، وەك خوا فەرموویەتی:

---

(١) (طاغوت) وەك توێژەرەوانی قورئان و زانایانی فەرهەنگەكانی زمان گوتویانە: (كل معبود سوى الله) هەر پەرستراوێكە، جگە لە خوا، بۆ وێنە پێشەوای توێژەرەوان (امام المفسرين) (ابن جرير الطبري) لەو بارەوە دەڵێ: ((والصواب من القول عندي في (الطاغوت) انه كل ذي طغيان على الله، فعبد من دونه إما بقهر منه لمن عنده، وإما بطاعة ممن عبده له، انساناً كان ذلك المعبود أو شيطاناً أو وثناً أو صنماً أو كائناً من كان، وأرى أصل الطاغوت من (الطغووت) من قول القائل: طغا فلان يطغو.

www.alibapir.com



﴿ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ الانفال:٣٩

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ ﴾ النساء:٧٥.

واتە: ئەوە چیتانە! بۆچی لەپێناوی (ڕەزامەندیی) خوا و (ڕزگاریی) چەوساواندا ناجەنگن؟!

بەڵێ، خوای پەروەردگار ئینسانەکانی بۆ بەندایەتی خۆی خوڵقاندوون، نەك بۆ کۆیلایەتی یەکدی و، مرۆڤایەتییشی بۆ چەندان تیرە و گەلی جیاجیا دابەش کردو، تاکو یەکتر بناسن و هاوکاری یەکدی بکەن و دەستباری ژیان و گوزەرانێکی ڕاست و دروست بۆ یەکدی بگرن، نەك هەندێکیان هەندێکی دیکەیان، بکەنە دیل و ژێردەستەی خۆیان و، بیان چەوسێننەوە و زەلیل و زەبوونیان بکەن، ئەوەتا خوای دادگەر و تۆڵەستێن دەربارەی فیرعەونی خۆ بەپەروەردگارزان و زۆردار و ملهوڕ، فەرموویەتی:

---

إذا عدا قدره فتجاوز حده)). بڕوانە: تەفسیری (الطبري) ب٣، ل٢١. واتە: قسەی ڕاست و تەواو لەلای من لەبارەی تاغووتەوە ئەوەیە، کە تاغووت هەموو یاخی بووێکە لەخوا و، لەجیاتی خوا دەپەرسترێ، جا بەهۆی تۆبزییکردنی بێ لەو کەسەی، کە دەپەرسترێ، یان بەهۆی فەرمانبەریی بۆکردنی بابای پەرستارەوە بێ، جا ئەو پەرستراوە، ئینسان بێ، یان شەیتان بێ، یان دار و بەرد بێ، یان بت و صەنەم، یان هەر شتێکی دیکە، پێم وایە ڕیشەی تاغووت - لەڕووی زمانەوە - لە (الطغووت)ە، کە یەکێك دەڵێ: (طغا فلان یطغو) هەر کاتێك لە ڕاددەی خۆی چۆدەرێ و لە سنووری خۆی دەرچوو.

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز! تاغووت هەر شتێکە، کە بپەرسترێ و ڕازیش بێ بەو پەرستنە، با ئەو پەرستنە لە بەشێك، یان لە بوارێك لە بوارەکانی پەرستنیش دابێ، بۆ وێنە: هەرکەسێك لەڕووی خۆشویستن و دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (الموالاة والمعاداة)یەوە بپەرسترێ، ئەوە تاغووتە، ئەوەی لە بواری فەرمانبەریی و شوێن کەوتن و بەحاکم دانرانەوە بپەرسترێ، ئەوە (تاغووت)ە، ئەوەی لەڕووی دووعا و لێ ترسان و پشت پێبەستن و نەزر و قوربانیی سەربڕینەوە، بپەرسترێ، بە هەمان شێوە و بەکورتی هەر کەسێك لەو ڕووەوە بپەرسترێ، کە تایبەتمەندییەکانی پەرستراوێتیی (خصائص الألوهیة) هەموویان، یان هەندێکیانی بۆ بڕیار بدرێت، ئەوە (تاغووت)ە. بڕوانە (الطاغوت)ی (أبو بەصیر)، ل٧٠.

www.alibapir.com



﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ ﴾

القصص:٤-٥.

واتە: بەڕاستیی فیرعەون لەزەوی (میصر)دا خۆی بەرز و فەرز کردبوو، خەڵکی ئەوێی بەش بەش کردبوو، هەندێکیانی دەچەوساندنەوە؛ کوڕەکانیانی سەردەبڕی و ئافرەتەکانیشیانی بە زیندوویی دەهێشتنەوە، بێگومان ئەو لە خراپەکاران بوون، بەڵام ئێمەش دەمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین، کە لە زەویدا دەچەوسێنرێنەوە و بیانکەین بە پێشەوا و بیانکەین بە میراتگر- ی فیرعەونەکان-.

بەڵێ! چەوسێنرانەوە و چینایەتیی - چ لەڕووی سیاسیی، چ ئابووریی، چ کۆمەڵایەتیی- لە هەر شوێنێك هەبێ، دیارە حوکم و دەسەڵاتێکی تاغووتیی و فیرعەونی لە ئارادایە، ئنجا بەهەر ناوێك و لەهەر بەرگ و بیچمێك دابێ و، ئازادیی ڕاستەقینە و دادگەریی هەمەلایەنە، تەنها و تەنها لەژێر سایەی حوکمی بەرنامەی خوادا مەیسەر دەبێ، دیارە ڕەوانەکرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و هاتنە خوارەوەی کتێب و بەرنامەکانی خواش، هەر بۆ ئەمە بووە، وەك خوای دادگەر و بەخشەر فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحديد:٢٥.

واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان، بە بەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوە و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن..

www.alibapir.com



## ١٠- با لە کوردایەتیی کردنمان دا، وریا بین!

دەبێ زۆر وریابین و لە گەرمەی هەست و سۆزی نەتەوایەتیی و، هەست کردنمان بە ستەمدیدەیی (مظلومیة)ی گەلەکەماندا، تووشی ئەم هەڵە کوشندانە نەبین:

١- خۆ کورت هەڵێنان لە قاوغ و جوغزی تەسکی نەتەوەییماندا و، گۆشەگیریی و دابڕان لە گەلانی دیکەی نێو ئۆممەت و جیهانی ئیسلامیی، چونکە ئەمە وێڕای ناشەرعیی بوونی، پێچەوانەی حاڵەتی شارستانەتیی و، ڕەوتی سیاسەتی پێکهێنانی قەوارەی فراوان و بەرەی هەمەجۆریشە و، دەبێتە جۆرە خۆ خنکاندنێك.

٢- دژایەتییکردنی هەر کام لە گەل و نەتەوەکانی عارەب و تورك و فارس، بەپاساوی ئەوەی، کە ئەو سێ گەلە دراوسێیە، هەریەکە بەشێك لە کوردستانیان دابڕیوە و، گەلی کوردیان بەسەردا بەشراوەتەوە، چونکە کورت بینیی و ڕواڵەت بینییە، کە ئێمە بەرهەم و دەرەنجامی (سایکس - پیکۆ) ببینین، بەڵام بەرهەم هێنەر و ئەنجامدەرانی ئەو پەیمانە شوومە بەدی نەکەین و، لەجیاتی ڕق داگرتن لەوانەی ئەسڵ و سەرچاوەی کێشە و دەردی ئێمەن، ڕق لەوانە هەڵگرین، کە لەبەرانبەر سایکس پیکۆدا، لەئێمە دەستەپاچەتر بوو ون، دیارە لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە، کە ڕژێمە تورکیی و عارەب و فارسییە داپڵۆسێنەر و دڕندەکان تاوانبار نەکەین، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە، کە ڕقی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی ئەو گەلانە، بە خەڵك و جەماوەرەکەیان نەڕێژین و، بەچاوی دوژمن سەیری ئەو گەلانە نەکەین، بەبێ جیاوازیی لەنێوان چاك و خراپیاندا و، ڕق بوونەوەشمان لەو

www.alibapir.com



ڕژێمانە، بێئاگامان نەکات، لە ماك و سەرچاوەی دەرد و کێشە و گرفتارییەکانی ئێمە و ئەوانیش، کە ئیمپریالیزمی جیهانیی کۆن و تازەیە.

دیارە ئێمە وێڕای گلەییمان، لە ڕژێمە داپڵۆسێنەرەکانی عارەب و تورك و فارس، لە دوو خاڵاندا، گلەییش ئاڕاستەی ئەو سێ گەلە دراوسێیەمان دەکەین:

**(أ)** کە پشتگیریی ڕژێمەکانیان بکەن و بۆیان ببنە سووتەمەنی، لە شەڕی دژی کورد و داپڵۆسێنەرانەیاندا، چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ۝٨﴾ القصص:٨

**(ب)** کە بە هاندەری ڕەگەزپەرستیی و نەتەوەپەرستیی، ئەم حاڵەتە ناشەرعیی و نائاساییەی کە لەسایەی شوومی (سایکس - پیکۆ)وە، بەسەر جیهانی ئیسلامییدا بەگشتی و، گەلی کورددا بەتایبەت سەپێنراوە، بە ڕەوا بزانن و، ئەو سنوور و دەوڵەتۆکە ئیمپریالیستییانەی[١] هەیانن وەك: (عێراق و تورکیاو ئێران و سوریا و میسر و جەزائیر و سعوودیە و...هتد). کە لەسەر کەوڵی ئۆممەتی ئیسلامیی و، بە مەبەستی پارەپارەکردنی و زەلیل کردنی دروستکراون، بەشتێکی پەسند و پیرۆز (مقدّس) بزانن و هەر کە گەلی کوردی مسوڵمانیش باسی کیان و بوونی خۆی کرد، لێی بکەنە گاڵە و هەرا و بە ئاژاوەچیی و (إنفصالي) و چی و چی، حیساب بکەن، هەر لەبەر ئەوەی ئیمپریالیزماغا لە (سایکس - پیکۆ) نامەکەیدا، هیچ حیسابی بۆ گەلی کورد نەکردوە، ئەوانیش بە تەقلیدی ئیمپریالیزم و پابەندیی بە پەیمان نامەیەکەوە و، گوێ لەمستیی بۆ بڕیارەکانی، هیچ حیسابی بۆ نەکەن و، گوێی ئیمان و عەقڵ و ویژدان بۆ داوای ڕەوا و، ئەو هەموو ئاهوناڵە و داد و فیغانەی نەگرن، کە چەندین ساڵە پێیەوە گرفتارن[٢]!!

---

(١) مەبەستمان ئەوەیە، کە ئەو دەوڵەتۆکانە، بەپێی نەخشە و پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانیی دروست کراون.

(٢) لە ساڵی (١٩٩٦) لە ئەستەمبووڵ، کە دەعوەت کرابووین بۆ بەشداریی لە پێنجەمین کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامییەکاندا، کە هەموو ساڵێ حیزبی ڕەفاهی تورکیایی، لەیادی ئازادکردنی (القسطنطینیة)دا - کە ئێستا ئەستەمبووڵی پێ دەڵێن - سازی

www.alibapir.com



مەگەر پابەندبوون و گوێ لەمست بوون بۆ نەخشە و پیلان و بڕیارەکانی ئیمپریالیزمی جیهانیی، ڕاست بەراوەژوو و پێچەوانەی فەرمانی خوا نییە، کە پێمان دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ آل عمران: ١٠٠-١٠١.؟!!

ئایا پێچەوانەی فەرمانی خوا نییە، کە بە پێغەمبەر و ئۆممەتەکەیشی- دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

---

دەکات، برایەکی عارەبی میصریی، کە لە برایانی (إخوان المسلمين) بوو، بە سەرسوڕمانەوە سەرنجی یەخەی چاکەتەکەمیدا و گوتی: ئەوە چییە برام، بۆچی لە پسوولەکەت نووسراوە: (The north of Iraq) (باکوری عێراق)؟! منیش گوتم: بۆچی؟! چ ئیشکالێکی تێدایە؟! گوتی: مەگەر نازانی، کە ئەوە بۆنی خۆجیاکردنەوە (الإنفصالية)ی لێدێ؟! منیش گوتم: با، ڕاست دەفەرمووی، منیش ئەم نووسینە بە زوڵم و ناشەرعیی دەزانم! گوتی: کەواتە: تۆش پشتگیریی دەکەی کە ئەم نووسینە هەڵەیە؟! گوتم: بەڵێ، بەڵام نەك بەو جۆرەی جەنابت! گوتی: ئەدی چۆن؟ گوتم: لەڕووی شەرعییەوە هیچ کەسێك بۆی نییە، زەوی یەکێکی دیکە و هیچ گەلێك بۆی نییە خاکی گەلێکی دیکە، زەوت بکات و مەسەلەی (غصب) کردنی زەوی و زار و موڵك وماڵی خەڵك لە قورئان و سوننەت و کتێبە شەرعییەکاندا، زۆر ئیدانە کراوە و، بەکارێکی زوڵم و ناڕەوا دانراوە، جا باکووری عێراق - هەروەها ڕۆژهەڵاتی تورکیا و ڕۆژئاوای ئێران و بەشێکی سووریا - مادام خاکی میللەتی کوردە و کوردی لێ ژیاوە و لێ دەژی، شەرعیی نییە، بلکێنرێ بە کیان و قەوارەی گەلێکی دیکەوە و، هەر ئەسڵەن ناوەکەیشی لەسەر نەخشەی سیاسیی بسڕنەوە! بەڵکو دەبوایە لەسەر پسوولەکەی من نووسرابایە: (بەشە کوردستانی لکێنراو بە عێراقەوە) (القسم الملحق بالعراق من كردستان)!! دیارە ئەو برایە ئەوەی گوتم، بۆی هەزم نەکرا، بەڵام خوا هەقە دەمیشی بوو بە تەڵەی تەقیوو، هیچی پێ نەگوترا، مەگەر ناڵێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ)!!

www.alibapir.com



**٣**- تێکەڵکردنی سۆزی نەتەوایەتیی و بیری نەتەوایەتی، یان مافی نەتەوایەتیی و نەتەوەپەرستیی، چونکە نەك هەر دووشتی لەیەك جیان، بگرە ڕاست پێچەوانە و دژی یەکدیشن! چونکە هەرچی سۆزی سروشتیی نەتەوایەتیی و نیشتیمان دۆستییە، ئەوەیە، کە ئینسان گەل و نیشتیمانی خۆی لەسەر هەق خۆش بوێن و بەرگرییان لێبکات و، نەهێڵێ هیچ کەس گەلەکەی بچەوسێنێتەوە و نیشتیمانەکەی لێ زەوت بکات.

بەڵام بیری نەتەوایەتیی (ناسیۆنالیزم) و نەتەوەپەرستیی ئەوەیە، کە گەل و نیشتیمانی خۆت لەسەر ناهەق خۆش بوێ و، هەوڵ بدەی هەموو گەل و نیشتیمانێکی دیکەیان بەقوربان و بەلاگێڕەوە بکەی.

بە واتایەکی دی: سۆزی نەتەوایەتیی و نیشتیمان پەروەریی، ئەوەیە کە بڵێی: با گەل و نیشتیمانی منیش، وەك گەل و نیشتیمانەکانی دیکەی دنیا ڕزگار و ئازاد بن، بەڵام ناسیۆنالیزم دەڵێ: دەبێ گەل و وڵاتی من ئاغا و کوێخا بن و، خەڵکی دیکەش خزمەتکار و ژێردەست، مەگەر هەرکام لە: (هیتلەرو مۆسۆلینی و ڕەزاشا و کەمال ئەتاتۆرك و صەددام حوسێن) هەر وایان نەدەگوت و واشیان نەکرد؟!

ئەمە لەلایەکەوە و لەلایەکی دیکەشەوە: سەرچاوەی هەڵقوڵینی سۆزی نەتەوایەتیی و داواکردنی مافی نەتەوایەتی، فرچك و سروشتی پاکی ئینسانە -هەر بۆیەش شەرع بە ڕەوای دادەنێ و پشتگیریی دەکات - بەڵام کانگای بیری نەتەوایەتیی و شوێنی تێدا سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم - وەك لە باسەکانی ڕابردوودا گوتمان- کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانن، کە لەئەنجامی لەبەرچاو بێزرانی ئایین و بەها بەرزەکانی، بەهۆی هەڵس و کەوتی چەوت و زاڵمانەی دامودەزگاکانی کڵێساوە، هەستیان بە بۆشایی عەقیدەیی و فیکریی و ڕووحیی کرد و، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەش، پەنایان بۆ کۆمەڵێك ڕێچکە و بیردۆزە برد، کە یەکێکیان بیری ناسیۆنالیزم بوو.

www.alibapir.com



٤- با بە مەرەدی عارەب و تورك نەچین! کە دەبینین هەر کام لە گەلی عارەب و تورك - کە جاران لەسایەی ئیسلامدا براگەورە و سەرقافڵەی کاروان بوون - بەڵام لە ئەنجامی پەنابردنیان بۆ ڕێچکە و بیردۆزە ڕۆژئاواییەکان، ئێستا بوونەتە پاشکۆیەکی زەلیل و بەهیچ دانراوی ڕۆژئاوا و، جاران بەهۆی ئیسلامەتییەوە، چەندە گەورە و بڵند بوون، ئێستا بەهۆی عەلمانییەت و ڕوو لەخوا وەرگێڕانەوە، هێندە گچکە و نابووتن!

ئنجا با ئێمەی گەلی کوردی مسوڵمانیش، دەرس و پەند لەو دوو گەلە مسوڵمانە، پێ بە پشکۆ سووتاوە وەربگرین و، ئەوەی ئەوان دەستیان پێیەوە چزاوە، ئێمەش دەستمان پێیەوە نەچزێ، چونکە ئینسان جاری وا هەیە بۆ خۆی تازە لە سەرەتای ڕێیەکدا هەنگاو دەنێ و، نازانێ کۆتاییەکەی چییە و چۆنە و بەکوێ دەگات؟ بەڵام ئەگەر لەو کەسانە پرسیار بکات، کە تا کۆتایی ڕۆیشتوون و گەڕاونەوە، تێدەگات کە ئایا درێژە بەڕێگابڕینەکەی بدات، یان وازی لێ بێنێ و ڕێیەکی دیکە بگرێتە بەر؟!

بەئومێدی ئەوەی گەلەکەمان بەهۆی پەند وەرگرتن لە غەیری خۆی و لەخۆیشی، بەختەوەر بێت.

www.alibapir.com



## لە کۆتاییدا

**خوێنەرانی بەڕێز!**

ئەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا هاتوە - لەگۆشەنیگای بەندەوە - هەڵوێستی ئیسلامە لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتیی بەگشتیی- و ناسك ترین و دژوارترین کێشەی نەتەوایەتیی لە سەدەی بیستدا، کە کێشەی کوردە بە تایبەت -.

ئنجا هیوادارم ئەم نووسراوە، بەرچاو ڕوونکەرەوەی ئیسلامییەکان بێ و، بۆ کەسانی لائیك و ناسیۆنالیستیش، ئیقناع کەر و دڵ دامرکێنەر بێ و، چیدی بە ناهەق ئیسلام و ئیسلامییەکان تۆمەتبار نەکەن و، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان نەکەن!

ئەمە وەك حاڵەتی تیۆریی (نظري) ئیسلامییەکان، لەمەڕ مەسەلەی نەتەوایەتیی و کوردایەتیی، وەك هەڵوێستی کردەیی (عملي) و حاڵەتی (تطبيقي)یش، (کە وەك لە پێشەکی ئەم چاپەدا ئاماژەمان پێکردوە، لێك ترازانی قسە و کردەوە و، حاڵیی بوون و حاڵیی ئینسان، نەخۆشییەکی زۆر خراپە) پێمان وایە: ئیسلامییەکان، ئەگەر لەقەدەر ئیسلامیش نەبن (کە بێگومان ئەمەش کەم و کوڕیی و کرچ و کاڵییە)، بەڵام لە قەدەر بارودۆخی سەخت و دژواری کوردستان و، لەچاو خەڵکی دیکە، کە کورد و کوردستانیش ویردی سەر زمانیانە، حاڵیان چاك و پەرێزیان پاکە.

خوای دادگەر و میهرەبانیش، بە لوتفی خۆی دەرووی خێری چاکتر لەگەلی مسوڵمانی کورد و گەلانی دیکەی مسوڵمانیش بکاتەوە و، هیدایەتیان بدات،

www.alibapir.com



کە جارێکی دیکەش هەمویان لەژێر یەك ئالاّ و لە یەك قەوارەدا کۆ ببنەوە، بۆ ئەوەی لە ئەنجامی کۆبوونەوەی مسوڵمانان، لە یەك بازنەی عەقیدەیی و یەك قەوارەی سیاسییدا، چەمك و واتای ڕاستەقینەی ئۆممەتی پێغەمبەر، زیندوو بێتەوە و، نەك هەر ئۆممەتی ئیسلام، بەڵکو سەرجەم مرۆڤایەتیی، بە هەموو ڕەنگ و ڕەگەز و زمان و بیروباوەڕەکانییەوە، لە سێبەری فەرمانڕەوایەتیی دادگەرانەی ئیسلامدا، بەختەوەر بێ و بحەسێتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# بەشی پێنجەم

## کۆمەڵێك وتار و نووسین،
## لەبارەی بابەتی نەتەوایەتیی و،
## چۆنیەتی چارەسەری کێشەی
## کوردەوە


Stay in touch on social media
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی

www.alibapir.com



## ١- كێشەی كورد: ڕەگ و ڕیشەكانی و ڕێی چارەسەركردنی

دەقی ئەو وتارەی بەندە كە لە كۆڕێك دا بە زمانی عەرەبی پێشكەشم كردوە لە شاری (پیشاور)ی پاكستان، لە ڕۆژی (٣)ی ذوالحجة ١٤١٢ ك، بەرانبەر (١٩٩١/٦/١٥ ز) دا.

شایانی باسیشە ئەو كۆڕە لەلایەن (النادي الإعلامي العربي)یەوە بۆ بەندە بەسترابوو، دواتریش دەقی وتارەكەی بەندەو پرسیارو وەڵامەكانی كۆڕەكەش لەلایەن (مجلة المرابطون)ەوە: (العدد الثامن، تموز ١٩٩١ م، محرم ١٤١٢ م) بڵاوكرایەوەو، ناوونیشانی وتارەكەشم، بەمجۆرە بوو :

(القضية الكوردية : جذورها ، وطريق حَلِّها)

پێویستە ئەوەش بگوترێ، كە ئەو كۆڕەم لەو سەفەرەدا بەسترا، كە بەندە هاوڕێ لەگەڵ بەڕێزان : مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی و مامۆستا مەلا ئەبوبەكری صددیقی، سێ قۆڵیی و پێكەوە سەفەری حەجمان كرد.

ئەمەش دەقی تەرجەمەی وتارەكەم، بێ دەستكاریی:

### كێشەی كورد : ڕیشەكانی و ڕێی چارەسەركردنی

برایانی خۆشەویست و بەڕێز! باشترین بەخێرهاتنتان دەكەم و سڵاوی بەپێزی ئیسلامتان لێ دەكەم : السلام عليكم ورحمه الله وبركاته ...

هەروەها سەلام و سڵاوی برا موجاهیدەكانی خۆتانتان بە فەرماندەو پێشمەرگەو، بەپیرو گەنجەوە، لەسەر زەمینی كوردستانی بریندارەوە، پێڕادەگەینم .

www.alibapir.com


زۆریشتان سوپاس دەكەین و، لەخوای بەخشەر داواكارین كە بە باشترین پاداشتتان بداتەوە، كە ئەم كۆڕەتان سازكردو، ئەمەش هەستكردنتان بە بەرپرسیاریی و بایەخ پێدانتان دەگەیەنێ، لەبەرانبەر كێشەی دادگەرانەی نەتەوەی كوردی مسوڵمانی ستەمدیدەدا.

**برایانی خۆشەویستم !**

ناوونیشانی ئەو باسەی ویستم پێشكەشتان بكەم ئاوایە :

(كێشەی كورد : ڕیشەكانی و ڕێی چارەسەركردنی )

ئەم باسەشتان لەم پێنج خاڵەی خوارەوەدا بۆ پوخت دەكەمەوە :

**خاڵی یەكەم:** نەتەوەی كورد كێیە ؟

**خاڵی دووەم :** كێشەی نەتەوەی كورد چییە؟

**خاڵی سێیەم :** كێشەی نەتەوەی كورد كەی سەری هەڵداو، لەكوێوە هات؟

**خاڵی چوارەم:** ئامانجی چاوەڕوانكراوی كورد، لە خەباتی بەردەوامی زیاتر لە یەك سەدەیدا، چییە؟

**خاڵی پێنجەم :** بەپێی ئیسلام، چۆن دەگونجێ كێشەی كورد چارەسەر بكرێ؟

پاشان ئەگەر كات بەبەریەوە بوو، هەڵوەستەیەكی كورت دەكەین، لەبەرانبەر ڕاپەڕینەكەی ئەم دواییەی نەتەوەی كورد، كە لە كوردستانی عێراقدا كرا.[١]

لە كۆشتاییش دا ئاماژە بەوە دەكەین كە وەك نەتەوەیەكی مسوڵمان چی لە برایانی ئیسلامییمان - بەگشتیی - چاوەڕێ دەكەین، لەبەرانبەر كێشە تراژیدیاكەمان دا ؟

---

(١) مەبەست ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی ١٩٩١ ز كە لە : ١٩٩١/٣/٥ لە شاری ڕانیەوە سەری هەڵدا، بۆیەش (ڕانیە) نازناوی (دەروازەی ڕاپەڕین)ی وەرگرت.

www.alibapir.com



خاڵی یەکەم : نەتەوەی کورد کێ یە ؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە پێویستی نازانم بتانبەمە نێو تاریکییەکانی مێژوو و قوڵاییە دوورەکانی، چونکە باس و لێکۆڵینەوەی زۆر، بە زمانە جیاوازەکان هەن لەبارەی ڕەچەڵەك و بنەچەکەی نەتەوەی کوردو پێگەیشتنی و عادەت و نەریتەکانییەوە، هەر کەس بیەوێ زۆر پێیدا قووڵ بێتەوەو ڕۆبچێ، دەتوانێ بۆیان بگەڕێتەوە، بەڵام بە کورتیی دەڵێم :

١) لەبارەی ڕیشەی نەتەوەی کوردو ناسنامەی نەتەوەییەوە، بەتایبەت لە نێو ڕۆژهەڵاتناسەکاندا، باس و خواس و مشت و مڕو بگرەو بەردەی زۆر بووە، بەڵام ئەو دەرەنجامەی لەسەری پێکهاتوون، بە پشتبەستن بەو سەرچاوەو دیکۆمێنتانەی هیچ بوارێك بۆ گومان و دوو دڵیی ناهێڵنەوە، ئەوەیە کە:

نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی ڕەسەن و ڕیشەدارەو، لەدێر زەمانەوە لەو ناوچەیەی کە ئێستا تێیدا نیشتەجێیە، نیشتەجێ بووەو، لە هەندێك لە قۆناغەکانی مێژووی درێژیان دا دەوڵەتانێکی پانتایی فراوانیان هەبوون.

ئێستاش ژمارەی کوردان لەسەرجەم بەشەکانی کوردستانی دابەشکراودا دەگاتە : نزیکەی سی ملیۆن (٣٠،٠٠٠،٠٠٠) کەس.

٢) نەتەوەی کورد مسوڵمانە بەڕێژەی (٩٨٪)و، لە ڕۆژگاری خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب)دا (خوا لێی ڕازی بێ)، بەخۆشحاڵیی و ڕەزامەندییەوە ئیسلامی وەرگرت و بڕوای پێهێنا.

مێژووش بۆمان دەگێڕێتەوە کە لە نێوان نەتەوەی کوردو سوپاسی ئیسلامدا، جەنگێکی شایانی باسکردن، ڕووی نەداوە، مەگەر بەدەگمەن، هۆکارەکەشی ئەوە بووە، کە نەتەوەی کورد بەر لە هاتنی ئیسلام بە ماوەیەکی درێژ، هیچ دەوڵەت و قەوارەیەکی سەربەخۆی نەبووە —وەك هەندێك لە کوردانی دەمارگیر

www.alibapir.com



گومان دەبەن و لاف لێ دەدەن-، بەڵکو گەلی کورد ئەو کاتە لەبن نیری دەوڵەتی ساسانیی دا لە ڕۆژهەڵاتەوەو، دەوڵەتی بێزەنتیی لەلای ڕۆژئاواوە، دەیانناڵاندو هەردووکیان تاڵاویان پێدەچێژت.

ئنجا کاتێك ئیسلام هات، بەدادگەریی و بەزەیی و شەریعەتە پاك و چاکەکەیەوە، کە عەرەب بەسەر عەجەمداو، سپی بەسەر ڕەش دا پەسەند ناکات. بەڵێ کاتێك ئیسلام بەشێوە ڕەسەن و ڕاستەکەی هات، نەتەوەی کورد لە باوەشی گرت و پێشوازیی لێ کرد وەك چۆن بابای تێنوو لە گەرمای هاوین دا، پێشوازیی لە ئاوی سارد دەکات و، بەعەقڵی پەسەندی کردو لە ناخی دڵییەوە خۆشی ویست.

**٣)** ئنجا هەر لەو کاتەوەی نەتەوەی کورد چووە نێو ئیسلامەوەو، بە ئایین و بەرنامەی ژیان پەسەندی کرد: بە گیان و سامانی خزمەتی کرد و فیداکاریی کرد لە پێناوی سەرخستنی و بەرزکردنەوەی ئاڵایەکەی داو، شارستانیەتی ئیسلامیی بەخزمەتە شکۆدارەکانی - بەتایبەت لە بواری زانست و سەربازییدا - دەوڵەمەندتر کرد.

هەر کام لە :

١- إبن صلاح الشهرزوري

٢- ابن الحاجب

٣- إبن الأثير المؤرِّخ

٤- إبن الأثير المحدِّث

٥- صلاح الدين الأيوبي

٦- مولانا خالد النقشبندي

٧- أحمد شوقي (أمير الشعراء)

٨- البيتوشي

٩- أمجد الزهاوي

www.alibapir.com



١٠- شيخ محمود الحفيد

١١- سعيد النورسي

(خوا لە هەموویان خۆش بێ) تەنیا چەند نموونەیەکن لەو کەسایەتییە دیارو کاریگەرانەی، کە نەتەوەی کورد لە سایەی ئیسلام دا بەرهەمی هێناون.

هەروەها لێرەدا پێویستە ئاماژەش بەوە بکەم کە نەتەوەی کورد چاکەی بەسەر زۆر لە گەلانی ئیسلامییەوە هەیە لە ڕووی سەربازییەوە، چونکە ئەو نەتەوە ناودارە بە ئازایەتیی و فیداکاریی لە هەموو چاخەکانی دا قەڵغانێکی بەهێزی دەوڵەتی ئیسلامیی بووە، هەر کام لە :

أ- بەرپەچدانەوەی پەلامارە دڕندانەکانی خاچپەرستەکان لە جیهانی ئیسلامیی، بە سەرکردایەتی (صلاح الدين الأيوبي) و،

ب- پاسەوانیی کردنی دەوڵەتی عوسمانیی، لە هەردووك لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە و،

ج- بەرپەچدانەوەی هێرشی ڕووسەکان لە ئێران، لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیی داو،

د- بەشداریی کردنی هۆزە کوردییەکان بەسەرکردایەتیی شێخ مەحموودی حەفید، لە جەنگی دژی ئینگلیزدا لە ساڵی ١٩١٨ز دا .

تەنیا چەند نموونەیەکی هەڵوێستی شەرەفەتمەندانەی ئەو نەتەوە مسوڵمانانەن لەبەرگریی کردنی لە وڵاتانی ئیسلامیی و پاسەوانییکردنی لە ئیسلام.

www.alibapir.com



## خاڵی دووەم: کێشەی نەتەوەی کورد چییە ؟!

ڕەنگە هەندێك کەس بە هەڵە وابزانێ کە کێشەی گەلی کورد ئەوەیە کە ناتوانێ لەگەڵ گەلە مسوڵمان و دراوسێیەکانی دا بژی!

یان کێشەکەی ئەوەیە کە دەیەوێ لە ئۆممەتی ئیسلامیی و نیشتیمانی ئیسلامیی جیابێتەوەو سەربەخۆبێ!

بگرە هەندێکیان گومانی بەد گەیاندوونیە ڕاددەیەك، کە ڕێ بەخۆیان بدەن :

پێیان وابێ ئەو نەتەوە ستەمدیدەو، دێرینیە لە ئیسلامەتییەکەی دا، کێشەکەی ئەوەیە کە دەیەوێ دەستبەرداری ئیسلام ببێ —یان بە کردەوەش وازی لێهێناوە- و لەسەر پاژنەکانی هەڵگەڕێتەوەو ڕوو لە ڕێچکەکانی گومڕایی بکات، دوای ئەوەی خوای بەرز خستوویەتە سەر ڕاستە ڕێیەکەی خۆی !!

نەخێر کێشەی ئەم نەتەوەیە هیچ کام لەم ئەگەرانە نیەو، هیچ شتێکی دیکەی لەو جۆرەش نیە، بەڵکو کێشەکەی بریتیە لە:

دانپێدانەهێنانی ڕاستەقینە بە بوونی دا، وەك نەتەوەیەك، کە مافی ژیانێکی ئازادانەو بە حورمەتی شایستەی مرۆڤی، لەسەر زەمینی خۆیدا هەبێ .

بەڵێ ئەی برایانم لە ئیسلام دا ! سوێند بەو خوایە کە جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیە، کێشەی نەتەوەیی کورد هەر ئەوەیە کە ئەو دەوڵەت و ڕژێمانەی نەتەوەی کوردیان بەسەردا بەشراوەتەوەو، سەر زەمینەکەی بەسەریان دا دابەشکراوە، بە کردەوە —بگرە زۆرجاران تەنانەت بەشێوەکی تیۆریش- دانی بۆ پێداناهێنن، کە گەلێکە زمان و نیشتیمان و قەوارەیەکی هەیە، وەك نەتەوە ئیسلامییەکانی دیکە، کە ئۆممەتی ئیسلامییان لێ پێك دێ.

ئنجا بێگومان لە کاتێك دا هەندێك لەوانەی داوای مافە ڕەوایەکانی ئەم نەتەوەیە دەکەن، بە ئانقەست یان هەڵە، ڕێی لاریان گرتە بەر، وەك پەنابردنە

www.alibapir.com



بەر بیردۆزە ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاواییەکان و، لاسایی کردنەوە ئیدۆلۆژییە بێبڕواییەکان، کە وەك لە هیچ کەسێکی بە ویژدان پەنهان نیە: ئەو هەڵس و کەوتە هەڵەو چەوتانە، هیچ لە هەقێتیی و ڕەوایەتیی کێشەی کورد ناگۆڕن، چونکە : هەق نابێتە ناهەق، هەر چەندە بەشێوازێکی ناهەقیش داوابکرێ، بەڵکو ئەگەر ئەهلی ناهەقیش داوای بکەن !

## خاڵی سێیەم : کێشەی نەتەوەیی کورد

## کەی سەری هەڵداو، لەکوێوە هات ؟

هەندێك لە دەمارگیرییە تێپەڕێنەرەکان کە وەك پێویست ئیسلامیان نەناسیوەو پێی ئاشنا نین، پێیان وایە ڕەگ و ڕیشەی کێشەی کورد بە قووڵایی زەمینی مێژووی ئیسلام دا چۆتە خوار!! بەڵام بۆ دەرخستنی پووچەڵیی ئەو دەعوایەو بێ بنەمابوونی تەنیا دوو بەڵگان دەهێنینەوە:

**یەك:** ئەگەر ڕاست بووایە ئیسلام ستەمی لە نەتەوەی کورد کردوەو، لە مافەکانی بێبەشی کردوە : گەلێك شۆڕش و ڕاپەڕینی پەیتا پەیتای دەکردن بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیی، بۆ گەیشتن بە مافە زەوتکراوەکانی، وەك چۆن لەم سەدەی دوایی (سەدەی بیست) کردی، چونکە ئەم نەتەوەیە بە قارەمانێتیی و مل نەدان بۆ ستەم و بێدەنگ نەبوون لە ئاست دەستدرێژیی دا، ناسراوەو ناوبانگی هەیە.

**دوو:** ئەگەر نەتەوەی کورد بەو جۆرە بووایە کە ئەوانە گومانیان بردوە، (صلاح الدین)ی ئەیوبیی نەیدەتوانی کاتی خۆی بگاتە لووتکەی فەرماندەیی بەهێزترین سوپای ئیسلامیی و سەرۆکایەتیی دەوڵەت و، ئەو سوپا ئیسلامییە لەژێر ئاڵایەکەی دا کۆنەدەبۆوە، کە لە چەندان گەل و نەتەوەی جۆراو جۆر پێکهاتبوو!

بەڵێ کێشەی کورد لە واقیعێکی ئیسلامییدا پەیدا نەبووەو، ڕەگ و ڕیشەی ئەو ئاژاوە بێ سەرەو بەرەو، ئەو ستەمە بێڕەزایە، لەسەر زەمینی ئیسلام دانەڕواوە،

www.alibapir.com



بەڵکو ئەو کێشەیە دوای دەسەڵات ڕانانی ئیمپریالیزمی جیهانی بەسەر جیهانی ئیسلامییدا، سەری هەڵدا، ئەویش پاش کۆتایی پێهێنانی دەوڵەتی (خیلافەتی) ئیسلامیی، کە بەهۆی نەخۆشیی و لادانە زۆرەکانیەوە، نەیتوانی لەبەرانبەر دوژمنە خاچپەرست و صەهیونییەکانی دا، خۆی ڕابگرێ و بەرهەڵستیی بکات.

ئنجا دوای ئەوەی ئیمپریالیزم نیشتیمانیی ئیسلامیی خستە ژێر ڕکێفی خۆی و، میراتی دەوڵەتی عوسمانیی دابەشکردو لەنێو ئەو میراتەش دا (کوردستان) هەبوو، کە پارچە پارچە کرابوو و، بەپێی ڕێککەوتننامەی (سایکس –بیکو) ی ستەمکارانە کە لە ساڵی ١٩١٦ز دا، لەنێوان ڕووسیاو بەریتانیاو فەرەنسادا ئیمزا کرابوو، بەسەر دەوڵەتە دراوسێیەکانی دا، بەشرابۆوە !

**ئنجا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد :**

هەر کەس بە مانەوەی ئەو کێشەیە ڕازی بێ، کە کێشەی تێکڕای مسوڵمانانە، نەك تەنیا هی نەتەوەی کورد، یان بەلای کەمەوە :

ئەو ڕێککەوتننامە ئیمپریالیستییەی کە ئەو کێشەیەو گەلێك کێشەی دیکەی لە جیهانی ئیسلامییدا لێ پەیدابوون، بە ناشەرعیی و ستەمکارانە دانەنێ، ئەوە ئاگایانە یان خۆگێل کەرانە : بەزمانی حاڵ شایەدیی دەدات کە بە نەخشەکانی کوفری جیهانیی ڕازییە، لە حاڵێك دا کە خوا (عزو جل) هۆشیاریی پێداوین لەبارەی شوێنکەوتنی جوولەکەو نەصرانییەکان و دۆستایەتیی کردنیانەوە و فەرموویەتی :

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ ﴾ (المائدة : ٥١).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! جوولەکەو نەصرانییەکان بەدۆست مەگرن، ئەوان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن و، هەرکەسێکیش لە ئێوە بەدۆستیان بگرێ، ئەوە لەوانە، بەدڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست.

www.alibapir.com



خاڵی چوارەم: ئایا ئامانجێك كە نەتەوەی كورد لە خەباتی نەپساوەی زیاتر لە سەدەیەكی دا بەدوای دا عەودالە، چییە؟

ئەو ئامانجەی كە نەتەوەی كوردی مەینەتبار هەوڵی بۆ داوەو بۆی تێكۆشاوە، بەدرێژایی مێژووی پڕ لە شۆڕش و ڕاپەڕین و بەدرێژایی خەباتی سیاسیی و پێشمەرگایەتیی، دژی ئەو دەوڵەت و ڕژێمانەی لە كوردستان و خەڵكەكەیانیان بەسەردا دابەشكراوە، هەر ئەوە بووە كە ئەویش بە نەتەوەیەك دابنرێ، وەك سەرجەم نەتەوەكانی دیكەی جیهان و مافە شەرعییەكانی خۆی وەدەست بهێنێ، هەروەها كە :

هیچكەس نەیخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو، نیشتیمان و وڵات و هیچ مافێك لە مافەكانی لێ زەوت نەكات.

چونكە ئەم نەتەوەیەش سەرجەم ئەو تایبەتمەندیی و ئیمتیازانەی هەن، كە دەیبەنە ڕیزو ئاستی نەتەوەكانی دیكەی دنیاوە، بەبێ كەم و زیادیی.

ئیدی بەپێی ئەوە - كەباسكرا - ئەویش وەك هەر نەتەوەیەكی دیكە مافی خۆیەتی، كە خاوەنی قەوارەو بوونی نەتەوەیی خۆی بێ، وێڕای ئەو گەل و نەتەوانەی كە ئۆممەتی ئیسلامییان لێ پێك دێ.

ئنجا نەتەوەی كورد لەسەر بناغەی ڕەگەزپەرستیی و، بە هاندەری دەمارگریی نەفامیی و، لەسەر حیسابی بوون و مافەكانی ئەوانی دیكە، داوای ئەو مافەی ناكات، بەڵكو لەسەر بناغەی هەق و دادگەریی و بەپاڵنەری لابردنی ستەم و دەستدرێژیی، خوای بەرزیش فەرموویەتی :

﴿ ... لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ (البقرة: ٢٧٩).

واتە: ستەم مەكەن و با ستەمیشتان لێ نەكرێ.

www.alibapir.com



هەڵبەتە نکووڵییش لەوە ناکەین: کە هەندێك لە لایەنە بانگەشەکەرەکانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، هەندێك جاران گیرۆدەی چەوتیی و بەلاڕێدا چوون بوون و، ڕووی گەش و جوانی کێشەی ڕەوای کوردیان ناشیرین و دزێو کردوە ! بەڵام ئەوانەش دیسان هەندێك پاساویان هەن، چونکە وەك گوتراوە : (الغريق يتشبَّثُ بكلِّ حشيش) (بابای خنکاو دەست بۆ چڵەپوشیش دەبات)، ئنجا ئەگەر لە حوکمی دادگەرانە بخەفتێین و بە ڕواڵەتی شتان واز نەهێنین و، سەرنجی دیوی پەنهانیان بدەین، پێویستە ڕووی ڕەخنەو گلەیی تەنیا نەکەینە ئەو گرووپ و لایەنە لادەرانە، بەڵکو بە پلەی یەکەم : ئەو ڕژێمانە سەرزەنشت بکەین و تاوانبار بکەین، کە بە ئاگرو ئاسن حوکمڕانییان بەسەر گەلی کورد دا کردوەو، ناچاریان کردوە پەنابەرێتە بیردۆزە بێبڕواییە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکان و، سەرەنجام بەمەرەدی ئەو کەسە بچن کە گوتوویەتی: (فتداويت بالذي هو الدَّاءُ) بە شتێك خۆم چارەسەر کرد، کە خۆی دەرد بوو !

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



خاڵی پێنجەم : چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چییە؟!

لە ڕابردوودا بە کێشەی کوردو ڕیشەکەی و، ئەو ئامانجە کە گەلی کورد لە خەباتی درێژخایەن و شێلگیرانەی دا لەبەرچاوی گرتوە، ئاشنا بووین، ئێستاش ماوەتەوە بزانین چارەسەری ئەو کێشەیە چییە کە دوژمنانی ئۆممەتی ئیسلامیی هێناویانە ؟!

کەواتە:

با سەرنجی ئەو کێشەیەو چارەسەرەکەی بدەین، لەبەر ڕۆشنایی چەنج پرەنسیپێکی هەڵهێنجراو لە کتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم):

خوا (جل شأنه) لە سوورەتی (الحجرات)دا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات ١٣).

واتە : ئەی خەڵکینە ! ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێیەك وەدیهێناوەو، بەمەبەستی پێك ئاشنا بوون و هاوکاریی، گێڕاومانن بە چەند نەتەوەو هۆزێك، بەدڵنیایی ئەوەتان لەلای خوا بەڕێزترو بەقەدرترە کە پارێزکارترە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

دەتوانین لەم ئایەتە بەپێزەدا چەندان پرەنسیپ (مبدأ)ی گشتی هەڵبهێنجین، بۆ نموونە:

یەك: خەڵك لە ئەسڵی دروستبوونیاندا یەکسانن و، هەموویان دروستکراو و پەروەردەکراوی یەك پەروەردگارن، بێ جیاوازیی و پلەو ئیمتیاز، ئەمە لە ڕووی دروستکران و پەیداکرانییانەوە، لەڕووی پێگەیشتنیشیانەوە: لە نێرو مێیەك (ئادەم و حەووا) لە دایك بوون، بۆیە یەك ڕەچەڵەکیان هەیە لە یەك پلەو پایەدان.

www.alibapir.com



**دوو:** بەپێی ویستی خوای بەرز، خەڵك بۆ چەندان گەل و هۆز لەسەر زەوی، دابەش کراون، کەواتە : ئەوە کە عەرەب عەرەبەو، تورك تورکەو، کورد کوردەو.. هەروەها گەلانی دیکەش، ئەوە بە ویست و خواستی خوا (جلّ شأنه) بووە.

بۆیە لەم ڕووەشەوە دیسان جیاوازیی و بەرزیی و نزمییان لەنێوان دا نیەو، هەموویان گەل (قوم) بوون و نەتەوە (شعب) بوونیان دا یەکسانن، زمان و ڕەنگ و جیاکەرەوە نەتەوەییەکانی دیکەش، ڕاست نیە پشتیان پێ ببەسترێ (بە بەڵگە بهێنرێنەوە) بۆ بەرزیی و نزمیی، بەڵکو ئەو جیاوازیی و تایبەتمەندییە نەتەوەییانە، چەند دیمەنێکن لە نیشانەکانی خوا (عزوجل)، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الروم (٢٢).

واتە: هەروەها لە نیشانەکانی (خوا) دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی و جیاوازیی زمان و ڕەنگەکانتانە، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن بۆ زانایان.

**سێ:** تەرازووی ڕێزو حورمەت و پێوەری بەرزیی و نزمیی لەلای خوای بەرز، پارێزکاریی (تقوى)یە، کە تێکڕای خەسڵەتە بەرزەکان کۆ دەکاتەوە .

**کەواتــە:**

أ) هەر کەسێ: لافی چاکتربوون و پلەو ئیمتیاز لێبدات، بۆ خۆی، یان بۆ بنەماڵەکەی یان گەلەکەی، بەسەر کەسێکی دیکەدا، بەپشتبەستن بە ئەسڵی دروستبوون و پێگەیشتنی، ئەوە بەهەڵەدا چووە.

ب) هەروەها هەرکەس بیەوێ بوونی هۆزێك یان گەلێك، یان یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی نەهێڵێ، ئەوە دژایەتی ویستی گەردوونیی و شەرعیی خوا دەکات و لەگەڵیاندا تێك دەگیرێ، چونکە خوای بەرزو مەزن، بوونی ئەو نەتەوەیەی بەو تایبەتمەندییانەوە ویستوە، ئەویش دەیەوێ ئەو بوونە نەهێڵێ.

ج) هەروەها هەر کەسێك بیەوێ لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ، خۆی بەسەر غەیری خۆیدا بسەپێنێ، ئەوە بەو کارەی پێچەوانەی حیکمەتی خوا جووڵاوەتەوە،

www.alibapir.com



کە بە مەبەستی پێك ئاشنابوون و تەبایی و هاوکاریی، خەڵکی گێڕاوە بە چەند گەل و هۆزێك.

**د)** هەروەها ئەگەر کەسێك بە توخم و ڕەچەڵەکی، خۆی هەڵکێشێ یان لافی پلەو پایەو تایبەتمەندیی لێبدات، ئەوە تەرازووی خوای کارزانی واز لێهێناوەو، دەستی بە تەرازووی نەفامییەوە گرتوەو، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (محمد) صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :

(لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ ). وهو حديث ضعيف كما قال الألباني في ضعيف أبي داود .

واتە: هەر کەس بانگەشە بۆ دەمارگیریی بکات لە ئێمە نیە و، هەر کەس لەسەر دەمارگیریی بجەنگێ لە ئێمە نیەو، هەر کەس لەسەر دەمارگیریی بمرێ، لە ئێمە نیە.

دەمارگیریی (عصبيّة)یش وەك هەندێك کەس پێیان وایە، ئەوە نیە کە گەلی خۆت خۆشبوێ و بەپێی توانا چاکەو خێریان بۆ دەستەبەر بکەی، چونکە پێغەمبەری بەڕێز (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

" خيركم المدافع عن عشيرته ما لم يأثم ".

أخرجه أبو داود (رقم ٥١٢٠) من طريق أيوب بن سويد عن أسامة بن زيد أنه سمع سعيد بن المسيب يحدث عن سراقة بن مالك بن جعشم المدلجي قال: خطبنا رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: فذكره.

قلت: وهذا سند ضعيف جدا من أجل أيوب بن سويد ضعفه أحمد وأبو داود وغيرهما.

واتە : باشترینتان بەرگرییکاری هۆزەکەیەتی، مادام گوناهبار نەبێ.

یانی: مادام بەناهەق و ستەم، بەرگریی لە هۆزەکەی نەکات.

بەڵکو دەرمارگیریی وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

(وعن واثلة بن الأسقع - رضي الله عنه - قال : قلت : يا رسول الله ما العصبية ؟ ) أي : الجاهلية ( قال : أن تعين قومك على الظلم ) ، يعني : أن الواجب عليك متابعة

www.alibapir.com



الحق من غير نظر إلى ملاحظة الخلق ، ولهذا قال - صلى الله عليه وسلم - على ما رواه الدارمي وابن عساكر عن جابرمرفوعا " انصر أخاك ظالما أو مظلوما إن يك ظالما فاردده عن ظلمه ، وإن يك مظلوما ، فانصره " . ( رواه أبو داود ) : وكذا ابن ماجه .

واتە: دەمارگیریی ئەوەیە کە یاریدەی کۆمەڵەکەت (گەل، حیزب، هۆز ...) بدەی لەسەر ستەم.

ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەم پڕەنسیپانە (المبادیء)دا دەتوانین بڵێین :

{چارەسەری کێشەی کورد ئەوەیە: ئەو نەتەوەییە ستەمدیدەیە، ئەو مافانەی وەدەست بهێنێ، کەبوونی نەتەوەیی لەسەریان وەستاوەو، بەبێ ئەوان نەتەوە بوون (شعبیە)یك کەخوا بۆوی و بۆ سەرجەم نەتەوەکان بەڕوونتر دەربڕین بڕیاری لەسەر داوە، نایەتەدی}.

تێبینییەکیشم ماوە لەو بارەوە هەردەبێ باسی بکەم :

من وەك مسوڵمانێك پێم وانیە کە کێشەی کورد بەبێ بەرپاکردن حوکمی خوای بەرز، بەشێوەیەکی ڕاست و ڕیشەیی چارەسەر بکرێ، بەڵێ پێم وانیە کە ئازارو مەینەتییەکانی نەتەوەی کورد، تەنیا بەوەی قەوارەیەکی نەتەوەیی و دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست دەبێ، لابچن.

بەڵگەی ئیسپاتی ئەوەش :

**یەك:** ئێمە گەلی عەرەب دەبینین نەك دەوڵەتێك، چەندین دەوڵەتی هەن، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە شەریعەتی خوا لە واقیعی ژیانی دا حوکمی پێ ناکرێ، کۆمەڵگە عەرەبییەکان و غەیری وانیش دەبینین ئازارو مەینەتیی زۆری تاقەت پڕووکێن دەوریان داون.

**دوو:** هێنانەدی مافە ڕەوایەکانی نەتەوەی کوردو هەر نەتەوەیەکی دیکەش بەشێوەیەکی حەتمیی پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە دەوڵەتێکی نەتەوەیی بەرپابێ، بە بەڵگەی ئەوە کە وەك پێشتر باسکرا : نەتەوەی کوردو نەتەوە

www.alibapir.com



ئیسلامییەکانی دیکەش لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، لە مافەکانی خۆیان بەهرەمەندبوون و حاڵەتەکانی ماف پێشێلکردن و ستەمی بێ ڕەزا، تەنیا لە چەند حاڵەتێکی دەگمەنی لادانی دەوڵەتدا، لە هێڵی ئیسلام، ڕوویانداوە.

هەر بۆیەش گەلی کوردیش وەك گەلانی دیکەی مسوڵمان، بیری لەوە نەکردۆتەوە کە لە دەوڵەتی ئیسلامیی جیاببێتەوەو قەوارەیەکی سەربەخۆ بنیات بنێ، هەندێك حاڵەتی دەگمەنیش هەن کە قیاسیان لەسەر ناکرێ.

بەڵام دوای ئەوەی تورکە گۆڕانییەکان دەستبەرداری پەیوەندی ئیسلامیی بوون و، دەستییان بە پەیوەندیی نەتەوەییەوە گرت و، ئاڵای برایەتیی ئیسلامییان کە گشتگیر بوو بۆ هەموو گەلانی مسوڵمان، فڕێداو، ئاڵای گۆڕانییەتیان لە شوێن دانا!

گەلانی دیکەی مسوڵمانیش بەهەمان شێوە دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لەبارەی خۆیانەوە، هەر بۆیەش مێژووزانی کوردی ناودار (محمد أمين زكي بگ) لە سەرەتای کتێبەکەی خۆی : (خولاصەی تەئریخی کورد و کوردستان)دا گوتوویەتی:

(لەدوای ئەمە، کە لە جێگەی تەعبیری عموومیی(عوثمانی)، لە فظی (تورك) و (تۆرانیی)، لە تورکیادا باوی سەند، بە طەبیعەت، وەکو ئەفرادی میللەتەکانی تر، منیش لەناو ئەو کۆمەڵەدا، غیرەتی خۆم چاکتر حیس کردو، غرووری قەومیی، مەجبووری کردم کە لە هەموو فرصەتێکدا ئەم حیسسەی خۆم ئیظهار بکەم)[1].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا: ئەگەر نەگونجا دەوڵەتێکی ئیسلامیی فراوان کە تێکڕای گەلانی موسڵمان بگرێتەوە، بەرپابکرێ، هیچ گوناهو سەغڵەتێکی تێدا نابینی کە گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەش - ئەگەر توانی- دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەسەر خاکی خۆی دابمەزرێنێ، دواییش ئەو دەوڵەتانە لەنێوان خۆیاندا هاوکاریی بکەن و دەوڵەتی ئیسلامیی فراوان و گەورە پێك بێنن، کە بەهۆی ڕووخانی دەوڵەتی

---

(١) بڕوانە لاپەڕە: ١.

www.alibapir.com



(خیلافەتی) عوسمانییەوە لەدەستمان چوو و، لە ئاکامی ئەوەش دا: ئەو هەموو بەڵاو نسکۆیانەمان بەسەردا ڕژان کە هەموومان تاڵاوەکەیان دەچێژین.

کەواتە: ئەسڵی پرسەکە ئەوەیە کە بەشێوەیەکی ئیسلامییانە چارەسەری کێشەکانمان بکەین، نەك نەتەوەگەرییانەو نیشتیمانییانە، هەروەها بە هیچ شێوەیەکی دیکەش تا لەو هەموو شێوە زۆرانەی کە تێکڕا لەژێر ناوونیشانی نەفامیی (جاهلیە)دا کۆدەبنەوە.

**لە کۆتاییدا ڕاپەڕینەکەی ئەم دواییە: (واتە: ڕاپەڕینی جەماوەریی: ١٩٩١/٣/٥ ز):**

ئەم ڕاپەڕینەی ئەم دواییە کە لە کوردستانی عێراق ڕوویدا: تەقینەوەیەکی جەماوەریی بێڕەزا بوو، لە ئەنجامی فشارە لەسەریەك کەڵەکەبووەکانی ڕژێمی بەعسی ستەمکاردا، لە ساڵانی دوورو درێژەوە.

هۆی تەقینەوەکەشی لەو کاتە دیارییکراوەدا، ئەوە بوو خەڵك هەستیان کرد چنگی ستەمکارانە ڕژێمی گاغووتی لەسەریان شل بووە، ئیدی لەسەرەتاوە هێدی هێدی دەستیان بە جووڵە کردو، کاتێك بەرهەڵستییەکی وایان لە سوپاو هێزەکانی دیکەی ڕژێم نەدی، ئەوە هانیدان زیاتربەرەوپێشەوە بچن، تاکو سەرەنجام لەماوەی نزیکەی مانگێك دا زۆربەی کوردستانی عێراقیان ئازادکرد.

شایانی باسیشە کە لەسەرەتاوە هیچ کام لە حیزبە سیاسییەکانی کوردستان - بەتەنیا - جووڵێنەرو هاندەری ئەم ڕاپەڕینە نەبوو[1]، بەڵام دوایی سواری شەپۆلەکە بوون و، لە قۆناغەکانی دواییش دا، بەشداریی خەڵك و جەماوەریان کردو شەپۆلەکەیان بەرەو پێشەوە پاڵداو، بزووتنەوەی ئیسلامیی و تەوژمی ئیسلامییش بە گشتیی ڕۆڵێکی بەرچاوی بوو، بەتایبەت لە هەندێك ناوچەدا.

---

(١) دیارە پێش دەستپێکردنی ڕاپەڕینی جەماوەریی: ١٩٩١/٣/٥ز، لایەنە سیاسییە چەکدارەکانی ئەوکاتە، هەر کەسە بە قەبارەی خۆی، کۆبوونەوەو ڕاوێژو تەگبیری زۆریان پێکەوەکردن، بۆ چۆنیەتی ئیدارەدانی ئەو ڕاپەڕینەی کە چاوەڕێ دەکرا ڕووبدات، بەڵام دەستپێکەکەی لەلایەن خەڵك وجەماوەرەوە بوو.

www.alibapir.com



## ٢- ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی ئاگرکردنەوە لەڕۆژی نەورۆزدا

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لەبارەی ڕۆژی نەورۆزەوە بەکورتیی دەڵێم: ئاگرکردنەوە لەورۆژەدا، ئەگەر بەنیازو مەبەستی خراپ نەبێ "وەك بەپیرۆز گرتنی ئاگر کە عادەتی مەجووسییەکان بووە"، ئەوە بەپێی بنچینەی: هەڵس و کەوتەکان لەبنەڕەتدا ڕەوان، مەگەر ئەوەی شەرع قەدەغەی کردبێ: (الأصل في المعاملات الإباحة، الاّ ما حرَّمه الشرع) ئاگر کردنەوەش چ لەڕۆژی نەورۆزدا "وەك یادێکی نەتەوەیی"، چ لە هەر ڕۆژێکیدیکەدا، وەك سەرجەم هەڵس و کەوتەکان ڕەوایە، چونکە هیچ دەقێکی شەرعیی تایبەت لەسەر قەدەغەکردنی نیە، بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە بیستم کە هەندێك ڕەخنەو گلەییان لەوبارەوە دەربڕیوە، بە بەڵگەی ئەوە کە لەهەندێك شوێنەواران (ێپار)دا هاتوە، کە هاوەڵان ئاگر کردنەوەیان لەڕۆژی نەورۆزدا قەدەغە کردوە!

**ئنجا لەوبارەوە دەڵێم:**

ئەگەر گریمان سەنەدی ئەو شوێنەوارو گێڕاوانە ڕاستیش بێ، نابێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی ئاگرکردنەوەی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە، بەبۆنەی نەورۆزەوە، چونکە:

لەئاشکرایەکانی فیقهی ئیسلامییە، کە فەتوا بەپێی کات و شوێن و شەخس و عورف و حاڵ دەگۆڕێ (الفتوى تختلف زماناً ومكاناً وشخصاً وعرفاً وحالاً)، ئنجا ئەگەر هەندێك لە هاوەڵان و زانایانی پێشین، ئاگرکردنەوەی

www.alibapir.com



نەورۆزیان قەدەغە کردبێ، دیارە زانیویانە کە خەڵکی ئەوکاتە کە لەڕۆژگاری حوکمی مەجووسییەکانەوە نزیك بوون، بەپاڵنەر بەپیرۆزگرتن (تقدیس)ی ئاگر ئەو کارەیان کردوە، بۆیە قەدەغەیان کردوە، بەڵام بێگومان حوکمی ئەو مەسەلەیە دەگۆڕێ لەکاتێکدا خەڵکێکی مسوڵمان و خواپەرست "نەك نا مسوڵمان و ئاگرپەرست" بەپاڵنەری یادکردنەوەی بۆنەیەکی نەتەوەیی و خۆشحاڵیی دەربڕین، بە دەربازبوون لەستەم و چەوسێنرانەوە، ئەوکارە دەکەن! وەك چۆن پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" لەسەرەتاوە کە خەڵکەکە لە ڕۆژگاری شیرك و بتپەرستییەوە نزیك بوون، سەردانی گۆڕستانی لە مسوڵمانانی قەدەغەکردبوو، نەوەك گیرۆدەی شیرك و پاڕانەوە لەمردووان ببن، بەڵام دوایی کە دڵنیابوو، خوا بەیەکگرتن (توحید) لەدڵیاندا چەسپیوە، مەترسیی شیرکیان لێناکرێ، ڕێگای دان وەك فەرموویەتی: (کنت نهیتکم عن زیارة القبور فزوروها) مسلم: ٩٧٧، واتە: پێشتر سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون، بەڵام ئێستا سەردانیان بکەن.

لەڕیوایەتێکدا هاتوە: (فمن أراد أن یزور القبور، فَلْیَزُرْ فإنها تذكرةٌ بالآخرة) أبو داود: ٣٢٣٥، والنسائي: ٢٠٣٢، واتە: هەرکەس دەیەوێ سەردانی گۆڕستان بکات بابچێ، چونکە دوا ڕۆژ دەخاتەوە بیر.

کەواتە: هەرکات حاڵ و بارودۆخ گۆڕا، پێویستە فەتواش بگۆڕێ، مادام بەهۆی بارودۆخێکی جیاوازو تایبەتەوە، ئەو فەتوایە درابێ!

پێشم وانیە هیچ مسوڵمانێك کە ئاگری نەورۆز دەکاتەوە، بە پیرۆزگرتنی ئاگری هەر بەبیریشدابێ، بۆیە پێویستە خۆمان بە فەتوایەکەوە نەبەستینەوە، کە لەکات و شوێنی دیکەداو بۆ خەڵك و حاڵەتێکی دیکە گوتراوە، ئەگەرنا لە بنەمای: (الفتوى تختلف زماناً ومكاناً وشخصاً وعرفاً وحالاً) لاماندەوە ستەمیشمان لەخەڵکێکی مسوڵمان کردوە، کە بەناهەق تۆمەتبارمان کردوون بەشیرك و ئاگر پەرستییەوە.

ئەوە بەنسبەت لایەنە شەرعییەکەیەوە، بەڵام بەنسبەت لایەنی ژینگەیی و تەندروستییەوە، بێگومان بۆ هیچکەس دروست و ڕەوا نیە، هیچ هەڵس و کەوتێك

www.alibapir.com



بکات کە زیان بەژینگەو تەندروستیی خەڵك بگەیەنێ، وەك ئاگرکردنەوەیەکی زیانبەخش، بۆ وێنە: سووتاندنی تایەو قیرو هتد...، کەواتە: ئەوانەی بەو بۆنەیەوەو، بەنیازو مەبەستێکی شەرعییەوە، ئاگر دەکەنەوە، دەبێ ئاگر کردنەوەکە بەجۆرێك بێ و بە کەرەستەیەك بێ، کە نەبێتە مایەی زیانگەیاندن بەژینگەو تەندروستیی خەڵکی، ئەگەرنا با لەئەسڵیشدا ڕەوابێ، بەهۆی زیانباربوونی خەڵکەوە، قەدەغە دەبێ، وەك چەندان دەقی قورئان و سوننەت دەیگەیەنن، بۆ وێنە:

﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ الأعراف: ٨٥.

واتە: وە دوای ئەوەی سەرزەمین باشکراوە خراپەی تێدا مەکەن ئەگەر ئیمانتان هەیە، ئەوە بۆ ئێوە باشترە.

هەروەها پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: **(لاضرر ولا ضرار)** رواه مالك: ١٤٩٤، وابن ماجه: ٢٣٤٠، والحاكم والبيهقي وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصحيح وزيادته":١٥١٧.

واتە: لەسەرەتاوە زیان بەخەڵك گەیاندن و لەبەرانانبەر زیاندا، زیان بەخەڵك گەیاندن "وەك تۆڵە" ڕەوا نیە.

پێشم وایە هەرکەس بە ئینصافەوە ئەم چەند دێڕە بخوێنێتەوەو، شتێك لەبارەی (فقه) و (أصول الفقه)ەوە بزانێ، بایی قەناعەت پێهێنانی دەکات و، ئەوەی هەر لەبیانوو گرتنیش بخەفتێ و حەزی لەشەڕە قسە بێ، ئەوە ڕێ لەبیانوو گرتن ناگیرێ.

هیواداریشم کەس وا لەقسەکانم حاڵی نەبێ، کە ئێمە خەڵك بۆ ئاگرکردنەوەی نەورۆز هاندەدەین! بەڵکو مەبەستی سەرەکییم ئەوەیە، کە بەبێ بەڵگەی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەرعیی، شتی موباح لەخەڵك قەدەغە نەکەین، چونکە خوا فەرموویەتی:

www.alibapir.com



﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ١١٦ ﴾ النحل: ١١٦.

واتە: هەروا بە وەسفکردنی زمانتان بەدرۆ مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامەو، سەرەنجام بەناوی خواوە درۆ هەڵبەستن، بێگومان ئەوانەی درۆ بەخواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

پێغەمبەری خواش "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (إن الله تعالى فرض فرائض، فلا تضيِّعوها، وحدَّ حدوداً، فلا تعدّوها، وحرَّم أشيا و، فلا تَنْتَهكوها، وسكت عن أشياءَ، رحمة لكم غير نسيانٍ، فلا تَبْحَثوا عنها) رواه الدار قطني والطبراني في الكبير والبيهقي وحسّنه النووي.

واتە: بێگومان خوای بەرز هەندێك فەرزی داناون زایەیان مەكەن و، هەندێك سنووری دیاریی كردوون مەیانبەزێنن و، شتانێكی قەدەغە كردوون، توخنیان مەكەون و، لەڕووی بەزەییەوە بەرانبەرتان بەبێ لەبیرچوون، لە هەندێك شت بێدەنگ بووە، لێیان مەكۆڵنەوە.

خواش بە لوتف و كەرەمی بێ سنووری خۆی، شارەزایی بەدین و، ئاشنایی ژین، بۆ هەمووڵایەكمان زیاد بكات.

عەلی باپیر

٢٠١٢/٣/١٨

هەولێر

www.alibapir.com



## ٣- چەند پڕەنسیپێك و هەنگاوێكی كردەیی بۆ چارەسەری كێشەی كورد

دەقی وتارەكەی بەندە بەزمانی عەرەبیی، كە لەلایەن (مامۆستا ڕێبوار حەمەد)ەوە خوێنرایەوە، لەكۆنگرەیەكی (مركز القدس للدراسات السياسية)دا كە لە بەیرووت بەسترا بوو، لەڕۆژی: (٢٠١٨/١٢/١٨)دا:

**(شایانی باسە وتارەكە وەك خۆی و، بێ دەستكاریی، وەردەگێڕینە سەر زمانی كوردیی)**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات ١٣).

سەرەتا سوپاس و پێزانینم پێشكەشی برای بەڕێز: (عريب الرنتاوي) بەڕێوەبەری گشتی: نێوەندی قودس بۆ لێكۆڵینەوە سیاسییەكان و، سەرجەم هاوكاریی لە نێوەندەكەدا، دەكەم، لەسەر بەستنی ئەم كۆنگرەیە و كۆنگرەكانی پێشووش، بەئامانجی درەوشاندنەوەی گوتارێكی ئیسلامیی هاوچەرخ كە مایەی پێویستییەكانی سەردەم و، دەستەبەركەری ئامانجەكانی كۆمەڵگابێ.

ئنجا دەچمە سەرئەسڵی بابەتەكەو دەڵێم:

www.alibapir.com



نەتەوەی کورد لەنەتەوە ڕەسەن و ڕیشەداکوتاوەکانی ئەم ناوچەیەیە کە تێیدا دەژی و تێیدا ژیاوە، لەهەزاران ساڵ لەمەوبەردەوە، وەك نووسین و شوێنەوارە بەجێماوەکانی پێشینانی، نیشانی دەدەن.

کێشە و مەینەتیی نەتەوەی کوردیش، کە لەچەوسێنرانەوەی نەتەوەیی (الإضطهاد القومي)و، لەنەبوونی لەسەر نەخشەی سیاسیی و بێبەشکرانی لەمافی چارەنووس و بەهرەمەند بوونی لە مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی -وەك نەتەوەکانی دنیا-دا، بەرجەستە بووە، لەوکاتەوە سەری هەڵداو دەستی پێکرد، کە ڕێککەوتننامەی (سایکس ـ بیکۆ) لەساڵی (١٩١٦)دا و، لەنێوان هەرکام لە ڕووسیای قەیصەریی و فەرەنساو بەریتانیادا مۆرکرا، کە دەرەنجامەکەی: دابەشکردنی جیهانی ئیسلامیی ـ لەنێویشی دا نیشتمانی کورد ـ بوو بۆچەند دەوڵەتۆکەیەك، چونکە کوردستان کرایە پێنج پارچە و، هەرپارچەی لکێنرا بەیەکێك لەم پێنج دەوڵەتەوە: (تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا و یەکیەتی سۆفیەتی پێشوو).

ئنجا هەرلەو کاتەوە، نەتەوەی کورد لەهەرکام لەپێنج پارچە دابەشکراوەکەی کوردستاندا، هەڵسا بەهەوڵ و تەقەڵلای جۆراوجۆر، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی مافە ڕەوایەکانی و گەیشتنی بەئاستی نەتەوە ئیسلامییەکانی دیکە، لەوەدەستهێنانی مافی چارەنووسی و، ژیانێکی ئازادانەو بەحورمەت لەسەر زەمینی خۆی.

ئێستا ژمارەی نەتەوەی کورد ـ لانی کەم ـ دەگاتە سی و پێنج ملیۆن (٣٥،٠٠٠،٠٠٠)کەس، هەرچەندە سەرژمێرێکی فەرمی لەبەردەست دا نیە.

**ئنجا ئێستا کێشەی کورد لەوپەڕی ئاڵۆزیی دایە، ئەویش لەبەر زۆر هۆکاران، گرنگترینیان:**

**١-** پەیڕەویی کرانی سیاسەتی ستەم و پەراوێزخستن لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە، کە بەشەکانی کوردستانی پارچە پارچەکراویان پێوە لکێنراون و، بەکارهێنانی لۆژیکی هێز، لەجیاتی لۆژیکی وتووێژ و تێگەیشتن.

www.alibapir.com



**٢-** جێبەجێکرانی سیاسەتی دووفلیقانەیی ( إزدواجية ) لەلایەن زلهێزان و ڕێکخراوە وابەستەکانیانەوە و، پابەند نەبوون بە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییە گرێدراوەکانەوە، وەك: (جاڕنامەی جیهانیی بۆمافەکانی مرۆڤ) کە کۆمەڵگەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان (الجمعية العامة للأمم المتحدة) لە: (١٩٤٨/١٢/١٠ز) دا، دانی پێدا هێنا، کەماددەی یەکەمی دەڵێ: سەرجەم مرۆڤەکان بەئازادیی لەدایك دەبن و، لەڕێز و مافەکاندا یەکسانن...

**٣-** نەبوونی یەك گوتاریی و یەکهەڵوێستیی و یەکخستنی هەوڵەکان لەنێوان لایەنە کوردییە خەباتگێڕەکان دا.

**ڕێگای چـارەسـەر:**

پێم وایە چارەسەری کێشەی کورد و کۆتایی پێهێنانی مەینەتیی و ئێش و ژانەکانی و، ڕاگرتنی خوێنڕێژی لەنێوان خۆی و نەتەوە مسوڵمانە دراوسێیەکانی دا، لەمەی خوارێ دا بەرجەستە دەبێ:

یەکەم: پرەنسیپە تیۆرییەکان.

دووەم: هەنگاوە کردەییەکان.

**یەکەم: پرەنسیپە تیۆرییەکان (مبادیء نظرية):**

**١-** مرۆڤ وەك مرۆڤ سەر بەهەر نەتەوەیەك بێ، لەلای خوا بەحورمەت و ڕێزلێگیراوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴾ الاسراء: ٧٠.

واتە: بەدڵنیاییی ڕێزمان لە ڕۆڵەکانی ئادەم گرتوە..

ئنجا ئاشکراشە کە ڕۆڵە بەڕێزەکانی ئادەم پێویستە لەسەرجەم ئەو ماف و ئازادییانە بەهرەمەند بن کە ڕێز و حورمەتیان پەکی لەسەریان کەوتوە و، لەنێویشیان دا بەهرەمەند بوونیان لەمافی بڕیار دانی چارەنووس (حق تقرير المصير) لەبازنەی نەتەوەکانیاندا.

www.alibapir.com



**٢ـ** بەشەر هەموویان لەوەچەی خێزان(أسره)ێکن و ڕۆڵەی باب و دایکێکن، کە (ئادەم و حەووا)ن سەلامی خوایان لێ بێ، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ... ﴾ (الحجرات ١٣)

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە هەمووتانمان لە نێر مێیەك وەدیهێناوە...

کەواتە: لەڕووی ڕیشەی ڕەچەڵەکەوە، پێکەوە یەکسانن.

**٣ـ** دابەش بوونی بەشەر بۆ چەند نەتەوە هۆزێکی جۆراوجۆر، بەویستی کارزانانەی خوا بووەو، حیکمەتەکەشی: پێك ئاشنابوونءپێکەوە هاوکاریی کردنیانە، وەك خوای زانا بەتوانا فەرموویەتی:

(...وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ...) ئنجا درەوشاوەشە کە: ئەو ئاشنایەتیی و هاوکارییەی خوای بەرز فەرمانی پێکردوون، بەبێ بەهرەمەند بوونی تێکڕای نەتەوەکان لە مافە ڕەوایەکانییان و، لەپێشیانەوەش مافی بڕیاردانی چارەنووس، مەیسەر نابێ.

**٤ـ** هیچ کام لە تاکەکانی بەشەر و هۆز و نەتەوەکانیان لەهیچیان لەلای خوای بەرزو بەڕێزتر نین، بەڵکو لەبناغەدا یەکسانن، پاشان بەئەندازەی پارێزکاریی و پابەندییەك بەشەریعەتەوە، کە خۆیانیان پێ دەڕازێننەوە، بەرزیی و نزمییان دەکەوێتە نێوان، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

(...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ...) واتە: بەدڵنیایی ئەوکەسەتان لەلای ڕێزدارترە کە پارێزگارترە.

**کـەواتـە:**

ڕێگا لەبەردەم هەرکەسێکدا بەستراوە، کەلافی پایە و ئیمتیازی زیاد بەسەر ئەوانی دیکەدا لێ دەدات، چ لەسەر ئاستی تاکەکان و بنەماڵەکان، چ هۆز و نەتەوەکان، پێغەمبەری هەرەمەزنی خوا و ڕەوانەکراوی کۆتاییش لەو بارەوە

www.alibapir.com



فەرموویەتی: (أنتم بنو آدم وآدم من تراب، ليدعن رجال فخرهم بأقوام إنما هم فحم من فحم جهنم، أو ليكونن أهون على الله من الجعلان التي تدفع بأنفها النتن). رواه أورد أبو داود السجستاني رحمه الله تعالى: [باباً في التفاخر بالأحساب].

کەپێشتر تەرجەمەمان کردوە.

٥ـ دادگەریی (عَدْل) ئەو ئامانجە مەزنەیە، کە خوا لەپێناوی دا تێکڕای پێغەمبەران و ڕەوانەکراوانی خۆی عليهم السلام ناردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ..﴾ الحديد: ٢٥.

واتە: بەدڵنیایی تێکڕای پێغەمبەرانی خۆمانمان بەبەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵك دادگەریی بەڕێوەبەرن...

هەڵبەتە تەنیا کاتێکیش خەڵك دەتوانێت دادگەریی لەنێوخۆیان دابچەسپێنن، کەلەهەموو بوارەکانی ژیان دا لەماف و ئەرکەکان دا یەکسان بن، دادگەرییش بناغەی ئاشتیی و تەباییە لەکۆمەڵگادا، وەك چۆن ستم و دەستدرێژیی، هۆکاری ئاژاوە و ئاڵۆزیین، تەنیا بەدادگەرییش وڵات جێی هەمووانی تێدا دەبێتەوە.

٦ـ ستەم ماف پێشێلکردن و زێدەڕۆیی بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، تەنیا لەسەر حیسابی ستەملێکراوان و بەشخوراوان و نەداران دەبن، هەربۆیەش خوای دادگەر قەدەغەی کردوون، وەك فەرموویەتی:

ا ـ ﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هود:١٨. واتە: نەفرینی خوا لەستەمکاران.

هەروەها فەرموویەتی:

ب ـ ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ الشعراء: ١٨٣.

www.alibapir.com



واتە: لەشتەکانی خەڵکیدا مەشکێنن و بەکەمیان مەگرن و، هەوڵی خراپەکاریی لەزەویدا مەدەن.

ج- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ١٥١ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ١٥٢ ﴾ الشعراء: ١٥٢،١٥١.

واتە: هەروەها بەقسەی زێدەڕۆییکاران مەکەن، ئەوانەی هەر تێکدان و خراپەکاریی لەزەوی دادەکەن و چاکسازیی ناکەن.

د- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ٢٣ ﴾ النحل: ٢٣.

واتە: بەدڵنیاییی ئەو (خوا) خۆ بەزلگرانی خۆشناوێن.

هەربۆیەش شەریعەتی خوا ڕێی کوفری داوە، بەڵام ڕێی ستەمی نەداوە، وەك خوای بەرز فەرمویەتی:

﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ الكهف: ٢٩.

واتە: ئنجا کێ حەزدەکات بابڕوابهێنێ و، کێش حەزدەکات با بێبڕوابێ.

بەڵام بەنسبەت دادگەرییەوە فەرموویەتی:

﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾ المائدة: ٢.

واتە: با ڕقلێبوونەوەتان بۆ کۆمەڵێك، پەلکێشتان نەکات کە دادگەریی نەکەن، دادگەریی بکەن ئەوە لەپارێزکارییەوە نزیکترە.

بەڵێ دادگەریی لەهەموو حاڵان دا و لەگەڵ هەمووکەسدا فەرمانی پێکراوە و، ستەمیش لەهەموو حاڵان دا و لەگەڵ هەمووکەس ڕێی لێگیراوە.

www.alibapir.com



ئاشكراشە كەستەمكردن لەكۆمەڵێك، زۆر خراپتر و بەزەڕترە لەستەمكردن لەتاكێك، ئنجا چەوساندنەوەی نەتەوەیەك و بێبەشكردنی لەمافەڕەوایەكانی، ستەمێكی مەزنە و چەندان جۆرە ستەم لەخۆیدا كۆدەكاتەوە.

٧ـ بەدڵنیاییی هێمنیی و ئاشتیی نەتەوەكانی ئەم ناوچەیە هەندێكی بەهەندێكەوە پەیوەستە.

وەك بەرچاوە ئەزموونیش كراوە، بۆیە لەسەر هەمووولایەك پێویستە كەبۆ هێمنی و ئاشتی هەمووان تێبكۆشین، نەك هەركەسە تەنیا لەبیری خۆی دابێت،چونكە هیچ كەس بەبێ خزم و نزیك و دراوسێیەكانی، ئاشتیی هێمنیی نابینێ!

٨ـ ئەم ڕۆژگارە چاخی گەل و نەتەوە بندەست و چەوسێنراوەكانە و، ئەم ڕۆژگارە ـ بەڕای بەندە ـ كاتی هاتنەدی فەرمایشت و بەڵێنی خوای بەرزە:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝٥ ﴾ القصص: ٥.

واتە: ئێمە دەمانەوێ چاكە لەگەڵ ئەوانەدا بكەین كە لەزەمین دا بێهێز و بندەست كراون و، بیانكەینە پێشەوا (حكومڕان) و بیانكەینە میراتگری ستەمكاران.

ویستی خواش بەسەرخستنی چەوسێنراوان، یاسایەكە لەیاسا بەردەوامەكانی خوا لەژیانی كۆمەڵ و نەتەوەكان دا، لەكاتی هاتنەدی هۆكار و هەل و مەرجەكانیاندا.

٩ـ بەدڵنیاییی: ئەوباجە(چریبە)ی دەوڵەت نەتەوە چەوسێنەرەكان، بەهۆی چەوساندنەوەی نەتەوە بندەستەكانەوە، دەیدەن، زۆر لەوباجە زیاترە كە كەبەهۆی پێدانی مافەكانەوە، دەیدەن و، پێدانی مافەكانیش ـ بەخەڵكی خۆیان ـ باج نیە، بەڵكو دەسكەوتێكی مەزنە لە دنیاو دوارۆژدا.

١٠ـ پێویستە لە هەمووولایەكەوە دان بەهەڵەدابهێنرێت، دان بەهەڵەداهێنانیش گەورەیی و ئازایەتییە و، سەرەتای ڕاستكردنەوەی ڕێڕەو (مسار).

www.alibapir.com



ئنجا ئەم واقیعەی تێیدا دەگوزەرێنین، تەنیا دەرهاویشتەی ئەوهەڵانەیە کەخۆمان بەرانبەر یەکدی کردوومانن، چ لەسەر ئاستی پێکەوە ژیانی ئاشتییانە و برایانەی نەتەوەکان، یان پێکهاتەکانی کۆمەڵگا بەگشتیی و، شۆڕش و ڕاپەڕینە عەرەبییەکانیش تەنیا کاردانەوەی سروشتیی و لۆژیکیی ستەم و هەڵە کەڵکەبووەکانی ساڵان، بەڵکو سەدە ڕابردووەکانن، لە فەرموودەشدا هاتوە:

(إذا أحبَّ الله عبداً: زهَّدَهُ في الدنيا وأَبصرهُ بعيوب نفسِهِ)، أخرجه البيهقي في (شعب الإيمان).

واتە: هەرکات خوا بەندەیەکی خۆشویست: دنیا بەکەم گری دەکات و، کەم و کوڕییەکانی خۆی پێشان دەدات.

دیارە هەتا کەم و کوڕیی و هەڵەکانیشمان نەبینین و، دانیان پێدانەهێنین، بۆ لێدەربازبوون و چارەسەرکردنیان تێناکۆشین.

کەواتە:

ئەمانە دە (١٠) پرەنسیپ و بنەمابوون، کە پێویستە بەجیددیی تەبەنییان بکەین، پاشان بۆچارەسەری کێشەی کورد بەرەو قۆناغی دووەم بچین کەبریتیە لە:

**دووەم: هەنگاوە کردەییەکان (الخطوات العملية):**

دوای قەناعەت پێهێنانی فیکریی و دەروونیی تەواو، بەوپرەنسیپ و بنەمایانەی باسکران و هەزم کردنیان، ئنجا نۆرەی هەنگاوە کردەییەکانە، کە بەبڕوای من گرنگترینیان ئەم پێنجەن:

**١ـ هەبوونی بوێریی و ئازایەتیی و دووربینیی، لەسەر ئاستی بڕیار بەدەستان:**

**یەك:** بۆ دەرچوون لە بۆتە و قاوغە نەتەوەیی و تائیفیی و حیزبیی و ئایدۆلۆژییە تەسکەکان و، چوونە نێو فەزای فراوانی ئیسلامیی و ئینسانیی فراوانی گشتگیر بۆهەمووان، وەك جێبەجێکردنی فەرمانی خوا:

www.alibapir.com



﴿... وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾﴾ الحج: ٧٧.

واتە: هەروەها چاکە بکەن بەڵکوسەرفرازبن.

**دوو:** بۆ هێنانەدی ئیمانی ڕاستەقینە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) متفق عليه، واتە: یەکێك لەئێوە بەئیماندار تەواو دانانرێ، تاکو ئەوەی خۆی حەزی لێ دەکات، بۆ برایەکەیشی حەزی لێ نەکات.

هەڵبەتە وێڕای برایەتیی ئیمانیی: برایەتی نەتەوەیی و نیشتمانیی و، پاشان برایەتیی ئینسانییش هەیە.

**٢ـ کردنەوەی لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ تێکرای داخوازییکارانی مافەکانیان دا ـ لێرەدا بەتایبەت گەلی کوردمان مەبەستە ـ.**

بەمەبەستی بەفیڕۆنەدانی سامان و هەوڵ و خوێن و بۆ پاراستنی ناوبانگ و دەستەبەرکردنی ئایندەیەکی گەش و یەکڕیزیی، بەرانبەر چاوتێبڕینی ئەو تەماعکارانەی لەئاوی لێڵ دا ڕاوێ دەکەن و لێمان لەبۆسەدان، ئەمیش وەك جێبەجێکردنی فەرمانی خوا:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ..﴾ المائدة: ١٠٥.

واتە: ئەی بڕوادارینە! وریای خۆتان بن! ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستگرتووبن، ئەوانەی گومڕان زەفەرتان پێ نابەن و زیانتان لێ نادەن.

www.alibapir.com



**٣ـ لەیەكدی نزیك كەوتنەوەی هەندێكمان لەهەندێكمان، لەسەر هەموو ئاستەكان و، بەكارهێنانی نەرم و نیانیی و بەزەیی و میهرەبانیی و چاوپۆشیی.**

وەك خوای كاربەجێ فەرمانی پێكردووین:

**أ ـ** ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾ المائدة: ٢، واتە: لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی پێكەوە هاوكاربن.

**ب ـ** ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ.. ﴾ آل عمران: ١٥٩ـ واتە: بەهۆی بەزەیی خواوە، بۆیان نەرم بووی.

**ج ـ** ﴿ .. رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ .. ﴾ الفتح ـ٢٩ـ واتە: (ئەوانەی لەخزمەت پێغەمبەری خوادان) پێكەوە بەبەزەیین.

**د ـ** پێغەمبەری بەرەحمەت نێردراویش فەرموویەتی: (إن الله رفيق يحب الرفق..) متفق عليه، واتە: بەدڵنیایی خوامیهرەبانە و میهرەبانییشی خۆش دەوێ.

ئەگەرنا - مادام بەوجۆرە نەكەین كەخوا فەرمانی پێكردووین ـ جێگرەوە (بديل)ەكەی، پەنابردنە بەهێزی دەرەكیی و، پەیوەستبوونە بەسیاسەت و ئامانجەكانییەوە و، سووڕانەوەیە لەسووڕگەكەی دا!

ئەمەش هەموولایەك تێیدا یەكسانن: دەوڵەتەكان و بزووتنەوە و لایەنەكان، وەك لەواقیع دا دیارە، ئەگەر ئەوەی پەروەردگارم لوگفی لەگەڵ نواندبێ، كەزۆر كەمن!

www.alibapir.com



**٤ـ پەند وەرگرتنی بزووتنەوەی ڕزگارییخوازیی گەلی کورد، لەئەزموونە تاڵەکانی مێژوو و، دووبارە نەکردنەوەی ئەوهەڵانەی کەبەهۆیانەوە باجی زۆر گرانمان داون!**

مەبەستیشم لێرەدا ئەوەیەکە گەلی کورد:

کێشە دادگەرانەکەی خۆی بەسیاسەتە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکانەوە نەبەستێتەوەو نەبێتە پارسەنگ لەهاوکێشە نێودەولەتی و هەرێمییەکان دا:

**أ**ـ وەك كاتی خۆی لەکۆماری کوردستان (مهاباد) دا ڕوویدا، لەساڵی (**١٩٤٦**ز) دا، کە چارەنووسی خۆی بەسیاسەتی یەکیەتی سۆڤییەتەوە گرێدا.

**ب** ـ هەروەها شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی (**١٩٦١**ز) و گرێدانی چارەنووسی خۆی بە سیاسەتی شای ئێرانی گۆڕبەگۆڕ و، لەپشتیشەوە بەئەمریکاوە.

چونکە لەهەردووکیاندا، کێشەی کورد لەلایەن ئەودەوڵەتانەی پێیانەوە پەیوەست بوون، وەك كارتی فشار بەکارهێنرا بۆسەپاندنی چەند ئەجندایەکی سیاسیی و دەستکەوتێك بۆیان.

ئنجا لەم بوارەدا پێویستە بزووتنەوەکانی ڕزگارییخوازی کورد، دوو هەنگاوان بنێن:

**یەکەم:** گەڕانەوە بۆڕەسەنایەتیی ئیسلامیی لەڕووی فیکری و سیاسی و ئاکارییەوە و، خۆدەربازکردن لە دووانەتیی (إزدواجية) لەمامەڵەکردن لەگەڵ نەتەوەی کوردی مسوڵمان داو، وابەستەیی فیکریی بۆ ئیدۆلۆژییە خوازراوەکان.

**دووەم:** هەوڵدانی جیددیی بۆیەکخستنی وزە توانایەکان و، لێکتێگەیشتن و تەبایی و هاوکاریی لەسەر ئاستی تێکڕای ڕێکخراو و حیزبەسیاسیەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان و، کۆتایی پێهێنانی حاڵەتی پەرتەوازەیی و یەکدی بوغزاندن و لێك دابڕان، کەلەڕابردوودا خراپترین شوێنەواری هەبووە، لەسەرخەباتی ڕزگارییخوازیی گەلی کورد.

هیچ گومانیشی تێدانیە کەگەڕانەوە بۆڕەسەنایەتی ئیسلامیی ڕێخۆشکەری تەبایی و هاوکاریی یەکڕیزیی دەبێ.

www.alibapir.com



٥- وەبیرخۆهێنانەوەی ئەوڕاستییەکە:

ژیانی دنیا تاقیگایە و، دنیا لەگۆڕان دایە، ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە، هیچ حاڵێك وەك خۆی نامێنێ و، هەرڕاستی دەچەسپێ و، هەق دەمێنێ، بەڵام ناهەق دەڕوا و سەری بەفەتارەت دەچێ، وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿..فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ الرعد: ١٧.

واتە: کەفوکۆڵ و پووش و پەڵاش بەسووکەڵەیی دەڕوات، بەڵام ئەوەی سوود بەخەڵکی دەگەیەنێ، لەزەویدا دەمێنێتەوە..

ئنجا کاتی ئەوەش هاتوە کە نەتەوەی کورد لەمەینەتیی و ئێش و ژانەکانی قوتاری بێ و، بەئامانجە شەرعییەکانی بگات و، ئاواتە ڕەوایەکانی - وەك سەرجەم نەتەوەکانی دنیا- بهێنێتەدی.

هەروەها لەسەر هەرکەسێك کە ئیمان ویژدانی هەیە پێویستە: بەپێی توانا یارمەتی نەتەوەی کوردی ستەم دیدە بدات - هەروەها هەرگەلێکی دیکەی ستەمدیدە - بۆ وەدەستهێنانتی مافەکانی و، سەرەنجام: لەلیستی کردەوەکانی دا، لەوبوارەدا، هەڵوێستێکی شەرەفەتمەندانە بۆخۆی تۆماربکات.

ئنجا ئەونەتەوە کوردەی ڕۆژێك لەڕۆژان فەرماندەیەکی وەك: (سەڵاحەددینی ئەییوبیی) وەدیهێناوە، لەلای خوای باڵادەست قورس نیە، کە ئەو ڕۆڵەی بۆبگێڕێتەوە، چونکە نەتەوەیەکی دێرینە لە مسوڵمانەتیی تێکۆشان و دڵسۆزیی دا بۆئیسلام و مسوڵمانان، هەرکەسێك بن و لەهەرکوێیەك بن.

عەلی باپیر

ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان/عێراق

٢ ذوالحجة ١٤٣٣ك ٢٠١٢/١٢/١٨ز

www.alibapir.com



## ٤- پەیامێك بۆ كوردانی باكوور بەبۆنەی یادی نەورۆزەوە

- بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە -

بەبۆنەی یادو بیرەوەریی ڕۆژی نەورۆزو ساڵی نوێی كوردییەوە، لە ناخی دڵمەوە پیرۆزبایی لە گەلی كوردو گەلانی دەوروبەر دەكەم و، لە خوای بەبەزەیی و باڵادەست دەپاڕێمەوە، كە گەلە ستەمدیدەكەمان، هەرچی زیاتر بەرەو یەكڕیزیی و تەبایی بچێت و، هەموو ئەو كۆسپ و تەگەرانەی كە دەبنە مایەی ناتەبایی نێوخۆی، نەیانهێڵێ و تەختیان بكات.

بەڕێزان!

**یەك:** ئەگەر سەرنجێك بدەینە مێژووی خۆمان، دەبینین هەر دەستكەوتێك كە بۆمان وەدی هاتوە، لە سایەی یەكڕیزیی و تەبایی بووە، ناكۆكیی و ناتەبایی، هەمیشە بووەتە هۆی زیانمان و زەفەر پێبردنی نەیارانمان.

**دوو:** ئیمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان پێمان وایە، كە كاتی ئەوە هاتوە ئەو ستەمە مێژووییەی كە لە گەلی كورد كراوە كە بێبەشكرانیەتی لەو مافە سرووشتیانەی لەم فەرموودەیەی خوای پەروەردگاردا:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ﴾ (الحجرات ١٣).

www.alibapir.com


داکۆکییان لەسەر کراوە، کۆتایی پێبێ، چونکە هەموو خاوەن ویژدانێك دەزانێ کە گەلی ئێمەش وەك تەواوی گەلانی دیکە، خاوەنی تایبەتمەندیەتییەکانی خۆیەتی، کەچی لەسەر نەخشەی سیاسیی دنیا، هیچ ناو ونیشانێکی نیە!.

**سێ:** بێگومان پاراستنی ناسنامەی ئیسلامیی نەتەوەی کورد، هەوێن و بناغەی تەبایی و یەکڕیزییمانەو، ئەوە بە ئەزموون سەلمێنراوە، بۆیە بۆ پاراستنی بوون و بەرژەوەندییەکانی گەلەکەمان، پێویستە هەمیشە ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین.

**چوار:** ئێمە دانوستانی ئاشتیی ئەم دواییەی نێوان گەلی کوردو کۆماری تورکیا، زۆر بەگرنگ دەزانین و، بەپێویستی دەزانین کە گەلەکەمان بە هەڵوێستی یەکڕیزیی و یەکدەنگیی لەبەرانبەر دەستانی تێکدەردا بوەستێتەوە.

**پێنج:** ئومێدەوارم لە خوای مەزن کە نەورۆزەکانی داهاتوو: لە سایەی ئاشتیی و دادگەریی و سەقامگیرترو دەستکەوتی زیاتردا، بەڕێ بکەین.

سڵاو و ڕێزو خۆشەویستییم بۆ هەمووتان

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

عەلی باپیر

ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

٢٠١٤/٠٣/٢١

www.alibapir.com


## ٥- سەرەتا با هێمن بینەوە،
## پاشان بیر لەچارەسەر بکەینەوە !

بەپێویستی دەزانم هەڵوێست و بیرورای خۆم، لەبارەی ئەو حاڵەتەوە، کە بەشێکی زۆری هەرێمی کوردستانی گرتۆتەوە، لەچەند خاڵێکدا بخەمەڕوو، بەڵکو جۆرێك لەبەرچاوڕوونیی تێدابێ، بۆ چارەسەر:

**یەکەم:** ئەو تەقینەوەیەی تووڕەیی و بێزاریی خەڵك بەڕووی لایەنە سیاسییەکان و دەستەڵاتدا بەگشتیی "هەرکەسە بەپێی خۆی" شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، بەهۆی گەلێك هۆکاری پێشتردەوە، بێ مووچەیی و بێکاریی و بێزاریی و... هتدی ئێستاوە، بەتایبەتیش پاش گەیشتن بەجۆرێك لەبنبەست و نائومێدیی، لەرێککەوتنی لایەنە سیاسییەکان، لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکان.

**دووەم:** بۆیە پێویستە هەموولایەك واقیعەکەمان وەك خۆی بخوێنینەوە، بەهۆی بەدگومانیی و، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای یەکدی کردن و، هەڵەو کەم و کوڕیی خۆ نەدیتنەوە، دووچاری تێڕوانین و هەڵوێست نواندنی هەڵە نەبین.

**سێیەم:** ڕەخنەگرتنی خەڵك و هاوولاتییان و بێزاریی و ناڕەزایی دەربڕینیان، بەهەر شێوازێکی شیاو و شارستانییانە، مافێکی ڕەوای خۆیانەو، پێویستە بەدڵفراوانیی و بارقووڵیی وەربگیرێ و، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی تووڕەو بێزار، تۆمەتبار نەکرێ.

**چوارەم:** بەڵام بێگومان خاوەن هەقیش، پێویستە بەشێوەیەکی هەق و ڕاست، داوای هەقی خۆی بکات و، بەهۆی بەکارهێنانی شێوازی ناڕاست و هەڵەوە،وەك

www.alibapir.com



هەڵکوتانە سەر بنکەو بارەگا حیزبییەکانو، داموو دەزگا حکوومییەکانو، بەردباران کردنو سووتاندنیانو تاڵانکردنیان، خاوەن هەق، هەقەکەی خۆی ناشیرین نەکاتو، گومان لەسەر خۆی دروست نەکات.

**پێنجەم:** بەرەوای نازانم: بەردبارانکردنی خۆپیشاندەران بۆ بنکەو بارەگاکان بەگوللە بارانکردنیانو کوشتنو بریندارکردنیان، وەڵام بدرێتەوە، چونکە پێگەو بەهای مرۆڤ لە هەموو شتێك بەرزترەو، بەردبارانیش خراپە، بەڵام گوللە باران خراپترەو، خاوەنەکەی قەرزار دەکاتەوە.

**پێویستــە چی بکرێ؟!**

**یەکەم:** هەمووولایەك بوێرانەو بەڕوونیی دان بەهەڵەو کەم و کوڕییەکانماندا بنێین و، هەق بەخەڵك بدەین کە تووڕەو نیگەرانن و، چیدیکە نکووڵیی لەواقیعێك نەکەین، کە دەچێتە چاوی هەمووولایەکمانەوە!

**دووەم:** دەستبەجێ زەمینەیەکی باش بۆ کۆبوونەوەیەکی لووتکەی پێنج لایەنە سیاسییەکە بڕەخسێنرێ و، هەمووولایەك لەبڕیارە کۆنکرێتییە پێشووەکان دابەزنو، کەشو هەوایەکی لەبار بۆ چاکسازییەکی ڕیشەیی سازبکرێ، هەر لە چاککردنی سیستمی حوکمڕانییەوە بگرە، هەتا بەدامەزراوەکردنی کارەکان و، یاسا سەروەرکردن و، چەسپاندنی دادگەریی‌و، ڕێگرتن لە گەندەڵیی زیاترو، پاشان ڕیشەکێش کردنی ئەوەش کەهەیە...

**سێیەم:** حکوومەت لەسەر ئاستی باڵای‌و بەجیددیی بێتە سەرخەت و، ڕاجیایی‌و کێشمەکێشی سیاسیی حیزبەکان، وای لێنەکەن کە ئەرکو کارەکانی خۆی لەبیر بکات، بەتایبەت پێدانی مووچە و، دابینکردنی پێداویستییە سەرەکیی و سەرەتاییەکانی ژیان و گوزەرانی خەڵك، بەبێ جیاوازیی.

**چوارەم:** هەمووولایەك: خەڵك، لایەنە سیاسییەکان، حوکمڕان و بڕیار بەدەستان، دڵنیابین کە:

www.alibapir.com



١- بنیاتنان و چاکسازیی بەزەحمەتەو، تواناو هیممەتی هەموولایەکی پێویستە، بەڵام تێکدان ئاسانە و بە هەندێکیش دەکرێ.

٢- ئاشتیی کۆمەڵایەتیی و سەقامگیریی سیاسیی، پێشەکیی و پێشمەرجەی هەر گۆڕانکاریی و چاکسازییەکەو، هەرگیز لەبارودۆخی ئاڵۆزو بلۆزو گرژدا، ناگونجێ هەنگاو بەرەو پاکسازیی و چاکسازیی بنرێ.

**پێنجەم:** ئومێدم وایە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بەهەموو جۆرەکانیانەوە: زۆر هۆشیارانەو دووربینانە مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکەدا بکەن و، خۆیان لەهەر شتێك بپارێزن، کە مایەی زیاتر ئاڵۆزکردنی ڕەوشەکەبێ.

**لەکۆتاییدا:** بەهیوای ئەوەی بەر لەوەی بارودۆخی هەرێمەکەمان گرژترو ئاڵۆزتر بێ‌و، چارەسەرو چاکسازیی قورستر بێ، هەموولایەکمان بەئەرکی سەرشانمان هەڵسین، نابێ لەبیریشمان بچێ کە ناحەزانی هەرێمەکەمان خۆیان مەڵاس داوەو چاوەڕێی دەرفەت دەکەن.

عەلی باپیر / هەولێر

٢٧ /١٢/ ١٤٣٦ ك

٢٠١٥/١٠/١١ ز

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردي - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٦- چارەسەری قەیرانی نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان

{ دەقی وتارەکەی بەندە لە پانێڵی (٢٠١٥/١١/٥ز دا)، کە لەلایەن پەیمانگایەکەی (د. دلاوەر)ەوە سازکرابوو }.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لەسەرەتادا زۆر سوپاسی ئینیستیتیوتی[1] ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و برای بەڕێزو خۆشەویستمان کاك د. دلاوەر عەلائەددین دەکەم، بۆ ساز کردنی ئەم کۆبوونەوەیە، کە ساڵانە دەیکا، بە حەقیقەت جێی ڕێزو پێزانین و دەستخۆشییە، ئەوانەی مشوور دەخۆن لە چارەسەری کێشەکان، بەبێ لایەنانەو بابەتییانە، کەمن، کە پێم وایە کاك دکتۆر یەکێکە لەوانە.

بەڕێـــزان!

ئێمە لە هەل و مەرجێکداین، تا بڵێی هەستیارو دژوارە، چ بە لەبەر چاو گرتنی بارودۆخی نێو خۆمان، چ بەلەبەر چاو گرتنی بارودۆخی دەرەوەی خۆمان، چ لەسەر ئاستی ناوچەکە، چ لەسەر ئاستی دنیاش، بۆیە جێی خۆیەتی هەموو

---

(١) ئینیستیوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ توێژینەوە (ئاڵوگۆڕکردنی ڕوانگەکان بۆ ئاییندەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست).

www.alibapir.com



لایەك زۆر حیساب بۆ قسەمان بكەین و بەرپرسیارانە لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا مامەڵە بكەین، منیش وام بڕیار داوە، ماوەیەكە لە ڕاگەیاندندا قسەم نەبووە، لەبەر ئەوەی بارودۆخەكەم بە گونجاو نەزانیوە، گوتوومە بەهەر بارێكدا قسە بكرێ، ڕەنگە باش نیشانە نەپێكێ، بەڵام، كە برای بەڕێزمان دكتۆر دلاوەر بانگهێشتی كردین بۆ ئەم پانێڵە، بۆ قسە كردن لەبارەی قەیرانە نێوخۆیی و دەرەكییەكانی هەرێمی كوردستانەوە، چۆن چارەسەریان بكەین؟ پێم خۆش بوو، بەتایبەتییش، كە هەر پێنج لایەنە سەرەكییەكە، نوێنەریان لێرەدا هەن، كەوەك كاك دكتۆر گوتی: ئومێدم وایە بگەینە نەخشە ڕێگایەك و بەرچاو ڕوونییەكی باش، بۆ ئەوەی بۆ داهاتوومان هەنگاو بنێین.

**من لە سێ تەوەردا قسە دەكەم:**

## تەوەرەی یەكەم: ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو:

نەك بەو واتایەی كای كۆن بەبا بكەین و برینان بكولێنینەوە، بەڵكو دەبێ تەماشایەكی ڕابردوومان بكەین، بۆ ئەوەی هاندەرمان بێ بۆ چاككردنی واقیعی ئێستامان و بەرچاوڕوونیی بۆ داهاتوومان، ئێمە، ئەم قەوارە سیاسییەی هەرێمی كوردستانەمان، كە بۆ چارەگە سەدەیەك دەچێ لەسەر پێی خۆی وەستاوە، بە ئاسانیی بۆمان بەرهەم نەهاتوە، ئەوە هیچ كە بەرهەمی خەباتێكی دوورودرێژی باشووری كوردستانە، كە پێم وایە ئەو خوێن و خەباتەی خەڵكی باشووری كوردستان خەرجی كردوە، زۆر بە زیادەوە بەشی دەوڵەتێكیشی دەكرد، نەك بەشی هەرێمێك، كەواتە: ئەم هەرێمە خەرجییەكی زۆری تێچووە، تاكو گەیشتۆتە ئێستا.

پاشان ئێمە ئەگەر بمانەوێ و ئیرادەمان هەبێ میللەتێكی دەستەپاچەو بێ ئیرادە نین و عەقڵیشمان باش ئیش دەكاو دەتوانین خۆمان لە قەیران و كێشەكان دەرباز بكەین، ئێمە لە ڕابردوودا كۆمەڵێك دەستكەوتی وامان دێنە بەرچاو، كە جێی شانازییمانن:

www.alibapir.com



١- ئەم قەوارە سیاسییەمان لە مێژووی هاوچەرخی کورددا، بێ وێنەیە، کە قەوارەیەکی کوردستانیی، بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك لەسەر پێی خۆی بوەستێ، ئەوە دەستکەوتێکی گەورەیە.

٢- پاشان ئێمە کاتی خۆی کێشەو ناکۆکیی و دووبەرەکییمان هەبوون، بەڵام توانیمان بەسەریاندا زاڵ بین، هەڵبەتە بە هاوکاریی دۆستانی دڵسۆزیش، توانیمان ئەو برینانە قەتماغە بکەین و، چاوپۆشیی لە ڕابردوو بکەین و، لاپەڕەی سپی لەگەڵ یەکدا هەڵدەینەوە.

٣- ئنجا ئێمە توانیمان چەند دامەزراوەیەك دروست بکەین، بەڵێ، کرچ و کاڵیی و ساواییان پێوە دیارە، بەڵام توانیمان کە پەرلەمانێکمان هەبێ، حکوومەتێکمان هەبێ، پەرلەمان بە چەند خولەوە، حکومەت بەچەند کابینەوە، پاشان دەسەڵاتی دادوەریی و سەرۆکایەتیی هەرێم.

٤- ئێمە متمانەیەکی باشی نێودەوڵەتیی و هەرێمییمان بۆخۆمان بەدەست هێناوە، کە شتێکی کەم نیە.

٥- پاشان ئێمە توانیومانە سەقامگیریی سیاسیی بەرقەرار بکەین و گەشەیەکی ئابووریی باش لە کوردستاندا ڕوویداوە، بەبەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی عێراقدا.

٦- هەروەها توانیمان بەرگریی لە کوردستان بکەین، هەڵبەتە بە هاوکاریی ئەوانەش، کە پشتگیرییان لێکردین، لەبەرامبەر شەڕی داسەپاوی تیرۆریستانی داعشدا.

کەواتە: ئێمە کاتێ ئاوڕ لە ڕابردوومان دەدەینەوە، هێندە خاڵی گەش دەبینین، کە ئومێدەوارمان بکەن و قەناعەتمان پێ بێنن، کە ئێستاش دەتوانین بەسەر کێشەکانماندا زاڵ بین.

www.alibapir.com



تەوەری دووەم: قەیرانی ئێستامان:

هەڵبەتە، دەبێ بە ڕوونیی قسە بکەین و، پەنجە لەسەر کەم و کوڕییەکان دابنێین، قەیرانی ئێستامان دەرهاویشتەی کەم و کوڕییەکانی ڕابردوومانە، کە ئەگەر بە وردیی دەست نیشانیان بکەین، دەبێ بڵێین: کەم و کوڕییەکانی ڕابردوومان هەرچەندە زۆرن، بەڵام دەتوانین بڵێین: لە دوو شتدا کورت دەبنەوە:

یەکەم: کرچ و کاڵیی دامەزراوەکانمان:

١- ئێمە پەرلەمانمان هەبووە، بەڵام نەمانهێشتوە پەرلەمانێکی ڕاستەقینەو شوێنی دەرکردنی بڕیارو یاسا بێ و، چاودێرێکی بێمنەت بێ، بەسەر حکوومەت و کارەکانییەوە.

٢- لایەنە سیاسییە بڕیار بەدەستەکان، نەیانهێشتوە حکوومەتەکەمان، حکوومەتێکی دەستکراوە بێ و، حکوومەتی هەموو لایەك بێت و، دادگەریی بچەسپێنێت و قۆرخکاریی تێدا نەبێ.

٣- پاشان دەسەڵاتی دادوەریی، خۆتان دەبینن لە چ وەزعێکدایە! زۆر شت دەکرێ و دەگوزەرێ، دەسەڵاتی دادوەریی لە بەرانبەریدا هیچ کارە نیە، لەبەر ئەوەی خۆمان نەمانهێشتوە، لەگەڵ ڕێزمدا بۆ دادوەرە بەڕێزەکان.

دووەم: ناتەبایی سیاسیی:

بەڵێ، سەقامگیریی سیاسییمان هەبووە، بەڵام زۆر ڕیشەدارو قووڵ نەبووە، هەر مودارامان لەگەڵ یەکدا کردوە، بۆ نموونە: نەمانتوانیوە بڕیارێکی کۆنکرێتی بدەین کە دەبێ پاراستنی هێمنیی کۆمەڵایەتیی و ئاشتیی کۆمەڵایەتیی، خەتی سوور بێ و هیچ کەس تەجاوزی نەکات، کێشەو ململانێی سیاسیی، قاڵبێکی سەربازیی لەخۆی نەگرێ.

www.alibapir.com



## تەوەری سێیەم: چارەسەر:

هەڵبەتە من لێرەدا باس لە قەیرانە نێوخۆییەکان دەکەم، قەیرانە دەرەکییەکان زۆرن، شەڕی داعش، کێشەی نەوت لەگەڵ بەغدا، کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکان و.. هتد، بەڵام من پێم وایە، ئەگەر بۆخۆمان ببین و لەنێو خۆدا ڕێك بین، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾ المائدة: ١٠٥.

واتە: ئەی بڕوادارینە! ئاگاتان لەخۆتان بێ و وریای خۆتان بن! ئەگەر خۆتان ڕێگای ڕاست بگرن، ئەوەی کە گومڕایەو ناحەزتانە، زیانتان پێ ناگەیەنێ.

زۆر جاران گوتوومە: ئێمە هەمیشە لە درزو کەلێنەکانی خۆمانەوە، دوژمنان و ناحەزانمان زەفەریان پێ بردووین و، بەپێی مەنتیقی قورئانیش، دەبێ هەمیشە گلەیی لەخۆمان بکەین بەر لەوەی ڕووی ڕەخنە لە خەڵکی دیکە بکەین[١]، چونکە بەتەئکید ئەوەی، کە ناحەزتە، غەیری خراپە هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێ، بەڵام بۆخۆت، دەبێ دڵسۆزی خۆت بی، ئنجا ئەگەر لەنێو خۆماندا تەباو ڕێك بین، بەتەئکید حەصانەو مەناعەی ئەوەمان دەبێ، کە دوژمنانمان زەفەرمان پێ نەبەن.

ئنجا من پێم وایە چارەسەری ئەو قەیرانەی، کە ئێستا هاتۆتە دی لەنێوخۆدا، کە شڵەژانێکی باشی بۆ هەموو لایەك هێناوەتە دی، کە بە حەقیقەت دەبێ بەزەییمان بەخەڵکی خۆماندا بێتەوە: ئێمە هەژارەکانمان هەژار تربوون، دەوڵەمەندەکانیشمان بەشێکی زۆریان هەژار کەوتوون، پڕۆژەکانمان ڕاوەستاون[٢]، خەڵك بێ کارو کەسابەتە، گەنجەکان سەری خۆیان هەڵدەگرن و بەرەو هەندەران

---

(١) وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الشورى. واتە: هەر بەڵایەکتان بەسەر دێ، بەهۆی کردەی دەستی خۆتانەوەیەو، لە زۆریش دەتانبوورێ و سزاتان نادات.

(٢) بەرپرسێکی شارەزا قسەی لەشەش هەزار (٦٠٠٠) پڕۆژەی پەکخراو (معطل) دەکرد!

www.alibapir.com



دەڕۆن، ئەگەر باسی ئێش و ژان و موعاناتەکان بکەین زۆر زۆرن، ئەوانە دەبێ هاندەرمان بن، کە بە جیددیی بیر لە چارەسەریان بکەینەوەو، نابێ لێیان گەڕێین، چونکە گرفت و کێشە، وەك تۆپەڵە بەفر وایە، کە خلۆری دەکەیەوە، ئەگەر لێی گەڕێی، تاکو بڕوا گەورەتر دەبێ، کێشەش دەبێ زوو بەدەمیەوە بچی، ئنجا من پێم وایە بە سێ قۆناغ، دەتوانین ئەم کێشەو قەیرانەی ئێستامان چارەسەر بکەین:

**قۆناغی یەکەم:** ئاسایی کردنەوەی بارو دۆخەکە:

وەك کاك دکتۆریش باسی کرد، بەر لە هەموو شتێك ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە، کە ئەویش لە کۆنترۆڵ کردنی ڕاگەیاندنەوە، دەست پێدەکات، زۆرم پێ ناخۆشە لە ڕاگەیاندنەکاندا، چ ڕاگەیاندنی حیزبیی، چ ڕاگەیاندنی لا بەلای حیزبیی، کە کۆمەڵێك کەناڵی ڕاگەیاندن هەن، بە پارەی حەڕام و سامانی خەڵك کاردەکەن و بەڕێوە دەبرێن، ئیشیان بریتییە لە تەشهیر پێکردن و ناو زڕاندنی خەڵك و، سووکایەتیی کردن بە ڕەمزەکانی ئەم وڵاتەو، بە بەرپرسانی ئەم وڵاتە، ئنجا ڕەنگە ئەو لایەنەی پشتگیریی ڕاگەیاندنێك دەکا، کە قسە بەبەرامبەرەکەی دەڵێ، نەزانێ بۆ خۆشی پێی سووك دەبێ!! خەڵك دەڵێ: ئەو بەرپرسەی تۆ هێندە قسەی پێ دەڵێی، کە خاوەنی چل پەنجا ساڵ خەباتە، ئەگەر ئەو خراپ بێ، تۆش هەر وەك وی وای، ئەدی بەیەکەوە نەبوون و ڕەفیق نەبوون؟! بە ڕاستیی ئەوە شتێکی زۆر خراپە، کە ئێمە دەستمان داوەتێ، بۆیە ئەگەر بمانەوێ بارودۆخەکە ئاسایی بکەینەوە، دەبێ ڕاگەیاندنەکان کۆنترۆڵ بکەین.

**قۆناغی دووەم:** بە یاسایی کردنەوە، پاش ئاسایی کردنەوە:

بەیاسایی کردن یانی: با پابەند بین بە یاسا و عورفی سیاسیی خۆمان لەماوەی (٢٥) ساڵی ڕابردوودا، وڵاتی خۆمان پێ بەڕێوە بردوە.

**قۆناغی سێیەم:** کۆبوونەوە لە کەش و هەوایەکی ئارامدا:

با لە جەوێکی هێمن و ئارامدا، کۆ ببینەوەو بەیەکەوە گفت و گۆی دڵسۆزانە بکەین، بۆ ئەوەی چارەسەر بۆ کێشەکانمان دیاریی بکەین.

www.alibapir.com



**پێنج بنەمای گرنگ و، پێنج هەنگاوی کردەیی،**
**بۆ چارەسەریی قەیرانی نێوخۆی هەرێم :**

**پێنج بنەمایەکان:**

من پێنج بنەمای گرنگم بۆ چارەسەری قەیرانی هەرێم، لەبەرچاو گرتوون:

**بنەمای یەکەم:**

با هەموو لایەکمان کەم و کوڕییەکانی خۆمان ببینین و، دانیشیان پێدا بهێنین:

لە سوننەتدا هاتوە پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" فەرموویەتی: {إذا أحب الله عبداً، زهَّده في الدنيا و بصرَّه بعيوب نفسه}، أخرجه البيهقي في (شعب الإيمان)، واتە: هەرکات خوا بەندەیەکی خۆشویست، دنیا بەکەمگری دەکات و نا تەواوییەکانی خۆی، پێشان دەدات، هەتا عەیبی خۆمان نەبینین و دانیشی پێدا نەهێنین، بۆمان چاك ناکرێ، گوتراوە: {فهم السؤال نصف الجواب} بەڵێ: با کەم و کوڕییەکانی خۆمان ببینین، با هیچمان پێمان وانەبێ، لەسەرووی ڕەخنەوەین، بەخوا هەموومان کەم و کوڕییمان هەن، ئەدی ئەم واقیعە کردەی دەستی ئێمە نیە؟، وەك پەندە عەرەبییەکە دەڵێ: {يداك أوكتا، وفوك نفخ} بەدەستی خۆت گرێت داوە، بە زاری خۆت فووت تێکردوە، ئەم پەندە لەبەسەرهاتێکەوە گوتراوە:

کابرایەك تەماشای کرد، خەڵك بەپارە دەپەڕنەوە لە ڕووبار، گوتی: ئنجا چ مەجبوورم بە پارە بپەڕمەوە، مەشکەیەك، چووپێکی هێنا بەزاری خۆی فووی تێکردو، بە دەستی خۆی بەستی و، خۆی هاویشتە سەرێ، تاکو بپەڕێتەوە، لەنێوەندی ڕووباردا، چووپ بوو، یان مەشکە بوو، هەواکەی لێ دەرچووو، کەوتە پەلەقاژەی مەرگ، هاواری دەکرد: دەربازم بکەن! پێیان دەگوت: {يداك أوكتا، وفوك نفخ} بەدەستی خۆت گرێت داوەو، بەزاری خۆت فووت تێکردوە، ئەم واقیعەش، ئێمە نابێ هیچ کاممان شانی لەبەر دەربهێنین، بڵێ خەتای من نیە،

www.alibapir.com



بەڵکو کێ زیاتر بەرپرسیارە، زیاتر خەتابارە، کەواتە: با بوێرانە دان بە هەموو کەم و کورییەکانی خۆماندا بهێنین، (الإعتراف بالخطأ فضيلة)، چونکە ناکرێ ئێمە هەڵەمان نەبێت و، ئەم واقیعەشمان ئاوابێ !!.

**بنەمای دووەم:**

با چاودێرییکردنی خوا بەسەر خۆمانەوە ببینین:

بەڕێزان! ئێمە میللەتێکی مسوڵمانین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق.

واتە: هەرکەس پارێز لە خوا بکات، دەرووی خێری لێ دەکاتەوە.

با جارجار بیر لە خواو، لە قیامەت و، لە مێژوو بکەینەوە، ئێمە خاوەنمان هەیەو بەس خۆمان نین.

**بنەمای سێیەم:**

ئێمە میللەتێکی مسوڵمانین و خاوەنی عەقیدەو کلتوورێکی مسوڵمانەتیین:

لە ئیسلام و قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت و بەهای زۆر گەورە گەورە هەن، کە دەتوانین سوودیان لێ ببینین، یەکێ لەوانە بریتییە لەوە کە وڵات بە دادگەریی بەڕێوە دەچێ و فەراح دەبێ و بە زوڵم، ئینسان ماڵی خۆشی لێ وەتەنگ دێ، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَـٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص.

واتە: ئاوەدانییەکان لەبەین نابەین، مەگەر خەڵکەکەیان زاڵم بێ، ئێمە بە زوڵم وڵاتەکەمان لێ وەتەنگ دێ، وە بە دادگەری وڵاتەکەمان فەراح دەبێ.

www.alibapir.com



**بنەمای چوارەم:**

دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەم وڵاتە پێویستیی بە هەموومانە و کەسی لێ زیاد نیە، وە هیچ کاممان بەتەنێ بەش ناکەین، بۆ خزمەتی ئەم وڵاتە:

بەڵێ ئەوەتا بەهەمووشمان نەمانتوانیوە وەڵامگۆی داخوازییەکانی خەڵك بین، چ جا لایەنێك یان دوو لایەن!.

**بنەمای پێنجەم:**

ئێمە دەبێ بڕیارێکی کۆنکرێتییمان هەبێ کە نەهێڵین: ململانێ سیاسییەکان سەربکێشن بۆ چارەسەری ئەمنیی و بیرکردنەوەی سەربازیی و زەخت و فشار لەیەکدی کردن:

ئەمە بەهیچ جۆرێك و بەهیچ پاساوێك ناگونجێ، ئێمە لەیەك وڵاتداین و وەك سواربووانی کەشتییەك واین، ئەو کەشتییە لە هەر شوێنێکیەوە کونی تێ ببێ، ئێمە هەموومان غەرق دەبین، ئەوە بە نیسبەت ئەو بنەمایانەوە، کە بە پێویستم زانی بیانخەمە ڕوو.

**پێنج هەنگاوە کردەییەکان:**

پێنج هەنگاوی کردەیی، کە پێویستە بنرێن بە خێرایی باسیان دەکەم:

**یەکەم: گێڕانەوەی حورمەت و شکۆ بۆ هەرێمەکەمان و قەوارە سیاسییەکەمان:**

لەم ڕۆژانەدا بەرپرسێکی یەکێ لە وڵاتە ئەورووپییەکان هات بۆلام، گوتی: پار ئەم کاتە شکۆی ئەو هەرێمەی ئێوە لە ئێستا زۆر گەورەتر بوو، ئێستا بچووك بوونەتەوە، گوتی: پێم عەجیبە! تەماشا دەکەم: کورد کە دژایەتیی یەکدی دەکا، زۆر بە توندیی دژایەتیی یەکدی دەکاو خەتی سوورتان نیە، هەروەها گوتی: ئێوە حورمەتێکی چاکتان هەیە، بەڵام بە دەستی خۆتان لە دەستی دەدەن، ئێستا بۆتان نیە گلەیی لە کەسی دیکە بکەن.

www.alibapir.com



قسەكانی جوان بوون و دڵسۆزانە هاتنە بەرچاوم، بۆیە من پێم وایە: دەبێ بەخێرایی ئەو زەرەرەی گەیاندوومانە بە هەرێمەكەمان، قەرەبووی بكەینەوە، ئەویش بەچی؟ ئەو بڕیارانەی لە ئەنجامی هەڵچوون و كاردانەوەوە داومانن، هەموویان هەڵبوەشێنینەوەو بێینەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆمان و بڕیارە كاردانەوەكان، بە لەغو دابنێین.

**دووەم: پێكهێنانی دەستەیەكی باڵا بۆ چارەسەرێكی خێرای كێشە هەنووكەییەكان:**

بەڵێ دەبێ لە هەر شوێنێك بنكەو بارەگای حیزبێك، یان دەزگایەكی ڕاگەیاندن، زیانی پێ گەیەنراوە، دەستەیەكی باڵا لە حیزبەكان پێك بێت، بچن سەردانی بكەن و، جۆرێك لە شكۆو حورمەتی بۆ بگێڕنەوە.

**سێیەم: بە زووترین كات سەرۆكی پەرلەمان و وەزیرەكان بگەڕێنەوە بۆ كاری ئاسایی خۆیان:**

كەسێك كە خۆی زیاتر بە بەرپرسیار دەزانێ لەم وڵاتە، دەبێ دڵی گەورەتر بێ و لێبوردەیی زیاتر بێ و عەقڵی گەورەتر بێ، لە حەقیقەتدا كێ زیاتری لەلا بێ و زیاتری هەبێ، زیاتری لێ چاوەڕێ دەكرێ.

**چوارەم: دەست پێكردنەوەی كۆبوونەوەكان بەبێ وەخراندن، بەڵام بەگیانی یەكدی قوبووڵكردن و بە ڕووحی دابەزین بۆ یەكدی:**

بەخوا بە ڕێزان! ئەگەر بۆ یەكدی دانەبەزین، دەبێ بۆ خەڵكی دیكە دابەزین، من زۆرجار گوتوومە: لەنێو خۆماندا بەوەندە ئیكتیفا دەكەین، سەلام لە یەكدی بكەین، بەڵام غەیری خۆمان دەڵێ: دەبێ دەستیشم ماچ بكەی! ئنجا من بۆ نەچم بۆ لای برایەكەی خۆم و دەستی نەگوشم.

www.alibapir.com



**پێنجەم: دوای ئەوەی بارودۆخەکە ئاسایی و یاسایی دەکرێتەوە، ئنجا وەگەڕ خستنی ئیرادەیەکی جیددیی بۆ چارەسەرێکی ڕیشەیی:**

کە ئەم وڵاتە بەدامەزراوە بکەین، یاسای تێدا سەروەر بێ، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی هێندە سەقامگیرو کۆنکرێتیی بێ، هیچ کەس و لایەنێك بیر لەوە نەکاتەوە زیانی پێ بگەیەنێ.

با ئەم وڵاتە بەشێوەیەك بێ کە خەڵك و میللەتەکەمان دڵی پێ خۆش بێ و ئومێدەوار بێ و خۆڕاگر بێ، ئەگەر بەبیرتان بێ لە سەرەتای نەوەدەکاندا، بارودۆخی ئابووریی زۆر لە ئێستا خراپتر بوو، بەڵام خەڵك بۆچی سەبری لەگەڵ دەگرتین؟ تەماشای بەرپرسەکانی دەکرد، تەماشای وڵاتەکەی دەکرد، دەیبینی هەمووومان ئاستمان لەیەك نزیکە، بەڵام بەداخەوە ئێستا لە ئەنجامی ئەوەدا کە قۆرخکاریی و دزیی و گەندەڵیی هەیە، کابرا تەماشا دەکا خۆی زۆر مەحرڕوومە، بەڵام بەرپرسان و کاربەدەستان بە جۆرێکی دیکە دەبینێ، هەڵبەتە هەموویان نا، بۆیە پێویستە ئێمە دوای ئەوەی، کە ئەم بارودۆخە ئاسایی و یاسایی دەکەینەوە، کۆببینەوەو بە جیددیی بیر لە چارەسەر بکەینەوە، هیچ کەسیش چاوی لەوە نەبێ، کە دەبێ هەر لایەنەکان بۆلای وی بێن، هەموو دەبێ بۆ لای یەکدی بێین و، خاڵە هاوبەشەکان لەبەینی خۆماندا دابنێین لە بازنەیەکداو، هەموومان هەموومان بۆیەك دابەزین و لەیەك نزیك بین.

ئومێدم وایە بەو شێوەیە بکەین، ئنجا من یەك لەباری خۆشم وەك دڵسۆزێکی هەموو لایەك، لەیەك مەسافەدا وەستاوم و، کۆمەڵی ئیسلامیی، کە من بەرپرسییم، لەیەك مەسافەدا وەستاوە، بەرامبەر بە هەموو لایەك، بەڵام تۆ جاری وا هەیە هەندێ قەناعەتت هەیە، لەو لا نزیکترە، یان لەم لا، ئنجا ئێمە ئامادەشین هەمزەی وەصڵ بین و پردی بەیەك گەیشتن بین، وەك هەوڵیشمان داوە لە ڕابردوودا، کە هەوێنێك بین بۆ تەبایی، بەکردەوە، نەك بەقسە، ئێستاش لەخزمەتی هەموو لایەك داین بۆ ئەوەی ئەو قەیرانەی لەگەڵیدا دەستەو یەخەین،

www.alibapir.com



ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە، تێبپەڕێنین و خوا یاربێ تێشیدەپەڕێنین، من گەشبینم ئەگەر تەماشای ڕابردووی خۆمان بکەین، بەسەر گرفتی زۆر گەورەتردا زاڵ بووین، ئەمە هەر هیچ نیە لەچاو ئەوەی ڕابردوو، لە ڕابردوودا خوێنی زۆر لە بەینێدا هەبووە، خوا پشتیوان بێ بەسەر ئەو گرفتانەدا زاڵ دەبین و خوای پەروەردگار لەخۆمان ڕازی دەکەین و، خەڵك و میللەتەکەشمان ئاسوودە دەکەین.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

٢٠١٥/١١/٥ز

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٧- نەك هەر ڕیفراندۆم، لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەوڵەتیشداین بەڵام پاش زەمینەسازیی

پاش سەردانەکەی دوێنێ (٢٠١٦/١/٣١)ی شاندێکی یەکیەتی ئەورووپا بۆلای ئێمەو، قسەکردنمان بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و، وەتیشك خستنە سەر یەکێك لەقسەکانی شاندەکە کە: (یەکیەتی ئەورووپا لەم هەلو مەرجەدا لەگەڵ ڕیفراندۆمدا نیە لەهەرێمی کوردستاندا).

هەندێك لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی چەواشەکارانە، ئەو مەسەلەیان زەق کردۆتەوەو ویستوویانە خەڵکو جەماوەری کوردستان وا تێبگەیەنن: کە ئێمە لەگەڵ ڕیفراندۆمو دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستاندانین!

بۆیە لەوبارەوە دەڵێم:

**یەك:** بەندە (عەلی باپیر) سی و دوو (٣٢) ساڵ لەمەوبەر "لە: (١٩٨٤)دا" لە کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی)داو، لەبەر تیشکی ئایەتی (١٣)ی (الحجرات)دا:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات ١٣).

گوتوومە: کە گەلی کوردیش وەك سەرجەم گەلانی دنیا، مافی ڕەوای خۆیەتی کە قەوارەی سیاسیی و دەوڵەتی خۆی هەبێ، وەك چۆن: عەرەبستان و تورکمانستان و ئەفغانستان و هیندستان و...هتد هەن، کوردستانیش هەیە!

www.alibapir.com



وەك كۆمەڵی ئیسلامییش، دوو ساڵ لەمەوبەر پرۆژەیەكمان بڵاوكردەوە، وەك نەخشە رێگا بۆ سەربەخۆیی كوردستان و ئیعلان كردنی دەوڵەت و، لە كۆنگرەیەكی رۆژنامەوانییدا لە هەولێر لە: (٢٠١٤/٤/٦) رامانگەیاند!

**دوو:** ئەوەش كە گوتراوە گوایە: شاندەكە ئەو قسەیان لەلای پارتیی و یەكگرتوو نەكردوە، من نازانم لەوێ چییان گوتوە! بەڵام لەلای ئێمە ئەو قسەیان كردو، دووبارەشیان كردەوە و، ئێستاش ئەو هەشت كەسەی شاندەكە ماون، ئێمەش جگە لەخۆم، پێنج ئەندامی سەركردایەتیی ئامادەبوون.

**سێ:** وەك بەشاندەكەم گوت و چەندان جاریش گوتوومانەو دووپاتی دەكەینەوە: گەلی كورد ستەمێكی بێرەزای مێژوویی لێكراوە، كە لەسەر نەخشەی سیاسیی سڕاوەتەوەو، رێی نەدراوە قەوارەی سیاسیی سەربەخۆی هەبێ و، نیشتیمانەكەی وەك گۆشتی خێرێ "لەلایەن زلهێزانی ئیمزاكەری پەیمانی شوومی (سایكس بیكۆ)وە" لەساڵی (١٩١٦ز)دا بەسەر چوار پێنج دەوڵەتدا دابەشكراوە، بەڵام بێگومان بۆ راگەیاندنی دەوڵەتی كوردستان، چ لەهەرێمی كوردستان، لەباشووری كوردستاندا، چ لەهەر بەشێكی دیكەی كوردستاندا، پێویستیی بە زەمینەسازیی "نێوخۆیی و دەرەكیی" هەیە، تاكو بەمەرەدی كۆماری كوردستان (مهاباد)ی، تەمەن یازدە مانگ نەچێ!

لەوتاری داهاتووشدا، باسێكی ئەو زەمینە سازییە دەكەین.

عەلی باپیر / هەولێر

١٤٣٧/٤/٢٢ك

٢٠١٦/٢/١ز

www.alibapir.com



## ٨- هەنگاوەکانی زەمینەسازیی بۆ دەوڵەتی کوردستان

هەرکارێك بەجیددیی بویسترێ ئەنجام بدرێ، پاشان سەروبەر بگرێ، پێویستە پێشتر زەمینەی بۆ خۆش بکرێو رێی بۆ هەموار بکرێ.

راگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورستانیش لەهەرێمی کوردستان "هەروەها لەهەر بەشێکی دیکەی کوردستانی بەشکراودا" بەرای بەندە، پێویستە بەم هەنگاوانە زەمینەی بۆ خۆشبکرێ:

### یەکەم: لەنێوخۆدا:

**یەك:** هێنانەدی رێککەوتن و تەبایی سیاسیی، سەرەنجام یەك گوتاریی سیاسیی لەنێوان لایەنە سیاسییەکاندا.

**دوو:** هەبوونی سیستمێکی حوکمرانیی راستو تەندروستی، یاسا تێدا سەروەری، چەسپاندنی دادگەریی بەئامانج گری، دوور لەهەیمەنەی حیزب و گرووپ و کەسەکان.

**سێ:** بەدامەزراوەکردنی کارەکان: ئابووریی و دارایی، هێزی پێشمەرگە، پۆلیس، ئاساییش، دەزگا هەواڵگرییەکان، پەیوەندییە سیاسیی و دیبلۆماسییەکان، بەجۆرێك کە هێندە بەهێزو پێزو پتەوبن، مۆرکی نیشتیمانیی بوون وەربگرن و، لەدەست تێوەردانی لاوەکیی حیزبو باندو گرووپ و کەسەکان دوور بخرێنەوە،

www.alibapir.com



مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هاووڵاتییاندا بکەن، بەبێ تێخوێندنەوەی ئینتیمای سیاسیی و حیزبیی و...هتد.

**چــوار:** گێڕانەوەی هەیبەتو شکۆ بۆ هەرکام لە:

١- دەستەڵاتی یاسادانان.

٢- دەستەڵاتی دادوەریی.

٣- دەستەڵاتی جێبەجێکردن.

ئنجا کاراکردنەوەیان و لابردنی کۆسپ و ئاستەنگەکانی بەردەمیان، کە پەکیان خستوون، چونکە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆ، پرۆسەیەکی نیشتیمانییە و، بەرپرسیارێتی ئەو دامەزراوە نیشتیمانیانەیە کە نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکن و خاوەنی ڕەوایەتیی سیاسیی و دەستەڵاتی یاساییین.

هەڵبتە ئەو چوار هەنگاوەی ڕابردن، وێڕای پێویست بوونیان بۆ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردستان، بۆ بەڕێوەبردنیشی هەر مەرج و پێویستن.

**پێــنج:** پێکهێنانی دەستەیەکی پسپۆڕی بواری سیاسەتو یاسای نێودەوڵەتیی، بۆ بەدەستەوەگرتنی ئەو دۆسیەیە، کە جێی متمانەی لایەنە سیاسییەکانو خەڵکو جەماوەربن بەگشتیی، بۆ تاووتوێ کردنی ئەو بابەتە لەهەموو ڕووێکەوە، چونکە بێگومان ئەو بابەتە هی هیچ کەسو حیزبێك نیە بەتایبەت، وەگرنگیش ئەوەیە پاش ئیعلان کردنی دەوڵەت، بتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێو بەردەوام بێ.

لەبیریشمان نەچێ کە (یاسر عەرەفات) لەساڵی (١٩٨٨ز)دوە ئیعلانی دەوڵەتی فەلەستینی کردوە، بەڵام چونکە زەمینە سازیی بۆ نەکرابوو هەر ئیعلان بوو!

www.alibapir.com



دووەم: لەدەرەوەی خۆمان:

هەرچەندە ئەسڵ و بناغەی ئیعلانی دەوڵەت خۆمانین و، ئێمەش وەك هەموو گەلانی دنیا مافی خۆمانە دەوڵەتی سەربەخۆمان هەبێ و، لەڕاستییدا ئەگەر زەمینەسازیی نێوخۆیی بکەین (بەو پێنج هەنگاوەی باسمان کردن) خودی ئەو زەمینە سازییە نێوخۆییە، دەبێتە دەستەبەرکەری پشتیوانییو هاوکاریی دەرەکییش، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتییو ناوچەیی، چونکە کاتێك پەیکەری دەستەڵات خاوەنی ڕەوایەتیی تەواوبێ، بەهۆی: کاری دامەزراوەیی و، یاسا سەروەریی و، چەسپاندنی دادگەرییەوە، سەقامگیریی سیاسیی وەدی دێو، سەقامگیریی سیاسییش سەقامگیریی و گەشەی ئابووریی بەدوای خۆیدا دێنێ و، بەمەش متمانەی دەرەکیی باشتر پەیدا دەبێ.

کەواتە: ئەسڵ خۆمانین و گرنگ زەمینەسازیی نێوخۆییە، خوای بەرز و مەزنیش فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ .. ﴾ المائدة: ١٠٥.

واتە: ئەی بڕوادارینە! وریای خۆتان (خۆتان ڕێكو پێك بکەن) ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست گرتووبن، ناحەزانی گومڕا زیانتان لێ نادەن...

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێموایە، پێویستە لەسەر ئاستی دەرەکییش، ئەم هەنگاوانە بنێین:

**یەك:** پەیداکردنی پشتگیرییەکی نێودەوڵەتیی جیددیی.

**دوو:** گەیشتن بە لێك تێگەیشتن لەگەڵ حکوومەتی نێوەندییدا، بۆ ئەوەی پاش ئیعلانکردنی دەوڵەتی کوردستان، دراوسێیەتییمان باش بێ.

www.alibapir.com



**سێ:** لەنزیکەوە ئاگادارکردنەوە و تێگەیاندنی دەوڵەتانی دراوسێ، بەتایبەت تورکیا، ئێران، سعوودیە، ئوردون و، دڵنیا کردنەوەیان لەوە کە دەوڵەتی کوردستان، هاوسێیەکی دڵسۆزو هاوکاری هەموولایەك دەبێ، لەسەر بناغەی ڕێزو هاوکاریی بەرانبەر.

بەڵێ بەبێ ئەو هەنگاوانەی زەمینەسازیی، ئیعلانی دەوڵەتی کوردستان، شتێکی نەگونجاوە، چونکە ئێمە ئەگەر هەرێمەکەمان بەوجۆرەبێ، کە دەیبینین، دەبێ ئەگەر ئیعلانی دەوڵەت بکەین، چی لێ بێ؟ کە بێگومان فشاری زیاترمان دەکەوێتە سەرو، کێشەو قەیرانی گەورەتر و زۆرترمان بۆ دروست دەبن و، ڕەنگە پەندی: (ڕۆژووی ڕەمەزانی بەحاڵێکی خۆش گرت، نۆرەی شەشەکانە!)مان بەسەردا بچەسپێ.

هەڵبەتە هەرێم و دەوڵەت و سەرجەم کورسیی و پێگەو بەرپرسیارێتییەکانیش، هۆکار و ئامرازن بۆ خزمەتی خەڵك و وڵات و چەسپاندنی دادگەریی لە کۆمەڵگادا و بەختەوەرکردنی و دابینکردنی پێداویستییەکانی، بۆیە پێویستە چ لەبەڕێوەبردنی ئێستای هەرێمداو، چ لەئیعلانی دەوڵەتی کوردستاندا، چاومان لەسەر نێوەڕۆکو ئامانج بێ، چونکە ناوێك نێوەڕۆکی نەبێو، ئامرازێك ئامانج نەهێنێتەدی، خاوەنەکەیان لەسەریان قەرزدارە!

**لەکۆتاییشدا دەڵێم:**

ئەگەر ڕاپرسیی (ڕیفراندۆم) بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەنجام دەدرێ، پێویستە پێشتر بەوهەنگاوانەی باسمان کردن، زەمینەسازیی بۆ بکرێ.

بەڵام ئەگەر تەنیا بۆ گەیاندنی ویستی سەربەخۆیی بێ، ئەوە هەرکات ئەنجام بدرێ، مادام تەبایی‌و ڕێککەوتنی لایەنە سیاسییەکانی لەسەربێ، شتێکی ئاساییەو ئەنجامەکەشی پێشوەخت دیارە، چونکە گەلی کوردستان سەربەخۆیی بەمافێکی ڕەوای خۆی دەزانێ و هەبوونی دەوڵەتی سەربەخۆ، ئاواتێکی لەمێژینەی هەموو تاکێکی کوردستانە و، لە وتاری پێشووشدا باسی هەڵوێستی خۆمانم لەوبارەوە ڕوونکردۆتەوە.

عەلی باپیر / هەولێر

٢٥/ ڕەبیعی دووەم/١٤٣٧ ك - ٢٠١٦/٢/٤ز

www.alibapir.com



**٩- دەقی وتەیەكی بەندە كە بە زمانی عەرەبی لە (ملتقی علماء كوردستان الثاني) لە شاری ئامەد (دیاربەكر) لە باكووری كوردستان لە ٢٠١٦/٣/٢٣ دا لەلایەن (مامۆستا نەوزاد خالید)ەوە پێشكەش كرا .كە ئەمە دەقی تەرجەمەكەیەتی بە زمانی كوردی**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بحمده.
من الصَّحب والأزواج والتابعين لهم بإحسان الى يوم اللقاء.

سەرەتا بەخێرهاتنی ئامادەبووانی بەڕێز دەكەم و بە سڵاوی ئیسلام سڵاو لە هەمووانتان دەكەم:

ئینجا ڕاستەوخۆ دەچمە نێو بابەتەكەوەو دەڵێم :

**یەكەم:** مەینەتی و ئێش و ژانی نەتەوەی كوردی موسڵمان كە بەرجەستەیە لە سڕینەوەی دا وەك نەتەوەیەك - كە خاوەنی قەوارەیەكی سەربەخۆ بێ- لەسەر نەخشەی سیاسی، لەدوای مۆركرانی ڕێككەوتننامە شووم و ستەمكارانەكەی (سایكس - بیكۆ)وە دەستی پێكرد كە لە نێوان هەر كام لە : (بەریتانیا و فەڕەنسا و ڕوسیای قەیصەری)یدا و لە ساڵی (١٩١٦ ز)دا ئیمزا كراو، بەپێی بەندەكانی نیشتیمانی ئیسلامی و - لە نێویشییی دا كوردستان - بۆ چەند پارچەیەك دابەشكراو، لەسەر هەر پارچەیەكیان قەوارەیەكی .....كی بنیاتنرا كە

www.alibapir.com



دواتر پێ ی گوترا (دەوڵەت)! ئەویش لە کوردستان کە هەر کام لە چوار پارچەکانی بەدەوڵەتێك لە چوار دەوڵەتەکانەوە لکێنرا : تورکیا، ئێران، عێراق، سوریا.

**دووەم:** ئینجا ئەم ستەمە مێژووییەی سەر کورد بۆ ماوەی سەد ساڵی ڕابردوو: (١٩١٦ - ٢٠١٦ ز) بەردەوام بوو، وێڕای تێکۆشان و فیداکاری گەورەو بەرچاو کە نەتەوەی کورد لە خەباتی ڕزگاریخوازییەکەی دا و لە هەر چوار بەشەکانی نیشتیمانەکەیدا (باکوور و باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) ئەنجامی دا، بەڵام لە هیچ کام لەو چوار بەشانی نیشتیمانەکەی دا نەیتوانی ماقی تەواوی خۆی وەدەست بهێنێ کە لە بوونە خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی سەربەخۆی خۆدا خۆی دەنوێنێ، جگە گەلی باشووری کوردستان کە لە هەرێمێکی فیدراڵی لە چوارچێوەی عێراقدا بەهرەمەندە.

**سێیەم:** ئینجا تایبەت بە باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا) و دەربازبوون لەو قەیرانە خنکێنەرانەی بەدەستیانەوە گرفتارە، ئەم سێ خاڵەی خوارێ پێشنیاردەکەم :

**یەك:** گەڕانەوەی هەردووك لای ناکۆك (دەوڵەت و پەکەکە) بۆ نەریتی قوڕئان و ڕەسەنایەتی ئیسلامیی و، دەستبەرداربوونی بەرکاهێنانی هێزو پەنابردنە بەر توندو تیژی، چونکە هەر کام لە دوو نەتەوەی کوردو تورك لە نەتەوە دێرین و ڕەسەنەکانی ئیسلامن و، خوای بەخشندەش لە کتێبی هەقی خۆیدا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات ١٣).

کەواتە : نەتەوەکان یەکسان و وەك یەکن، لەبەهرەمەندبوون دا، لە مافی چارەنووسی خۆبڕیاردان، وەك مەبدەئێکی قوڕئانیی.

**دوو:** خۆبەهێز نەکردنی هیچ کام لەو دوولایە بەدەرەوەو، دەست نەکێشانی بۆ دژایەتیی کردنی لایەنی بەرانبەر، چونکە ئەو خێڵە بەدرێژایی چەند دەیەی

www.alibapir.com



ڕابردوو دادی هیچ لایەکی نەداوەو، ئەو ئامڕازە سوودبەخش نەبووە - بگرە زیانی گەورەی بووە - و گوتراویشە: (مَن جَرَّبَ المُجرَّبَ حَلَّتْ به الندامة) هەر کەس ئەزموونکراو ئەزموون بکاتەوە، پەشێمانی دەکێشێ.

**سێ:** جەختکردنەوە لەسەر ئامانجە هاوبەشەکان کە زۆر زۆرن و، گێڕانیان بەپرد .. بۆ پەیوەندی و پەیوەستیی، پاشان شەن و کەوکردنی گیروگرفتەکان لە کەشێکی هێمن دا و بەگیانێکی گەشبینانە و ئەرێنی یانە و، پێویستە بۆ هەموو لایەکیش زانراو بێ کە لە جەنگ و کوشتاری نێوخۆیی دا براوەی تێدا نیە، بەڵکو هەموو لایەك زیانبارن، ئەمەش مێژو و ڕابردوو و هاوچەرخ بۆی ئیسپات کردووین.

لەکۆتاییشدا سەر ڕاستیی و پێکان بۆ هەمووان لەخوای بەرز دەخوازم.

براتان : عەلی باپیر

١٦ محرم ی ١٤٣٨ ك، بەرانبەر ٢٠١٦/٣/١٧ ز .

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١٠- نەتەوەی کورد دەبێ چی بکات،
## تاکو لەواقیعی تاڵ و دژواری دەربازی بێ؟!

دەقی وتاری بەندە لە کۆنگرەی شازدەیەمینی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان لە بروکسل، کە لەلایەن برای بەڕێزم کاك (کوردۆ ئەحمەد) خوێندرایەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بەڕێزان ئامادەبووانی جڤاتی گشتیی شازدەیەمینی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان!
السلام عليكم ورحمة الله

بەپێویستی دەزانم لەم ماوەکورتەدا کە بۆ قسەکردنم دیاریی کراوە، بەشێوەیەکی پوختو گوشراو ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەم:

**یەك:** ئێمە ئەم کۆنگرەیەمان لەهەلو مەرجێکی زۆر سەختو دژواردا گری دەدەین، کە نەتەوەکەمان لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا: باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، پێیدا گوزەر دەکات، وەئەمساڵ سەدەمین ساڵە کە بەسەر پەیمانی شوومی سایکس بیکۆدا ڕەت دەبێ، کە لەساڵی **١٩١٦**زدا بەستراو، نەتەوەی کوردی تێدا لەمافی چارەنووسی خۆ بەدەستبوونی بێبەش کرا.

**دوو:** ئێمە لە {کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان} داو لەبەر ڕۆشنایی فەرمایشتی خوادا:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ ... ﴾ الحجرات -١٣-،

www.alibapir.com



قەناعەتی لەسەدا سەدمان وایە کە کوردیش وەك سەرجەم نەتەوەو گەلانی دیکەی دنیا مافی خۆیەتی کە لە هەموو بەشەکانی کوردستانی کوتو کوتکراو و دابەشکراودا، ئیرادە و ئیدارەی خۆی بەدەست خۆی بێ، بەهەرشێوەیەك کە بۆی دەگونجێ و مەیسەر دەبێ، بەدەوڵەتی سەربەخۆشەوەو، ئەوە مافێکە خوا لەقورئانی بەرزو بەپێزدا، بەسەرجەم نەتەوەکانی داوە، بەیەکسانیی.

**سێ:** بەڵام بێگومان نەتەوەی کوردو خەڵکی کوردستانیش بەگشتیی، هەتا لەهەر بەشێکی کوردستاندا بەتایبەتو، لەهەموو بەشەکانیشیدا بەگشتیی، دەنگ و ڕەنگ و سەنگی خۆی یەکنەخات و خۆی یەکڕیز نەکاتو، بەسەر ناکۆکیی و دووبەرەکیی و ناتەباییەکانی نێوخۆیدا زاڵ نەبێ، ناتوانێ ئەو مافە ڕەواو ڕوون و بێ چەند و چوونەی خۆی، بۆخۆی دەستەبەر بکات.

**چوار:** کاتێکیش دەتوانین بەسەر ناکۆکیی و ناتەباییەکانماندا زاڵ بینو، خۆمان یەکدەنگ و یەکڕەنگ و یەکسەنگ بکەین، کە لەجوغز و قاوغە تەسك و گچکەکانی بنەماڵەو خێڵو هۆزو حیزب بێینە دەرێو، بچینە نێو فەزای فراوانی نیشتیمانو خەڵك و کۆمەڵگاو نەتەوە بەگشتیی و، بەرژەوەندییە گچکەو تەسکە تاکیی و بنەماڵەیی و عەشیرەتیی و حیزبییەکان، بکەینە فیداو قوربانی بەرژەوەندیی گشتییو فراوانی نەتەوەو کۆمەڵگا.

**پێنج:** پێویستە هەمووڵایەکمان: چ کەسایەتییەکان، چ لایەنە سیاسییەکان، چ ڕێکخراوە مەدەنییەکان، خۆشەویستیی و دڵسۆزیی و لێبڕانمان بۆ نەتەوە و کۆمەڵگا و نیشتیمانمان هێندە ساغ و پاك و بەهێز بێ، هیچ ئارەزوو و تەماع و بەرژەوەندییەکی تایبەت نەتوانێ لەبەردەم تەبایی‌و دۆستایەتیی‌و هاوکاریی نێوانماندا ببێتە کۆسپو لەمپەرو، گیرۆدەی لەیەك دابڕانو لەیەك ترازان ببین، کە بێگومان ئەوە مایەی هەموو شکست و نسکۆ و نەهامەتییەکانمان بووە، لەڕابردوودا، ئێستاش هەرئەوە ماك و میکرۆبی دەردو نەخۆشیی و هۆکاری بێ هێزو پێزییمانە، خوای کارزانیش فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ ... ﴾. الأنفال -٤٦-.

www.alibapir.com



**لەکۆتـــاییدا:**

ئومێدەوارم کە هەموولایەکمان بەوردیی سەرنجی مێژووی خەباتی ڕزگارییخوازیی نەتەوەکەمان بدەین‌و، تێوەی ڕامێنین و، دەرس و پەندی لێوەربگرین و، وێڕای موداراکردنی ژیرانە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ و دووردا، وریابین بەهیچ نرخێك‌و لەبەرانبەر هیچ شتێکدا، خەبات و بەرخۆدانی گەلە ستەمدیدەکەمان بەسیاسەت و ئەجێندا و پڕۆژەکانی ئەوانەوە نەبەستینەوە و، نەهێڵین بکەوێتە نێو بازنەی ستراتیژی ئەوانەوە، چونکە بێگومان کارێکی وا، زیانی زل زلی بەدواوەن و مێژووی نیزیکیشمان لەوبارەوە شایەدە.

بەدڵنیاییش ئیمان بەخواو بەڕۆژی دوایی‌و، بەندایەتیی کردن بۆ خوا و، پشت پێ بەستنی و، شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و، خۆ ڕازاندنەوە بەخەسڵەتە بەرز و پەسندەکانی، چاکترین گرەنتیی (ضمانة)ی سەلامەتیی و پارێزرانمانە لەو بارەوە.

دووبارە سڵاو و ڕێزو حورمەتم هەیە بۆ هەموولایەك
والسلام علیکم ورحمة الله

برای دڵسۆزتـــان
عـەلی باپیـر / ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان
١٤٣٧/١٢/٢٩ك
٢٠١٦/٩/٣٠ز

www.alibapir.com



## ١١- یەکڕیزیی تەوژمی ئیسلامیی، دەبێ بۆ ڕازییکردنی خواو خزمەتی خەڵك بێ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئەسڵ لەبوونی مسوڵماناندا بەگشتیی و لەسەر ئاستی جیهان، ئەوەیە کە هەموویان پێکەوە بن و، یەکدەنگ و یەکڕەنگ و یەکسەنگ بن، وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ... ﴾ آل عمران -١٠٢،١٠٣-.

واتە: ئەی بڕوادارینە! وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بکەن و، بە مسوڵمانەتیی نەبێ، مەمرن و، تێکڕاو وێکڕا دەستبەڕێسمانی خواوە بگرن و پەرتەوازە مەبن...

ئنجا ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا کە مسوڵمانان قەوارەیەکی سیاسیی گشتگیرو کۆکەرەوەیان نیە، تاکو هەموویان لەژێر سایەیدا کۆببنەوەو یەکڕیزو تۆکمەبن، مانای وانیە کە تەسلیمی ئەمری واقیع ببن‌و، هیچ هەوڵێك نەدەن، چونکە خوای کارزان فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ... ﴾ التغابن -١٦-.

واتە: ئەوەندەی پێتان دەکرێ، پارێز لەخوا بکەن.

www.alibapir.com



هەروەها پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (وإذا أمرتكم بأمرٍ فأتوا منه ما استطعتم...) متفق علیه، واتە: هەرکات فەرمانم پێکردن بەئەرکێك، ئەوەندەی پێتان دەکرێ، لیێی جێ بەجێ بکەن.

زانایانیش لەسەر ئەوبنچینەیە رێککەوتوون کەدەڵێ: (لایسقط المیسور بالمعسور) یانی: ئەوەی کە ئاسانە، بەهۆی ئەوەوە کە قورس‌و زەحمەتە، لاناچێ.

هەربۆیەش لەسەر مسوڵمانانی هەرشوێنێك فەرزە، کە هەوڵبدەن بەپێی توانایان خۆیان یەکڕیزو یەکسەنگ بکەن‌و، وزەو تواناییەکانیان یەك بخەن.

شایانی باسیشە کە ئیسلامییەکانی کوردستان "هەرکەس بەئەندازەیەك‌و لەقەدەر خۆی" بەردەوام ئەو هەوڵانەیان هەبوون، ئنجا ئەگەر پێشتر ئەو قەناعەتە زیاتر لەلایەکەوە بووە، وادیارە ئەمجارە بۆتە قەناعەتێکی هاوبەش، بەتایبەت لەلایەن سێ لایەنە ئیسلامییەکەوە.

ئنجا لێرەدا بەپێویستی دەزانم، ئاماژەیەکی خێرا بەچەند مەسەلەیەك بکەم:

**یەکەم:** ئیسلامییەکان "هەرکامیان لەخودی خۆیدا" هەتا لەڕووی تێگەیشتنی ڕاست‌و قووڵەوە لەئیسلام و، پابەندیی پێیەوە، ڕەسەنترو مەحکەمتربێ، قەناعەتەکەی بەیەکڕیزیی و کاری هاوبەش و، هەوڵەکەی لەوپێناوەدا، ساغترو بێ خڵتەترو پتەوترو جیددیتر دەبێ.

**دووەم:** یەکڕیزیی‌و کاری هاوبەش و پێکەوەیی ئیسلامیی، گرنگ نێوەڕۆك و جەوهەرەکەیەتی، نەك ناوونیشان و ڕواڵەتەکەی، کە دەگونجێ ناوونیشان و ڕواڵەت، لەشێواز و چۆنیەتی جۆراوجۆردا خۆی بنوێنێ.

**سێیەم:** گرنگترین دوو پایەو بنەڕەتیی هەرکارو پڕۆژەیەکی ئیسلامیی، بریتیین لە: خوا بەیەکگرتن (توحید الله)و، دادگەریی (عدل - قسط)، کە خوای بەرزو مەزن لەهەردووك ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتەکانی: (الأنبياء)و (الحديد) دا، ئەو دووانەی کردوون بەئامانجی نێرانی تێکڕای پێغەمبەرانی خۆی "علیهم الصلاة والسلام".

www.alibapir.com



بێگومانیش بەچەسپاندنی تەنیا خوا پەرستیی، (توحید الله) مرۆڤەکان ئازادو ئازا دەبنو، لەداوی شیرکو کۆیلایەتیی بۆ فیرعەونو گاغووتە خۆپەرستو یاخییەکان دەربازیان دەبێو، بەچەسپاندنی دادگەرییش، هەموو جۆرەکانی ستەمو زۆر لەبوارەکانی: نەتەوەییو سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییدا، ڕیشە کێشدەکرێن.

**چوارەم:** هەربۆیەش کاروپڕۆژەی ئیسلامیی ساغ و ڕەسەن، بەهیچ جۆرێك ناکرێ و نالوێ کە لەڕیزی خەڵکو جەماوەر بەگشتییو، بەتایبەت چینی بەشخوراو و چەوساوەدانەبێ و، لەبەرانبەر کەسانی ستەمکار و خۆسەپێن و گەندەڵ و قۆرخکاری دەستەڵاتو سامان (السلطة والثروة)دا نەوەستێ!

**پێنجەم:** لەم بارودۆخە قەیراناوییەی هەرێمی کوردستانیشدا، کە سیکۆلاریستە باڵادەستو بڕیار بەدەستەکان، لە حوکمڕانییاندا، فەشەلێکی بێڕەزایان هێناوە، خەڵکیان بەتەواویی بێزارو نائومێد کردوە، ئیسلامییەکان ئەرکی سەرشانیانە کە چیدیکەلەم واقیعە ناشەرعییە دژوارەی کۆمەڵگاکەیانەوە ڕانەمێنن و، هەوڵی پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی بدەن، کە ئەوەش بەبێ یەکڕیزیی و کاری هاوبەشیان مەیسەرنابێ!

**شەشەم:** باهیچ کەسیش "هەرلەسەرەتاوە" بەهۆی لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاکردن و، گومانی خراپ پێبردنەوە، لەوهەوڵ و هەنگاوەی ئیسلامییەکان نەکەوێتە تەقەو، مادام دڵسۆزی خەڵك و وڵاتەکەیشی بێ، باترس و بیمی ڕێ نەنیشێ و دڵنیابێ: کە وەك چۆن ئیسلامی بەرجەستە لەقورئان و سوننەتدا بەگشتیی، بۆ خێرو خۆشیی سەرجەم مرۆڤایەتیی هاتوە:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ ...﴾ الزمر -٤١-.

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء -١٠٧.

هەورەها وەك چۆن ئۆممەتی ئیسلام بەگشتیی، بۆ خێر و بەختەوەریی مرۆڤایەتیی ڕەخسێنراوە، نەك تەنیا بۆ خۆی، وەك خوا فەرموویەتیی:

www.alibapir.com



﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ... ﴾ آل عمران -١١٠-.

واتە: ئێوە چاكترین كۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیداكراون، بەهەمان شێوەش ئامانجی گەورە و بنەڕەتیی هەر كۆمەڵ و كاروپرۆژەیەكی ئیسلامیی ڕەسەن، بریتییە لەخزمەتكردنی خەڵك و وڵات بەگشتیی، بەجیاوازیی ڕەنگ و زمان و ئایین و نەتەوە و ئینتیمای حیزبیی و سیاسییانەوە.

عەلی باپیر / هەولێر

١٤٣٨/٤/٦ك

٢٠١٧/١/٤ز

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی ماموستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی ماموستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی ماموستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١٢- ڕیفراندۆم هەقە، بەڵام با بەشێوازێکی هەقیش جێبەجێ بکرێ

خوای کاربەجێ "عز وجل" لەبارەی قورئانەوە فەرموویەتی:

﴿ وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ ﴾ الإسراء -١٠٥-.

واتە: قورئانمان بەهەق ناردوەو، هەقیشی گرتۆتە خۆی،و، تۆشمان تەنیا بە مۆژدەدەرو ترسێنەر ناردوە.

واتە: قورئان هەم لەخودی خۆیدا هەق و ڕاستە و، هەم بەشێواز و چۆنیەتییەکی هەق و ڕاستیش دابەزێنراوە.

بەڵێ ئەوەندە بەس نیە کە خاوەن هەقو مافێکی ڕەوابی، بەڵکو پێویستە "ئەگەر بتەوێ هەقەکەت دەستەبەر بکەی" بەشێوازو ڕێبازێکی ڕێك و ڕاست و ڕەواش داوای بکەی و هەوڵی بۆ بدەی، ئەگەرنا گەلێك جار گرتنەبەری شێوازو ڕێبازی هەڵە و ناڕەوا بۆ دەستخستنی هەق، دەبێتە مایەی دەستەبەر نەبوونی، بگرە دوور لێکەوتنەوەشی!

بەپێویستی دەزانم لەگەرمەی هەراو گاڵەگاڵی ئێستای نێوان لایەنە سیاسییەکان و، دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، لەمەڕ مەسەلەی گشتپرسیی لەهەرێمدا، چەند سەرنجێکی خێرا بخەمەڕوو و سەرەتاش هیوادارم هەموولایەك بابەتییانە و دوور لەپاشخانی فیکریی و سیاسییان لەقسەکانم ڕامێنن:

www.alibapir.com



**یەکەم:** بێگومان وەك دەیان جار گوتوومانەو بەر لەسی و سێ (٣٣) ساڵ (١٩٨٤)ز لەکتێبی: {سۆزی نەتەوایەتیی‌و بیری ناسیۆنالیزم}ی بەنددا هاتوە: نەتەوەی کوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی دیکەی دنیا، مافی ڕەوای خۆیەتی کە خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ، بەدەوڵەتی سەربەخۆشەوە، چ لەهەرێمی کوردستانی عێراق "باشووری کوردستان" و چ لەهەر بەشێکی دیکەی کوردستانی بەش بەشکراودا: باکوور، ڕۆژ هەڵات، ڕۆژئاوا.

**دووەم:** بۆیە ئەنجامانی گشتپرسیی بۆ بەفەرمیی دەربڕینی داواکردنی ئەو مافە ڕەوایە لەلایەن خەڵك و جەماوەری هەرێمی کوردستانەوە، هەقێکی سروشتیی‌و ڕەوایەو، هیچ گرێ‌و گۆڵێکی تێدانیە.

**سێیەم:** بەڵام بێگومان "وەك لەبەرایی ئەو نووسینەدا گوتمان" ئەنجامدانی پرۆسەی گشتپرسیی، ئنجا چ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی بەدوادابێ، چ بەدوایدا نەیەت، پێویستە پاش زەمینە سازیی نێوخۆیی و دەرەکیی و ئامادەکردنی پێشەکییەکان (مقدمات) بێ، چونە هەرکەس بیەوێ ئەنجامێکی دروست وەدەست بێنێ، دەبێ پێشتر پێشەکییە دروستەکان (المقدمات الصحیحة)ی بۆ هەڵبچنێ، تاکو ئەو قسەیەی بەسەردا نەچەسپێ کە دەڵێ:

ترجو النجاة ولم تسلك مسالكها
إن السفينة لاتجـري على اليبس

**چوارەم:** مسۆگەر زەمینە سازیی نێوخۆ لەپێش زەمینەسازیی دەرەکییەوەیەو، بگرە هۆکارێکی گرنگ‌و کاریگەریشیەتی، ئنجا ئەگەر زەمینەسازیی دەرەکیی، پەیوەستە بەویستی غەیری خۆمانەوە، زەمینەسازیی نێوخۆ، لەبەردەستی خۆماندایەو بەویستی خۆمانەوە پەیوەستە.

زەمینەسازیی نێوخۆش بەتەبایی و ئاشتەوایی و ڕێککەوتنی لایەنە سیاسییەکان "بەتایبەت هێزە سەرەکیی و خاوەن پێگە و جەماوەرییەکان" دەست پێدەکات و، بەمیانی گێڕانەوەی شکۆو کاریگەریی بۆ دامەزراوەکاندا "بەتایبەت

www.alibapir.com



پەرلەمان" گوزەر دەکاو، بەگێڕانەوەی متمانەی خەڵكو جەماوەری بێزارو دڕدۆنگ‌و نیگەران، بەرانبەر بەقەوارە سیاسییەکەیان، تەواو دەبێ.

بێگومان هۆکارەکانی تووڕەیی‌و بێزاریی‌وبێ متمانەیی خەڵكو جەماوەری بەشخوراویش، بەرانبەر بە قەوارە سیاسییەکەیان زۆرن، بەڵام لەهەموویان کاریگەرتر بریتین لە:

١- شکاندنی شکۆی دامەزراوەکان.

٢- پێشێلکردنی یاسا، بەتایبەت لەبواری ئەمنیی و ئازادیی بیروڕادا.

٣- ستەم و قۆرخکاریی و گەندەڵیی.

٤- بەملیاردلێردکردنی کەسانێکی کەم، لەسەر حیسابی بژێوی خەڵك و، دروستکردنی ژێرخانی ئابووریی.

**پێنجەم:** بەدڵنیایی هەڵەیە کە هەڵوێستی نەرێنییانەی حکوومەتی نێوەندیی (مرکزی) یان وڵاتانی دراوسێ، یان وڵاتانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، دژ بەڕیفراندۆم، بکەینە بەڵگەی ئەنجام نەدانی! چونکە ئەوە مافێکی ڕەواو سروشتی خۆمانە، بەڵام وێڕای ئەوەش دەبێ بەوردیی حیساب بۆ دەرهاویشتەکانی هەڵوێستی نەرێنیی هەرلایەك بکەینو، بەقسەو هەڵوێستی دڵگەرمانەو سۆزدارانە خۆمان فریو نەدەینو، بەمەردەی ئەو کەسە نەچین کە: {بۆ ڕیش چووبوو سمێڵیشی خستەبانی!} بەتایبەت بۆ ناوچەکانی دەرەوەی بازنەی هەرێم، پێویستە هۆشیاربینو حیسابی وردو دوور بکەین.

**شەشەم:** پێویستە هەرچی زووترە ئەو مۆرکە شەخسیی و حیزبییەی بەهەڵە یان بەئانقەست لەپرۆسەی ڕیفراندۆم دراوە، لێی بکەینەوە، چونکە بەدڵنیایی بابەتێکی نیشتیمانیی گرنگ و چارەنووسسازی وەك ڕیفراندۆم، بەهۆی بەشەخسەنەو بەحیزبیی کردنیەوە، بچووك دەبێتەوەو دەشێوێندرێ و، ئەگەری سەرکەوتن و سەروبەرگرتنیشی زۆر کەم دەبێتەوە.

**حەوتەم:** لەکۆتاییدا دەڵێم:

www.alibapir.com



وەك گوتراوە: (المر و قليل بنفسه كثير بأخيه) مرۆڤ خۆی بەتەنیا کەمە، بەڵام لەگەڵ براکەیدا زۆرە، هیوادارم ئەگەر هەموولایەك بەجیددیی دەمانەوێ بەرەو ئەنجامدان و پاشان سەروبەرگرتنی پرۆسەی ڕیفراندۆم بچین، عەقڵ و دڵی خۆمان لەئاست یەکدیدا فراوان بکەین‌و، گرێ‌و گۆڵی دەروونیی و مێژوویی توڕبدەین و، دڵنیابین کە کارو پڕۆژەی گەورە بەکەسانێك ئەنجام دەدرێ، کە عەقڵ و دڵیان گەورە و فراوان بێ و، لەواقیعدا بژین نەك لەمێژوودا!

هەروەها دڵنیابین کە ڕیفراندۆم، بەبێ زەمینەسازیی نێوخۆ و دەرەکیی، بەتایبەت کۆدەنگیی‌و تەبایی نێوخۆ، یان ئەنجام نادرێ، یان نیوەچڵ دەبێ.

عەلی باپیر / هەولێر

٢٣/شەووال/ ١٤٣٨ك

٢٠١٧/٧/١٧ز

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
PDF
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١٣- کێشەکانی هەرێم
## لەنێوان (بەڵێ) و (نەخێر)دا

لەبارەی مشت و مڕی نێوان بەرەی (بەڵێ) و بەرەی (نەخێر)ی لەمەڕ ڕیفراندۆمەوە، بەپێویستم زانی ئەم پێنج سەرنجە بخەمەڕوو:

**یەکەم:** چەندان جاری دیکەش گوتوومانە: خەڵکی کوردستان وەك هەر گەلێکی دیکەی دنیا، مافێکی ڕەوا و سروشتی خۆیەتی، نەك هەر گشتپرسیی (ڕیفراندۆم) ئەنجام بدات، بەڵکو خاوەنی قەوارەی سیاسیی دڵخواستی خۆی بێ، لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا.

بەڵام بەداخەوە ئەو ڕیفراندۆمەی باس دەکرێ، بەهەر هۆکارێکەوەبێ: ئانقەست، یان هەڵە، ئەنجام بدرێ یان نا، سەروبەر بگرێ، یان نا، خراوەتە قاڵبێکی شەخسیی و حیزبییەوەو، ئەوەش زیانێکی زۆری پێ گەیاندوەو، نیزیکە هەر بەڕێوە لەباربچێ! بۆیەش لەوتارێکی پێشوومدا گوتوومە: با هەرچی زووترە ئەو مۆرکە شەخسیی و حیزبییە، لەڕیفراندۆم بکرێتەوە.

**دووەم:** نابێ هیچ کەس نکوڵیی لەوە بکات کە: نەك هەر کارێکی گەورە و چارەنووسسازی وەك ڕاگەیاندنی دەوڵەت، بگرە هەرکارێکی دیکەش، بەبێ زەمینەسازیی و ڕێ بۆ خۆشکردن، سەروبەر ناگرێ و، یان هەرئەنجام نادرێ، یان بێ ئاکام دەبێ و، تێیدا ڕەنج بەخەسار دەبین، لەمێژووی خۆشماندا، ڕووداوی وامان زۆرن پەندیان لێوەربگرین.

www.alibapir.com



**سێیەم:** لەبارەی (نەخێر) گۆیانیش بۆ ڕیفراندۆمەوە دەڵێم: وەك چۆن (بەڵێ) کردنی ڕەهاو بێ مەرج، حەوت دەرمانەی چارەسەری کێشەکانمان و گۆچانی جادوویی نیە، بەهەمان شێوەش: بە (نەخێر) گوتن، دنیا نابێتە شامی شەریف و، گوناهە خەڵك بەوجۆرە چەواشە بکرێ: کە بە (نەخێر) گوتن بۆ ڕیفراندۆم، کێشە و قەیرانەکانی هەرێم بنبڕ و چارەسەر دەبن و، خەڵك و جەماوەر لەخەم دەرەخسێ!

**چوارەم:** کەواتە: ئەگەر بەجددیی دەمانەوێ بەرەو سەربەخۆیی بچین، با هەرچی زووترە دوور لە نەفەسی مونافەسەی حیزبیی‌و دەمارگیریی و عینادیی و کارو کاردانەوە، بەر لە هەرشتێك تەبایی و لێك تێگەیشتنی سیاسیی بگێڕینەوە نێوخۆمان، بەتایبەت هێزە سیاسییە بنەڕەتییە خاوەن جەماوەرەکانو، لەکەش و هەوایەکی هێمن و ئارامدا پێکەوە کۆبینەوە:

١- سەرەتا بڕیاری گێڕانەوەی شکۆ بۆ پەرلەمان و حکوومەت بدەین و ئاساییان بکەینەوە.

٢- ئنجا ئاوڕێکی خێرای جیددیی لەژیانو گوزەرانی خەڵك بدەینەوەو لەوهەموو ملیارانەی لەلای حیزب و خزمن، هەندێکیان بۆ حکوومەتی فەرزدارو خەڵکی هەژار بگێڕینەوە، تاکو وێڕای چاککردنی باری ژیان و گوزەرانی خەڵك، کە ئەرکی سەرشانی هەر حوکمڕانێکە، دڵخۆش و ئومێدەواریشیان بکەین و، جۆرێك لە متمانە بۆ نێوان خەڵك و دەستەڵات بگێڕینەوە.

٣- پاشان دوای ئەو هەنگاوانە، وتوێژێکی بابەتییانەو بەرپرسانە پێکەوە بکەین، لەبارەی ڕیفراندۆم و هەڵ و مەرجی گونجاوی و، سەرجەم زەمینەسازییە پێویستەکانی دیکەی.

**پێنجەم:** بێگومان بۆ هیچ کەسو لایەنێك ڕەوانیە بەتەنیا بڕیار بۆ خەڵك و وڵات بدات و، موغامەرەی پێوەبکات، قەیرانو کێشەکانیشمان زۆر لەوە زیاتر و گەورەترن، کە بە (بەڵێ) کردن بۆ ڕیفراندۆم، یان (نەخێر) گوتن، چارەسەر بکرێن.

www.alibapir.com



لەکۆتاییشدا دەڵێم: هەرکام لە هەرێمو دەوڵەت بەهەموو پێکهاتەکانیانەوە، ئامرازن بۆ خزمەتی خەڵکو، ئامانج نین، کەواتە: با بەر لەشیعارو ناو و نیشانی هەوڵ و پڕۆژە سیاسییەکان، سەرنجی نێوەڕۆکیان بدەین و، بزانین تا چ رادەدەیەك ئامانج دەپێکن و، دەبنە مایەی چەسپێنرانی دادگەریی و ئازادیی و بەختەوەرکردنی خەڵك و جەماوەر.

عەلی باپیر / هەولێر

١٤٣٨/١١/٢١ك

٢٠١٧/٨/١٣ز

لە نۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١٤- وەڵامێکی دڵسۆزانە بۆ پرسیاری: کۆمەڵ لەچی نیگەرانە؟

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

دوێنێ جەنابی کاك مەسعوود بارزانیی لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ (سەندیکاکان) سەرسوڕمانی خۆی لەنیگەرانیی کۆمەڵی ئیسلامیی پێشاندا!

بەباشم زانی بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتری بەڕێزیان، چەند خاڵێکی کورت و پوخت لەبارەی هۆکارەکانی نیگەرانیی کۆمەڵی ئیسلامییەوە، لەم بارودۆخەی هەرێم، بنووسم:

**یەکەم:** سەرەتا ڕایدەگەیەنین: کە ئێمە هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ کەس و لایەنێکی دیارییکراودا نیە و، گرفت و کێشەی ئێمە لەگەڵ شێوازی خراپی بەڕێوەبردنی ئەم هەرێمەیە لەدرێژەی چارەگە سەدەی ڕابردوودا.

**دووەم:** هۆکارە سەرەکییەکانی نیگەرانیی ئێمەش لەم بارودۆخە ئەمانەن:

١- بەدامەزراوەنەکردنی کاروبارەکان و دەستوەردانی حیزب و کەس لە کۆی ئیدارەی وڵات و، شکاندنی شکۆی پەرلەمان و پەکخستنی و...هتد.

٢- بێهێز و پێزکردنی دەستەڵاتی دادوەریی و پێشێلکردنی یاسا، لەئەنجامی دەست تێخستنی حیزب و کەسەوە، بەمەبەستی دابینکردنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان، وەك: کپ کردن و خەفەکردنی دەنگی ئازا و ئازاد و، بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن و...هتد.

www.alibapir.com



٣- بەپێودر نەگرتنی مرۆڤبوون و هاوڵاتیی بوون، بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا و فەرق و جیایی پێکردنیان، بەهۆی ئینتیمای حیزبیی و سیاسیی و فیکریی و عەشیرەت و دەڤەر و....هتدەوە.

٤- تەشەنەکردنی ستەم و قۆرخکاریی و گەندەڵیی و، سەرەنجام: سەرهەڵدانی چینێکی کەمینەی مشەخۆری ملیاردێرو ساماندار، لەسەر حیسابی خەڵك و جەماوەرێکی زۆرینەی نەدارو چەوساوەو هەناسە سارد.

**سێیەم:** ئێمە لەکۆمەڵی ئیسلامییدا لەبەرەکەتی پابەندییمان بەشەریعەتەوە، هەرگیز ڕێمان بەخۆمان نەداوە، کە بەهاندەری کینە و بوغز بەرانبەر بەم و بەو، یان چاولێکەریی ئەملاولا، هەڵوێست وەربگرین و، بەپێویستی دەزانین جگە لەبەزەیی و پەرۆش و دڵسۆزیی بۆ هەمووولایەك، هیچ پاڵنەرێکی دیکەمان نەبێ، چونکە: {الدين: النصيحة} رواه مسلم، واتە: دینداریی دڵسۆزیی و پەرۆشە بۆ هەمووولایەك.

**لەکۆتاییدا دەڵێم:**

ئەوەی هۆکاری نیگەرانییو بێزاریی ئێمەو خەڵکێکی زۆری ئەم هەرێمەیە، ئەوەیە کە بەکورتیی ئاماژەم پێداو، هەمووولایەکیش دڵنیا دەکەینەوە، کە ئەگەر بڕیار بەدەستانی ئەم هەرێمە، چاوێکی جیددیی بەخۆیاندا بگێڕنەوە و، کێشەو قەیرانە دروستکراوەکان چارەسەر بکەن، باهیچ کەس گوێ بە دووریی و نیزیکیی و نیگەرانیی و ڕازییبوونی ئێمە نەدات.

بەڵام ئەگەر خوا نەکردە بارودۆخ وەك هەیە بەردەوام بێ، زۆر مەترسیی ئەوەم هەیە یەکجاریی لێمان تێك بچێ، چونکە ستەم و بێدادییەکی زۆر هەیە و بەهۆی ستەمیشەوە، وڵات سەرەنجامی تاریك دەبێ، خوا فەرموویەتی:

﴿...وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ﴾ القصص -٥٩-.

واتە: ئاوەدانییەکانمان نەفەوتاندوە، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکار بووبن.

عەلی باپیر / هەولێر

١٤٣٨/١١/٣٠ك - ٢٠١٧/٨/٢٢ز

www.alibapir.com



## ١٥- نەخێر بۆ حوکمڕانیی لارو ستەمکار و، بەڵێ بۆ سەربەخۆیی گەل و وڵات

ئەوانەی ناتوانن (نەخێر) بۆ حوکمڕانیی لارو ستەمکار و پڕ گەندەڵیی و پۆخەڵیی و، (بەڵێ) بۆ سەربەخۆیی وڵات و دەوڵەتی کوردستان، لەعەقڵ و دڵیاندا پێکەوە کۆبکەنەوە شایستەی بەزەیی و دڵ پێ سووتانن.

چونکە مرۆڤی عاقڵ و دەروون ساغ، هەمیشە لەگەڵ هەقەو دژی ناهەقە، نەك بەهۆی هەقەوە ناهەقییش قبووڵ بکات و لێی بێدەنگ بێ، یان بەبیانووی دژی ناهەق بوونەوە هەقیش ڕەفز بکات!

عەلی باپیر
١٤٣٩/١/٦ک
٢٠١٧/٩/٢٦ز

www.alibapir.com



## ١٦- گەلی کورد و ئەرك و هەنگاوەکانی لەم قۆناغەدا

دەقی پەیام و وتاری بەندە کە لە (١٧)یەمین کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستاندا لەهۆڵەندا لە ٢٠١٧/١٠/١٤ دا لەلایەن (سامان ڕەباتیی)یەوە بەرپرسی مەڵبەندی ١٠ی هەندەرانی کۆمەڵی ئیسلامیی خوێندرایەوە:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بەڕێزان ئامادەبووانی (١٧) مین کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان!

السلام علیکم ورحمة الله

سەرەتا پیرۆزبایی بەستنی کۆنگرە لەهەموولایەك دەکەم، هیوادارم ئەم کۆنگرەیەمان کە لەهەل و مەرجێکی یەکجار هەستیارو دژواردا دەبەسترێ، بڕیارگەلێکی گرنگ و ڕاستی وای تێدا بدرێن کە قۆناغەکە دەیانخوازێ.

زۆریشم حەزدەکرد دەرفەتی بەشداربوونی کۆنگرەکەتانم بۆ ڕەخسابایە، بەڵام دواکەوتنی ڤیزاکەم بوو بەکۆسپ.

**بیروڕاو سەرنجەکانی خۆیشم لەم چەند خاڵەی خوارێدا کورت دەکەمەوە:**

**یەکەم:** بەسەرنجدانی مێژووی خۆمان "لەکۆن و تازە" دەگەینە ئەو قەناعەتە، کە هەمیشە پەرتەوازەییمان ماك و میکرۆبی شکست و نەهامەتییەکانمان بووە و،

www.alibapir.com



گەورەترین هۆکاری پەرتەوازەییش، ستەم و قۆرخکاریی و خۆپەسندیی و خۆسەپاندنە لەسەر ئاستی تاك و بنەماڵە، یان هۆز و حیزب...

**دووەم:** هەربۆیەش هەتا بڕیار بەدەستان لەقاوغی تەسکی ئەنانیەت و تەنیا خۆ و خزم و حیزب بینین، نەیەنە دەرو، کەوڵی خۆپەرستیی لەخۆیان دانەڕنن، دەبێ گەل هەر لەبازنەیەکی بۆشدا بخولێتەوە!

**سێیەم:** بەهێزترین و کاریگەرترین چارەسەری ئەو حاڵەتی ئەنانیەت و خۆپەرستیی و، هەمووشت بەخۆو خزم و حیزب ڕەوابینین و، خەڵك بەکەم زانینەش، بریتیە لەبیری خواپەرستیی و خوا بەیەکگرتن و، بڕوابوون بەڕۆژی دوایی و دیداری خوا، بۆیە با زۆر بەجیددیی هەرچی زووترە هەموولایەك هەوێنی دینداریی و تەنیا خواپەرستیی و خۆ ڕازاندنەوە بەڕەوشت و بەها بەرزەکانی وەك: ڕەحم و ویژدان و مرۆڤدۆستیی و دادگەریی و ڕاستگۆیی و پاکیی و چاکیی، کە خاڵی هاوبەشی نێوان ئیسلام و سەرجەم ئایینە ئاسمانییەکانن، ئاوێتەی خەباتی ڕزگاریخوازییمان بکەین، تاکو چیدی بەهۆی دوور لەخوایی و ئەو دەرهاویشتە خراپانەوە کە لێی پەیدادەبن، خەڵکمان دەسخەڕۆو ڕەنجەڕۆ نەبێ!.

**چوارەم:** ئەگەر بمانەوێ (کەنەکە) ببێتە مایەی ئومێدو هیوای خەڵك و جەماوەری کوردستان لەهەموو بەشەکانیدا: باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، پێویستە ئەم هەنگاوانە بنێ:

١- ڕاگەیاندنێکی نیشتیمانیی دوور لەدەمارگیریی حیزبیی وەگەڕبخات، لەسەر بناغەی کۆمەڵێك بنەمای فیکریی و سیاسیی هاوبەش.

٢- پێکهێنانی تیمێکی دیبلۆماسیی لەسەر ئاستی نەتەوەو نیشتیمان، کە بەگشتیی و بێ جیاوازیی کێشەکانی نەتەوەی کوردستان تەبەنیی بکات.

٣- سەرکردە سیاسییە بڕیار بەدەستەکان، ببنە ئەندامی کۆنگرەو خۆیان بەجیددیی قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵن.

www.alibapir.com



٤- هەوڵبدرێ کۆنگرە مۆرکی هیچ لایەنێکی سیاسیی بەسەردا زاڵ نەکرێ، تاکو هەمووولایەك بەچەترو سێبەری خۆیانی بزانن.

٥- کۆنگرە سەنتەرێکی فیکریی‌و سیاسیی ستراتیژیی پێك بێنێ، کە خەڵکی پسپۆڕی عەقڵ‌و دڵ فراوان و دڵسۆزی تێدا کۆبکرێتەوەو، ئەنجامی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانی لەهەمووولایەکەوە بەجیددیی وەربگیرێن.

**پێنجەم:** باشووری کوردستان پاش ئەنجامدانی ڕیفراندۆم لە: ٢٠١٧/٩/٢٥دا کەوتۆتە بارودۆخێکی هەستیارو مەترسیدارەوەو، بەو بۆنەیەشەوە چەند سەرنجێك دەخەمە ڕوو:

١- بێگومان هیچ کوردێکی دڵسۆز نکووڵیی لەو ڕاستییە ناکات کە نەتەوەی کوردیش وەك سەرجەم گەلانی دنیا، مافی خۆیەتی ئیدارەو ئیرادەی خۆی هەبێ، بەدەوڵەتی سەربەخۆشەوەو، فەرمایشتی خواش: (...وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا...) ئەو مافەی بۆ هەمووگەلان دەستەبەر کردوە.

٢- بەڵام ئەو ڕیفراندۆمەی لەباشووری کوردستاندا کرا "وەك ئێمە لەکۆمەڵی ئیسلامییدا گوتمان" بەنەفەسێکی شەخسیی‌و حیزبیی بڕیاری لێدراو ئەنجامدراو، هیچ زەمینە سازییەکی نێوخۆییی‌و دەرەکیی بۆنەکرا:

نەکۆدەنگیی بۆ پەیداکرا، نە بەیاسا ڕێکخرا، نە لەنێو خەڵکدا ڕێ خۆشکردنی بۆ کرا، بەچارەسەرکردنی گرفتو کێشەکانی خەڵكو دڵخۆشکردنیان....هتد!

٣- هەڵبەتە ئێمە وێڕای ڕەخنەو تێبینیمان لەسەر میکانیزمو چۆنیەتی‌و هەلو مەرجو هاندەری ڕیفراندۆم، بەڵام هەر (بەڵێ)مان بۆ کرد، چونکە بەردەوامان نەزانی بۆ هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی "کە ئاواتی

لەمێژینەو ڕەوای گەلی ستەملێکراوی کوردستانە" نەڵێین: بەڵێ، بەڵام ئەو ئەگەر و دەرهاویشتە خراپانەشمان لەبەرچاوگرتبوون، کە هەندێکیان سەرەتاتکە دەکەن و، هەندێکیشیان دەرکەوتوون، بۆیە هێندە جەختمان لەسەر دواخستنی‌و

www.alibapir.com



زەمینە بۆ سازکردنی کردوە، بەڵام بەداخەوە داواو ڕەجای ئێمەو غەیری ئێمەش حیسابی بۆ نەکرا!

**شەشەم:** لێرەشەوە داوایەکی دڵسۆزانە لە هەمووولایەك و بەتایبەت بڕیار بەدەستانی گەلەکەمان دەکەم: کە:

ئامان سەد ئامان! با چیدی ماف و داخوازییە ڕەوایەکانی گەلە ستەمدیدەکەمان، بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییە بچووکە شەخسیی و حیزبییەکان بەکار نەهێنین، ئەگەرنا شەرمەزاری لای خواو خەڵك دەبین و، نەك هیچ بەهیچ ناکەین، بگرە ئەوەی هەشمانە لەدەستی دەدەین!

**حەوتەم:** هەرگیز بەڕەوای نازانم هەڵوێستی نەرێنییانەی زلهێزان و، دامەزراوە نێو نەتەوەییەکان و، حکوومەتی فیدراڵیی و، وڵاتانی دراوسێ، بکەمە بەڵگەی هەڵەبوونمان لەداواکردنی مافی ڕەوای خۆماندا "کە سەربەخۆییە"، بەڵام:

١- پێویستە پەند لەمێژووی کۆن و نوێی خۆمان و خەڵکی دیکە وەربگرین.

٢- پێویستە "مادام ڕابەرایەتیی خەڵك دەکەین" خوێندنەوەی ڕاست و دروستمان بۆ واقیعی خۆمان و دەوروبەرمان و دنیا هەبێ، تاکو لەحیسابماندا بەهەڵەدانەچین!

**لەکۆتاییشدا دەڵێم:**

ئەگەر پێشتریش نەمانزانیبێ و گومانمان بووبێ، پاش ڕیفراندۆمی (٢٠١٧/٩/٢٥) زۆر باش بۆمان دەرکەوت کە ئێمەی گەلی کوردستان:

بێجگە لە خوا "عز وجل"، پاشان خەڵك و جەماوەرەکەمان، هیچ دۆستو پشتیوانێکی دیکەی مسۆگەرو جێی دڵنیاییمان نیە.

کەواتە: با بڕیارێکی بوێرانەی جوامێرانە بدەین، کە لەگەڵ خوادا ڕاستو ساغ بین و، بۆ خەڵك و جەماوەریشمان چاکو دڵسۆزبین و، کوڕو کچەکانی خەڵك و جەماوەریشمان، وەك کوڕو کچەکانی خۆمان تەماشا بکەین، کە ئەوەش

www.alibapir.com



بەبێ چەسپاندنی دادگەریی‌و، کاری دامەزراوەیی و، یاسا سەروەریی و، سیستمێکی حوکمڕانیی تەندروست و، حوکمی سەرڕاستانە (الحكم الرشيد) دەستەبەر نابێ...

برای دڵسۆزتان: عــەلــی بــاپــیــر

٢٤/موحەڕڕەمی/١٤٣٩ک

٢٠١٧/١٠/١٤ز

هــەولــێــر

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
PDF
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ١٧- پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ هەموولایەك بەبۆنەی دەرهاویشتەکانی ڕیفراندۆمەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بەڕێزان! خەڵك و جەماوەری هەرێمی کوردستان و دەرەوەی هەرێمی کوردستان و تاراوگە و سەرجەم بەشەکانی کوردستان!

بەپێویستم زانی لەم هەل و مەرجە سەخت و دژوارەدا، کە هەرێمی کودرستان و عێراق و ناوچەکە پێیدا تێدەپەڕێ، بەتایبەت دوای ئەو بەڵا گەورەیەی کە بەسەر هەرێمی کوردستاندا هات، دوای ئەنجامدانی ڕیفراندۆم لە ٢٠١٧/٩/٢٥، وەك بەشێك لەئەرکی سەرشانم بەرانبەر بە خەڵك و وڵاتی خۆم، کە بێگومان هەموولایەك بەرپرسیارین بەرانبەر بەخەڵكو کۆمەڵگای خۆمان و چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانی، بەڵێ بۆ پەیدابوونی گرفت و کێشەکان، تەنیا بڕیار بەدەستان بەرپرسارن، بەڵام دەبێ هەموولایەك خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفت و کێشانەی کە لەگەڵیاندا دەستەو یەخەبووین، ئنجا هەرلایەك و هەرکەسێك پەیدای کردبن.

لە چوار تەوەری سەرەکییدا ئەو پەیامە دەنووسم و، ڕووی قسانیشم لە هەموولایەکە:

www.alibapir.com



## تەوەری یەکەم: ئەوەی ڕوویدا هۆکارەکانی چی بوون؟

مەبەستمان ئەو بەڵا گەورەیە کە بەسەر هەرێمی کوردستاندا هات، کە بەلای کەمەوە نیوەی پانتایی ئەوبەشەی هەرێمی کوردستان کە لەبەردەستی خۆماندبوو، لەدەستمان چوو، بەو مانایە کە ئێستا لەژێر کۆنترۆڵو هەیمەنەی هەرێمی کوردستاندا نەماوە.

پێموایە ئەوە سێ هۆکاری سەرەکیی هەبوون:

**هۆکاری یەکەم: حوکمڕانیی خراپی پڕستەم لە (٢٦) ساڵی ڕابردوودا:**

دیارە ئەمیش لەچەند شتێکدا بەرجەستەبوو بوو:

**یەکەم:** نەبوونی سیستمێکی حوکمڕانیی تەندروست.

**دووەم:** نەبوونی دامەزراوەکان، یان پەکخستنیان.

**سێیەم:** یاسا سەروەر نەبوون، بەڵکو پێشێل کردنی.

**چوارەم:** پێشێل کردنی ماف و ئازادییەکان و کەرامەتی زۆرێك لە خەڵك، وەك: زیندانی کردنی بە ناحەق، کوشتن، برسیی کردن، ترساندن، سەرو گوێ شکاندن، هەڕەشەلێ کردن...هتد.

**پێنجەم:** دەست تێوەردانی کەس و حیزب لە کارو باری حکوومەت و گەندەڵییەکی بێ ڕەزا، لە هەموو جومگەکانی دەسەڵاتدا.

**شەشەم:** بە پێوەر نەگرتنی مرۆڤ بوونو هاوڵاتیی بوون لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکداو، حیزب و بنەماڵە و خزم و...هتد، جێی هاوڵاتیی بوونو مرۆڤ بوون گرتنەوە.

**حەوتەم:** سەرگەرمبوونی بەرپرسان بە بازرگانیی و خۆدەوڵەمەندکردن و کارو کەسابەت کردنەوە.

www.alibapir.com



بەكورتيى و بە كورديى: ستەم و بێ دادييەكى بێ ڕەزاو، پشتگوێ خستنى شەرعى خواو، گوێ نەگرتن لە خەڵكى خوا.

ديارە خوا "سبحانە وتعالى" لە زۆر شوێنى قورئاندا هەواڵى پێداوين كە هەر كاتێك ستەم و بێداديى و چەوساندنەوە هەبوو، ئەو كۆمەڵگاو واقيعە بەرەو سەر بە فەتارەت چوون دەچێ، لە سوورەتى: (الأنبياء)دا دەفەرموێ:

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ...﴾ -١١-

واتە: زۆر ئاوەدانييمان فەوتاندن، پشتمان شكاندن دواى ئەوەى كە ستەمكار بوون، (يانى: حوكمڕانەكان ستەمكاربوون).

هەروەها لە سوورەتى: (القصص)دا دەفەرموێ:

﴿...وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ القصص -٥٩-.

ئێمە فەوتێنەرى ئاوەدانييەكان نين، مەگەر خەڵكەكەيان ستەمكار بن.

پێغەمبەريش "صلى الله عليه وسلم" دەفەرموێ: (اتق دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب)، رواه البخاري ومسلم، واتە: خۆت لە دوعاى ستەملێكراو بپارێزە، (ئەو ستەملێكراوە مسوڵمان بێ، يان نامسوڵمان)، چونكە پاڕانەوەى مەزڵووم لەگەڵ خوادا، پەردەى لەنێواندا نيە، يەكسەر دەچێ بۆ خزمەت خوا.

ئەم وڵاتەى ئێمە زوڵم و ستەمێكى زۆرى تێدا كرا، ديارە دوعاى مەزڵوومانيش لەلاى خوا قبووڵ دەبێ، كەواتە: ئەوەى ڕوويدا، هۆكارى يەكەمى حوكمڕانيى خراپ و پڕ ستەمى بيست و شەش ساڵەى ڕابردوو بوو .

**هۆكارى دووەم: گوێ خەواندن لە چارەسەرى كێشەو گرفتەكان و، لێ ڕاكردنيان و ڕاكردن بەرەو پێشەوە، وەك عەرەب دەڵێن: (الهروب الى الإمام):**

كێشەيەكمان بۆ دروست دەبوو "كێشەى سەرۆكايەتيى هەرێم" لەجياتى ئەوەى ئەو كێشەيە چارەسەر بكەين، كێشەى پەرلەمانمان دەهێنايە پێش، تاكو خەڵك

www.alibapir.com



کێشەکەی دیکەی لەبیر بچێتەوە، ئنجا کە پەرلەمانمان پەك دەخست، لەجیاتی ئەوەی واقیع بینانەو بوێرانە چارەسەری بکەین، دەچووین کێشەیەکی دیکەمان پەیدا دەکرد: قەیرانی ئابووریی دەهاتە پێش!.

سەرەنجامیش کێشەی بێڕەزای هەنگاونانی هەڵە لە کات و شوێنی بێ‌جێدا، بەرەو سەربەخۆیی و بە دەوڵەتبوون، کە سەرەنجام هەموو ئەو کێشە کەڵەکەبووانە، هەم خەڵکی خۆمان و، هەم دۆستەکانیشمانیان، زۆر بێزارو نا ئومێد کردو، ناحەزانیشمان ئەو کێشەو گرفتە کەڵەکەبووانەی هەرێمی کوردستانیان، قۆستەوەو سوودی خراپیان لێ وەرگرتن.

**هۆکاری سێیەم: هەنگاونان بەرەو دەوڵەت و سەربەخۆیی، بەبێ بەرپێی خۆ دیتن و، گوێ گرتن بۆ هۆشدارییەکانی کە لە هەموو لایەکەوە دەدران، بە بڕیار بەدەستان:**

بەڵێ ڕیفراندۆم بەبێ زەمینەسازیی نێوخۆیی لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و دامەزراوەیی و، بەبێ زەمینەسازیی لەگەڵ حکوومەتی نێوەند و، وڵاتانی دراوسێ و، هێزە نێودەوڵەتییەکان، ئەنجامدراو، ئەو دەرەنجامانەی لێکەوتنەوە، کە هەموو مرۆڤێکی واقیع بین پێشبینی دەکردن، کە من پێموایە ئەو هەنگاونانەش، چەند هۆکارێکیان هەبوون:

**یەکەم:** نا واقیع بینیی کاربەدەستان.

**دووەم:** بێ دامەزراوەیی، ئەگەر ئێمە دامەزراوەی پەرلەمانمان هەبووایەو، دامەزراوەی سەرۆکایەتیی هەرێم و حکوومەتمان هەبووایە، ئەوکاتە شەخسێك، یان چەند کەسێك لە جیاتی هەمووان بڕیاریان نەدەدا، کە بڕیارەکەشیان بە هەڵەدا بچێ و، سەرەنجام بەسەر هەموولایەکدا بشکێتەوە.

**سێیەم:** لە خۆبایی بوونو خۆ گەورە بینین .

**چوارەم:** هەندێك کەس لەگەڵ یەکدا ڕاستو ساغو ڕاشکاونەبوون، چونکە من لە خەڵکی دیکەی کە پشتگیریی ڕیفراندۆمیان دەکرد، دەمبیست کە دەیانگوت:

www.alibapir.com



ئێمەش ڕامان لەگەڵدا نیە، کەچی ئێمە دەنگمان هەڵهێناو ڕەخنەمان لێگرت، بەڵام ئەوان خۆیان لێ کردە کەڕەی شەربەتو بێ دەنگ بوون و، لەگەڵیدا ڕۆیشتن و سەرەنجامیش ئەوەی لێ کەوتەوە کە بینیمان.

## تەوەرەی دووەم: چۆن لەم دۆخە دژوارە دەرباز دەبین؟

**پێموایە، کە دەبێ ئەم حەوت (٧) کارە بکەین بۆ ئەوەی لەم دۆخە دژوار و سەختەدا دەرباز بین:**

**یەکەم:** دان بەهەڵەی خۆدانان و بەرپرسیارێتی هەڵگرتن:

عەرەب گوتوویانە: (الإعتراف بالخطأ فضيلة)، دان بە هەڵەی خۆدا هێنان پەسەندییە و سیفەتێکی بەرزە.

منیش پەندێکم هەیە دەڵێم: دان بە هەڵەی خۆدا هێنان، مەسرەفی زۆر کەمە، لەجیاتی ئەوەی هەڵەکانت بە هەڵەی دیکە پینەو پەڕۆ بکەی و دانیان پێدا نەهێنی، دانیان پێدا بێنە بە ڕوونو ڕاشکاویی، هەڵبەتە دان بەهەڵەی خۆدا هێنانیش بەو واتایە، کە تۆ دەبێ ئەوەی پێشتر بەهەڵە کردووتە، ئێستا ڕاستی بکەیەوە، نەك بڵێی بەڵێ هەڵە بووم و بڕۆی!! بەڵکو دەبێ ڕاستی بکەیەوە، بۆ وێنە: ئەگەر نەتهێشتوە حکوومەت حکوومەت بێ، دەبێ ئەو هەڵەیە ڕاست بکەیتەوە، حکوومەت حکوومەتێکی ڕەشیدو کارای خاوەن بڕیارت هەبێ.

ئەگەر نەتهێشتوە پەرلەمان پەرلەمان بێ، دەبێ لەمەودوا پەرلەمان دامەزراوەیەکی ڕێزلێگیراوبێ.

هەروەها ئەگەر دەسەڵاتی دادوەریی و هەر کام لە دام و دەزگایەکان، پەك خراون یان لەنێوەڕۆك خاڵی کراونەوە، دەبێ ئەو هەڵانە ڕاست بکرێنەوە.

www.alibapir.com



**دووەم:** نائومێد نەبوون:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ یوسف -٨٧-.

واتە: بە دڵنیایی تەنیا کەسانی بێبڕوا لە فەرحانییەك کە خوا دەیهێنێتە پێش، نائومێد دەبن.

هەڵبەتە نائومێدیی وا لە مرۆڤ دەکا کە ئەژنۆی بشکێ و دەستە و ئەژنۆ دابنیشێ، بەڵام نەخێر نابێ لە بەرانبەر ئەم دۆخە ناهەموارەدا نائومێد بین، چونکە ئێمە خواناس و مسوڵمانین.

**سێیەم:** لەگەڵ خواو ئایینەکەیدا ئاشت بوونەوە:

خوا "سبحانه وتعالی" هەواڵی پێداوین ئەو چاکەو نیعمەتانەی لەگەڵماندا دەکات و، ئەگەر سوپاسگوزاریی خوایان لەسەر بکەین، بۆمان زیاد دەکات، ئەگەر سپڵەیی و ناسوپاسییان بەرانبەر بکەین، لێمان وەردەگرێتەوە، وەك لە سووڕەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ:

﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾﴾ إبراهيم -٧-.

کاتێك پەروەردگارت ڕایگەیاند (ئەوە یاسای خوایە ڕایدەگەیەنێ)، ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم، بەڵام ئەگەر سپڵەیی بکەن، سزای من توندە.

هەروەها لە سووڕەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ...﴾ -٥٣-.

www.alibapir.com



واتە: ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا چاکەیەكو نیعمەتێکی کە بەخەڵکێکی بەخشیوە، لێیان وەرناگرێتەوە، تاکو ئەوان خۆیان وا لێنەکەن ئەو نیعمەتە لەدەست خۆیان نەدەن.

ئێمە بەڕاستی لەنێو نیعمەتانێکی زۆردا بووین، بەڵام بەهۆی نادیدە گرتنی ئەو نیعمەتانەی خواوە، نیعمەتەکانمان لەدەستچوون، کەواتە: با لەگەڵ خوادا ئاشت بینەوە، جارێکی دیکە چاکەو نیعمەتەکانی خوا نادیدە نەگرینو پێیان لەخۆبایی نەبین،بەڵکو سوپاسگوزاریی خوایان لەسەر بکەین، کە سوپاسگوزاریی خواش ئەوەیە نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنین، نەك لە گوناهـ و تاوانو لادانو زوڵم و ستەمدا، نیعمەتەکانی خوا دەبێ لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنین، ئەو ڕزق و ڕۆزییەی خوا لەم وڵاتەدا دایناوە، شوکری ئەو نیعمەتە ئەوەیە کە ئەو ڕزق و ڕۆزییە بۆ خەڵکەکە بەکاری بێنی، نەك بۆ خزمەتی خۆت و، خزم و حیزب و، بکەیە ملیاردێر، لەسەر حیسابی برسیی کردنو ڕەشو ڕووتکردنی خەڵكو جەماوەر.

**چوارەم:** دەرککردنی ئەو ڕاستییە کە بەبێ تەبایی و یەکڕیزیی هیچمان بۆ ناکرێ:

بەڵام تەباییو یەکڕیزیی ئیختیاریی نەك ناچاریی، تەباییو یەکڕیزیی ئیختیاریی ئەوەیە کە لەسەر بناغەی دادگەرییو یەکسانیی بێ، نەك لەسەر بناغەی خۆ فەرزکردن، چونکە لەهەندێك لە وڵاتاندا ئاشتییو تەبایی سەقامگیرە، بەڵام لەسەر بناغەی ترساندنی خەڵكو تۆقاندنی خەڵك، کە ئەوە پێی دەگوترێ تەبایی ناچاریی.

**پێنجەم:** زەمینەسازییەکی ئارام بۆ هێنانەدی قیادەیەکی دڵسۆز و ئەمین و واقیع بین و عەقڵ و دڵفراوان:

کە لە سووڕگەی ڕازی کردنی خواو بەختەوەرکردنی خەڵکدا بخولێتەوە، نەك لە سووڕگەی خۆو خزمو حیزبو ئەو شتە بچووکانەدا، بەڵام ئەو قیادەیە دەبێ لە هەموو لایەنەکان گوڵبژێر بکرێ، بەپێی پێوەرو پرەنسیپە دادگەرەکان، بۆ

www.alibapir.com



ئەوەی کە هەڵەی دوو حیزبی حوکمڕانی پێشوو دووبارە نەکرێتەوە، کە هەموو شتێکیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو، لەولاشەوە کەسێکی دیکە خۆی بکات بە هەمەکارەی وڵات، نەخێر دەبێ ئەو خەڵکەی کە لەم وڵاتەدا هەیە، ئەوانەی کە وەك گوتم (دەستپاك و واقیع بین و دڵفراوانن) و لە سوورگەی ڕازیی کردنی خواو، خزمەتکردنی خەڵکدا دەسووڕێنەوە، لە هەموو ئەوانە، قیادەیەك پێك بێ و فریای ئەم وەزعە بکەوێ.

**شەشەم:** دواندنی حکوومەتی نێوەندیی و وڵاتانی دراوسێ و وڵاتانی جیهان لەسەر بناغەی عەقڵ و لۆژیك، نەك لەسەر عاتیفەو هەڵچوون و هەڕەشە و، لە چوارچێوەی دەستووردا:

یانی: ئەو گرێ بەستەی کە لە نێوان حکوومەتی ئێمە و نێوەندییدا هەیە، بەڵام لە ڕێی شاندێکی شارەزای شایستەی پێکهاتوو لە لایەنە سیاسییەکان و کەسانی ئەکادیمیی و پسپۆڕ.

**حەوتەم:** بەخێرایی ئاوڕدانەوەیەکی جیددیی لە خەڵكو جەماوەر، لە هەردوو بواری مادديی و مەعنەوییدا:

چونکە تەنها دوو کارتی بەهێزی دەستی ئێمە وەك هەرێمی کوردستان، بریتین لە خوا "سبحانه وتعالى" کە لە فریامان بێ و پشتمان بگرێ، پاشان خەڵکەکەمان، کەواتە: با ئاگامان لەنێوان خۆمان و خوابێ، بەهۆی پابەندبوونمان بە شەریعەتەکەیەوە، کە فەرمان دەکات بە دادگەریی و، ڕێگریی دەکات لە ستەم و زۆریی و قۆرخکاریی و، ئاگاشمان لە خەڵکەکەمان بێت، بەوەی کە ئەو نازو نیعمەتانەی لەم وڵاتەدا هەن، لە دەستی کەسانێکی کەمدا قۆرخ نەکرێن و، هەموو خەڵکیان لێ بەهرەمەند بێ.

www.alibapir.com



## تەوەری سێیەم: چەند ڕاستییەکی ڕێ ڕۆشنکەرەوە:

**ڕاستیی یەکەم:** ئەگەر خۆمان بۆ خۆمان نەبین، هیچ کەس بۆمان نابێ: کەواتە: وەك خوا بڕوادارانی وەسف کردوە ﴿...رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ ...﴾ الفتح -٢٩-.

﴿...أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ...﴾ المائدة -٥٤-.

واتە: لەنێو خۆیاندا بە بەزەیین و، لەگەڵ یەکدا میهرەبانن، با ئێمەش بەو شێوەیە بین و بەزەییمان بەخۆماندا بێتەوە، وەك زۆرجار گوتوومە: هەر گەل و کۆمەڵگایەك لەنێو خۆیاندا بەزەییان بەخۆیاندا نەیەتەوە، کارێك بەخۆیان دەکەن، خەڵکی دیکە بەزەیی پێیاندا بێتەوە!

**ڕاستی دووەم:** هەموو لایەك قەرزاری پێشمەرگە فیداکارەکان و بنەماڵەی شەهیدانین، هەروەها هێزەکانی دیکەش ئەوانەی کە دڵسۆزانە بۆ خوا و خەڵك کاریان کردوە: کەواتە: با قەدرزانینمان بۆیان هەبێ و، چی دیکە لێ نەگەڕێین لە چوارچێوەو سورگەی حیزب و بەرژەوندیی شەخسیی و گروپ و باندا بسووڕێندرێنەوە، بەڵکو بیانکەین بە دامەزراوەیەك کە ئینتیمایان بۆ خەڵك و نیشتیمان هەبێ.

چونکە هەر ئەوە ئەرکیانەو ئەو ئەرکەش کە ئەنجامیانداوە، بە قازانج شکاوەتەوە بۆ هەموو خەڵك و وڵات.

**ڕاستی سێیەم:** شکستی ئەم جارەمان، شکستی بەشێك لە سەرکردایەتیی سیاسیی بوو، ئەو سەرکردایەتییە سیاسییەی کە بڕیار بەدەست بوو نەك هی هەمووی، چ جای هی خەڵك و جەماوەر، یان هی هێزی پێشمەرگە.

**ڕاستیی چوارەم:** یەکدی شکاندن و تەخوین کردن، زیانباریی هەموو لایەکی تێدایەو هیچ کەس تێیدا براوە نیەو، هەڵەی سیاسییش بە خیانەت و ناپاکیی

www.alibapir.com



لە قەڵەمدان، ستەمە: کەواتە: با بەو زمانە یەکدیی نەدوێنین، بەتایبەت لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا شتی زۆر خراپ دەگوترا، ئێستاش جاروبار هەر دەگوترێ.

**ڕاستیی پێنجەم:** تاکە سوودێك کە لە هەڵەو شکستەکان وەربگیرێ، بریتییە لەوەی دەرسو پەندییان لێ وەربگرین: وەك گوتراوە: (السعيد من اتعظ بغيره)، بەختەوەر کەسێکە پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ.

**ڕاستیی شەشەم:** خۆ دوور گرتن لە ڕەشبینیی، چونکە فاشیلترین کەس ئەو کەسەیە کە هەمیشە بۆ خاڵە سەلبییەو نەرێنییەکان دەڕوانێ و، تەنیا هونەری ڕەخنەگرتنو ناشیرینکردنی بەرامبەرەکانی دەزانێ: پێشینانیش گوتوویانە: (بۆق بە قیرە قەبە نابێ)، مرۆڤ قەبارەی چەندە، هەر ئەوەندە، با خۆمان لە زمانی ناوزڕاندن و تەشهیر پێکردن و خەڵك بە کەم تەماشا کردن، دووربگرین.

جارێك چەند گەنجێك هاتن بۆلام لیستێکیان پێ بوو، ناوی کۆمەڵێك مامۆستاو بانگخوازی ئەم هەرێمەی تێدا بوون، گوتم ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەوە هەندێ خەڵك گوتوویانە: ئەوانە ئەهلی بیدعەتن، نابێ سڵاویان لێ بکرێ و گوێیان لێ بگیرێ، منیش گوتم: ئەو مونکەرە کێیە، کە ئەو مەعرووفانەی زەڕب بەسەردا هێناون؟

هەندێك کەس هەیە کەس نایناسێو نازانێ کێیە چۆنە؟ کەچی زەڕب بەسەر هەموو خەڵکی ئەم هەرێمی کوردستانەدا دێنێ!

**ڕاستیی حەوتەم:** پێشینان گوتوویانە: (هەر عەقڵە لە خەسارێك)، ئەو بەڵایەش کە بەسەر هەرێمەکەمان هات، خەسارەتێکی زۆر گەورە بگرە خەسارەتێکی جۆراو جۆر بوو، بۆیە دەبێ زۆر دەرس و پەندی لێ وەربگرین و زۆر عەقڵی لێ وەربگرین، بەتایبەت ئەوانەی کە بڕیار بەدەستن، کە بەداخەوە کاتی خۆی ئێمە زۆرمان گوت و، ئەوان کەمیان بیست، بۆیە سەرەنجاممان بەم حاڵە گەیشت.

www.alibapir.com



## تەوەری چوارەم: چەند بانگەوازێکی خێرا:

**یەکەم:** بانگەوازێکم بۆ خەڵکو جەماوەر بەگشتیی: ئەوەی کە ڕوویدا بەپێی یاساکانی خوا لە گەردووونداو لە ژیانی بەشەردا، شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، بەڵام با ئێمە لە دەروونەوە تێك نەشكێین، با باوەڕمان بەخوا بێ‌و، متمانەمان بەخۆمان بێ کە هەڵدەستینەوە.

**دووەم:** بانگەوازی دووەم بۆ حیزبەو لایەنە سیاسییەکان: دەبێ ئێمە تەواوکەری یەکدی بین، بەسە با چی دیکە بەرە لەژێر پێی یەکدی دەرنەهێنین، با چی دیکە بیر لەوە نەکەینەوە، چۆن هەر کامێکمان هەموو شتێکی بۆ خۆی بێ‌و بەرامبەرەکەی لێ بێ بەش بکات.

**سێیەم:** بانگەوازێکیشم بۆ حکوومەتی نێوەندییە: کە پێویستە هەرچی زووترە حکوومەتی نێوەندیی بە ئەرکی خۆی هەڵسێ، کە بریتیە لە خزمەتکردنی هەموو ئەو خەڵکەی کە لە چوارچێوەی عێراقدا خۆیان دەبیننەوە، بە هەموو پێکهاتەکانەوە، کۆتایی بە لەشکرکێشی بێنێ بە تایبەتی (حەشدی شەعبیی) بەرەو هەرێمی کوردستان و، ئاوارەکان بگێڕدرێتەوە، لاپەڕەیەکی تازە هەڵبداتەوە لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا.

**لە کۆتاییشدا دەڵێم:**

بێگومان گەلی کوردیش وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا مافی خۆیەتی کە لە خاکی خۆیدا ئازادو سەربەست بێ‌و خاوەنی ئیرادەو ئیرادەی خۆی بێ، ئنجا ئەو خاوەنی ئیرادەو ئیرادەی خۆبوونە، جاری وا هەیە لە ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینەدا خۆی دەبینێتەوە، جاری واش هەیە لە فیدراڵییدا بەرجەستە دەبێ‌و، جاری واش هەیە لە کۆنفیدراڵییداو جاری واش هەیە لە دەوڵەتی سەربەخۆدا ئەوەش کەوتۆتە سەر هەلو مەرجی گونجاو و بارودۆخی ڕەخساو.

www.alibapir.com


کەواتە: ئەگەر ئەمجارە لە ڕێی ڕیفراندۆمێکەوە، کە لەکاتی خۆیدا نەبوو، هەلومەرجی بۆ نەڕەخسابوو، زەمینەی بۆ خۆش نەکرابوو، نەگەیشتینە ئەو ئامانجە کە بریتییە لە دەوڵەتی سەربەخۆ، با پێمان وانەبێ کە بێ مراد بووین‌و ئەوە کۆتایی دنیایە، چونکە لە ڕاستییدا ڕیفراندۆم بریتییە لە میکانیزمێك لەو میکانیزمانەی کە پێ‌ی بەرەو سەربەخۆیی‌و بەرەو دەوڵەت دەچین، ئنجا کە ئەو میکانیزمە لەبەر ئەوەی زەمینەی بۆخۆش نەکرابوو، لە شوێنی خۆیدا نەبوو، بڕیارێکی یەکدەنگیی لەسەر نەدرابوو، بێ ئەنجام بوو، مانای وانیە کۆتایی دنیایە، ئێمە وەك گەلی کورد هەر خاوەنی ئەو مافەین‌و، درەنگ یان زوو هەر دەبێ بەو مافەمان بگەین، بەڵام بێگومان دەبێ دەرس‌و پەند لە هەڵەکانمان وەربگرین، هەر بۆیەش ئێمەی کۆمەڵی ئیسلامیی زۆر هاوارمان کرد: کە ئێمە لەگەڵ پرۆسەی ڕیفراندۆمدا نین، بەڵام لەگەڵ ئەنجامی سەربەخۆییدا‌ین، بەڵێمان بۆ سەربەخۆیی کرد، چونکە ئەوە ئامانجێکە و مافێکی ڕەوایە، بەڵام لەگەڵ پرۆسەکەدا نەبووین‌و، پێمان وابوو ڕێیەکی هەڵەیە لەو هەلو مەرج‌و زەمینە نەڕەخساوەدا.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات کە هەوڵ‌و هیممەتمان یەکبخەین، یەك دەست و یەك ڕەنگ لەگەڵ کێشەکاندا ڕووبەڕوو ببینەوەو، لەم کەوتنەشمان زوو هەڵسینەوە.

تێبینی:

دەقی ئەو وتارە لەپەیامێکی ڤیدیۆییدا لە: ٢٠١٧/١٠/٢٨دا بڵاوکرایەوە:

لینکی پەیامە ڤیدیۆکە: https://youtu.be/Z٤ogS٠w٢QhA

١١/صفر/١٤٣٩ك

٢٠١٧/١٠/٣١ز

هەولێر

www.alibapir.com



## ١٨- وتارێکی بەندە کە لە ژمارە ٢ی گۆڤاری: (کۆست) بڵاوکرایەوە، کە گۆڤارێکی ساڵانەیەو مەڵبەندی ٧ی چەمچەماڵی کۆمەڵی ئیسلامیی دەریدەکات

### گەورەترین ستەم لە مێژووی کورددا:
### کارەساتی قڕکردنی کوردان

ئەوکارەساتە جەرگبڕەی سی (٣٠)ساڵ لەمەوبەر لەلایەن ڕژێمی بەعسی دڕندەوە بەسەر گەلی کورددا هێنرا لە باشووری کوردستاندا، کارەساتێکی کەم وێنە بووە لەمێژووی گەلانداو لەچوار ڕووەوە ستەمێکی بێڕەزابوو:

**یەکەم:** کە قڕکردنێکی مەزن بوو بەسەر دەیان هەزار کەسدا هات، کە زۆربەی هەرەزۆریان ژن و منداڵ و بەتەمەن بوون، سەرجەمیشیان خەڵکی مەدەنی بوون و، ئەگەر تاك و تەرا پێشمەرگەشیان لەنێودا بووبن، ئەوانە بوون، کە لەبەر پاراستنی ماڵ و خێزانیان خۆیان تەسلیم کردبۆوە و چەکەکانیان ڕادەستی ڕژێم کردبوون.

**دووەم:** ئەوجینۆساید و قڕکردنە بەزۆری لەتاریکی شەوگاردا ئەنجامدراوە و تەنانەت یەك وێنەی فۆتۆگرافیش لەوقەلاچۆکردنە نەکەوتە بەردەست، چ جای گرتەیەکی ڤیدیۆیی، وەك کیمیایی بارانەکەی هەڵەبجە، واتە ئەو قڕکردنە دیکۆمێنتێکی لێ نەکەوتە بەردەستی میدیا و، ئەگەر ئەوشایەتحاڵانەش نەبوونایە کە کاك (عارف قوربانیی) چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدان وەك بەڕێزان: (تەیموورو ڕەمەزان و عبدالواحد) گەلێك لایەنی پەنهانی ئەوکارەساتە

www.alibapir.com



نەدەزانران، دیارە ئەو پەنهانکوژیی و دیزەبەدەرخۆنە لێکردنەش، ستەمەکەی خەستتر کردەوە.

**سێیەم:** کە ئەوکارەساتە بەناوی یەکێك لە سوورەتەکانی قورئانەوە ناونراوە، کە سوورەتی (الأنفال)ە، بەوەش ڕژێمی گۆڕبەگۆڕی بەعسی دیکتاتۆر، ویستی بە جیهانی ئیسلام بڵێ: گەلی کورد گەلێکی کافر و نامسوڵمانەو سەروماڵیان دەستکەوت (غنیمة)ی جەنگییە.

کە بێگومان ئەوەش ستەمێکی دیکەی گەورە و بێڕەزابوو دەرهەق بە گەلی کورد کە حوکمی کافربوونی بۆ درابوو، هەروەها ستەمێکی بێڕەزاش بوو بەرامبەر بە قورئان و ئیسلام کە ناوی سوورەتێکی قورئان لەوتاوانی جینۆسایدە بنرێ، قورئانێك کە خوا تێیدا فەرموویەتی:

﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ هود -١٨-.

واتە: ئاگاداربن نەفرینی خوا لە ستەمکارانە، ئاشکراشە کوشتنی تاکە مرۆڤێك ستەمە، چ جای قڕکردنی دەیان هەزارکەس.

**چوارەم:** کە ئەوکارەساتە لەلایەن خودی ڕژێمی بەعسەوە بەسەر گەلەکەی خۆیدا هێنرا، نەك لەلایەن ڕژێم و دەوڵەتێکی دیکەوە، چونکە عادەت وایە دەوڵەتان دانیشتووان و هاووڵاتییانی خۆیان دەپارێزن و خزمەتیان دەکەن، نەك قڕیان بکەن.

**لەکۆتاییدا:** هیوادارم هەمووولایەك "بەتایبەت حوکمڕان و بەرپرسان" هەمیشە ئەو کارەساتە جەرگبڕە کەم وێنەیەیان لەبەرچاو بێ و، پەندی لێ وەربگرن و، قەدری ئەو خەڵك و جەماوەرەشیان بگرن، کە بەهۆی شۆڕشو خەباتی ڕزگاریخوازییانەوە، ئەوهەموو باجە قورسانەیان داون.

عەلی باپیر
٢٠١٨/٤/١٤

www.alibapir.com



# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **قــورئــان و ســونــنـەت** | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیســلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکـەم: سـووڕەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سـووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سـێیەم: سـووڕەتی: (النسـاء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سـووڕەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سـووڕەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی شەشەم : سـووڕەتی: (الأعــراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

www.alibapir.com



| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١١ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٢ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **بیـروبڕواو فیکـری ئیسـلامیی** | | |
| ١٣ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٤ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٥ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٦ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ١٧ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ١٨ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ١٩ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢٠ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢١ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |

www.alibapir.com



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دواییء قەزاو قەدەر | | |
| ٢٣ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٤ | ڕێبــازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـوڵـمان) |
| ٢٥ | سـوڵمانی کـامڵ : بەشی یەکـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٦ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٧ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٢٨ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٢٩ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٠ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **فیقهـی ئیســلامیی** | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیســـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣١ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٣٢ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |

www.alibapir.com



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٤ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٣٥ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٣٦ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٣٧ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٣٨ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار** | | |
| ٣٩ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٠ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤١ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٢ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان، وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٣ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٤ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٥ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٦ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

www.alibapir.com



| بانگەوازو کاری ئیسلامیی | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٧ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٤٨ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٤٩ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٠ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥١ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٢ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٣ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٤ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٥ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٦ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٥٧ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٨ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٩ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٠ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٣ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |

www.alibapir.com



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٦٥ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٦٦ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٧ | با لادان و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٨ | پەرگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەرگیران، هۆکارەکانی پەرگیریی، شوێنەوارو دەرهاوێشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٦٩ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعیجیەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٠ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧١ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

www.alibapir.com



| | | | |
|---|---|---|---|
| وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | | |
| ٧٢ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٤ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ 2015 | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | | |
| ٧٥ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٧٦ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٧٧ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٧٨ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| سیاسەت و حوکمڕانیی | | | |
| ٧٩ | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٠ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨١ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٢ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |

www.alibapir.com



| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨٣ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٤ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٨٥ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٨٦ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ٨٧ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٨٨ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨٩ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ٩٠ | سـنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩١ | ئەشـکەنجـەو زیندان، پێشــمەرگەیەك بیسـت و دوو مانگ لە زینــدانی داگیرکــەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی کراوەو چـاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەو چـاوەڕێی چاپە |
| ٩٢ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |

www.alibapir.com



| زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٣ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٤ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٥ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٦ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٧ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٢ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٣ | واقیعی هەرێمی كوردستان، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٤ | سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١٠٥ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٠٦ | حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٠٧ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |

www.alibapir.com



| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٠٩ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٠ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١١ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٢ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١١٤ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١١٥ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٦ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٧ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٨ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٩ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٠ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | | |
| ١٢١ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | | |
| ١٢٢ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |

www.alibapir.com



| ١٢٣ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٤ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشـريعة و معـالم الدولة فـي الإســلام | | |
| ١٢٥ | الكتاب الثاني عشـر: الإســلام: نظـرة سـديدة تجـاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٢٦ | نقض فكـرة التطـرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٢٧ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٨ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٩ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى/ ٢٠١٦ | |
| ١٣٠ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣١ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٢ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٣ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٤ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | |
| ١٣٥ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٣٧ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٣٨ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | **ئەو کـتـێبانـەی لـەژێـر چاپــن** | | |
| ١٣٩ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیـەم: ســووڕەتی: (هود) | | |
| ١٤٠ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یـازدەیــەم: ســووڕەتی: (یوسف) | | |

www.alibapir.com



| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | |
|---|---|---|
| ١٤١ | بەرگی یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | |
| ١٤٢ | بەرگی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | |
| ١٤٣ | بەرگی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان | |
| ١٤٤ | بەرگی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | |
| ١٤٥ | بەرگی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | |
| ١٤٦ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | |

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



# پێرستە وشە

www.alibapir.com



س



ع



ف



ك



ڕ

www.alibapir.com



گ



ل



م



ن



و

www.alibapir.com



## نێوەڕۆك

www.alibapir.com

www.alibapir.com



## بەشی چوارەم ............................................ ١٧٥



## بەشی پێنجەم ............................................ ٢٢٥

www.alibapir.com

www.alibapir.com

# سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم

## لەتەرازووی ئیسلامدا

**ئەم كتێبە :**

لـەم چاپـەی چوارەمیـدا گەلێـك بـاس و پرسـی تـازەو هەنووكەیـی لەبـارەی بابەتـی نەتەوایەتیـی بەگشـتیی و، بابەتـی كێشـەی نەتـەوەی كـوردو، چۆنیەتیـی چارەسـەركردنی بەتایبـەت، گرتوونـە خـۆی و، هیـوادارم توانیبـم لەڕوانگـەی ئیسـلامەوە، بەشـێوەیەكی ڕاسـت و دروست و هاوسەنگ، لەوبارەوە نوختە بخەمە سەرپیت.

هەڵبەتـە چەوسـاوەیی نەتەوەیـی كـورد و بێبەشـكرانی لەمافـی چارەنـووس و ئیـرادەو ئیـدارەی خـۆ بەدەستبوونیشـی، نیشـانەیەكی پرسـیاری زەقـی خسـتۆتە سـەر هـەركام لـە ڕێكخـراوی: (نەتـەوە یەكگرتـووەكان) و، زلهێزانـی بڕیـار بەدەسـتی ئـەم ڕۆژگارە و، دەوڵەتـە دراوسـێیەكانی نەتـەوەی كوردیـش، ئنجـا ئەگـەر چ پـڕ عەقـڵ و ویـژدان بەكاربێنـن، دەبووایـە هەموویـان هەوڵبـدەن هەرچـی زووتـرە، خۆیـان لـەو سـەغڵەتییە دەربـاز بكـەن و، ئـەو نیشـانەی پرسـیارە لەسەر خۆیان لابەرن.


لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠ مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice